**زنجیرەی کتێبی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم**

**کتێبی سەردەم ژمارە** ( *209* )

**سەرنووسەر**

**ئازاد بەرزنجی**

# فرۆشراو

**بابەت: ڕۆمان**

**نووسینی: زانا موهسین**

**وەرگێڕانی: زاگرۆس زەردەشتی**

**مۆنتاژی کۆمپیوتەری: تاڤگە فائق**

**هەڵەچنی چاپ: مهاباد ڕەحیم**

**تیراژ:** 350 **دانە**

**ژمارەی سپاردن:** 423 ی 2002

www.sardam.net

# پێشکەشە

★ بە ئەنفال کراوەکان.

★ بە کچە ئەنفال کراوە فرۆشراوەکان.

★ بەو کچانەی کە هەمیشە خەو بە گەڕاندنەوە بۆ ئـامێزی کوردسـتانی دایك دەبینن.

"زاگرۆس"

# پێشەكی

بۆ ئەوەی كە ژن بیت و بە تواناش بـی، دەبـێ بـەهرەی یـاخیبوونت تیـا بێـت. بـۆ ئـەوەی هەوڵـەكانی سـەركوتكردنت لـە لایـەن دەوروبەرتـەوە سـەرنەگرێت و بتوانـی پیلانـەكانی ئـەوان هەڵوەشـێنیتەوە دەبـێ ئـەو بـەهرەی یاخیبوونـەت بخەیتـە كـار و ڕەشبین نەبی لەو خەباتەی كە ڕەنگە لە سەرەتاوە نـوزە نوزێكـی پشـت سـەدان دیـواری ئەستوور، یان تاڵە تیشكێكی كاڵی ئومێد بێت، كـە بـەو سـوور بـوون و یاخیبوونـە ئـەو نوزەیە دەبێتە دەنگێكی بەسەدا و ئەو تیشكە كاڵەش دەبێتە خۆری ڕزگاری.

بۆ ئەوەی ژن بیت و خاوەنی كەسایەتی خۆت بی، دەبێ بوێری بڕیار بـدەی، دەبـێ خـۆت لـە قـەرەی خەتـەر و قەدەغـەكان بـدەی، دەبـێ (منـی بەرگریكـەر) لـە دەرونتـا هەمیشـە زیندوویـەكی بـەهێز بێت، بـۆ ئـەوەی كـچ بیـت و داگیریش نـەكرابی، دەبـێ خاوەنی ئەو جەستە نایاب و بەرهەمهێنەرەی خۆت بی.

ئایا دەتوانی ژن بیت و ئەو بەهرەی یاخی بوون و سەرسەختیەت لـە وڵاتگـەلێكدا بخەیتە كار كە لە یاساكانیاندا تۆ وەك "كچ" جگە لە خۆت موڵكی هەموو ئەوانی تری، هی هەموو پیاوانی وەك باوك، برا، خزم و خێڵ و هەموو كۆمەڵگەی..؟ ئایا دەكاری لە ناو گەمارۆی ئەو یاسا كۆمەڵایـەتی، ئـابووری و ئایینیـە سـەختگیرانەی ئـەواندا كـە تـۆ وەك كچێكی پێش هەزار و چوارسەد ساڵ سەیر دەكەن، یان وەك سـەردەمی كۆیلایـەتی تـۆ لای ئـەوان جگـە لـە كۆیلەیـەك هیچـی تـر نیـت، هـێز هەیـە بتوانـێ لـە شـاڵاوی بـەدگومانی، دوا كـەوتووی و نادادگـەری ئـەوانت دەركـا...؟! چ جـای كـە هـەموو هـێز و توانای تۆ لە بار براوە، هەموو مرۆڤایەتیت لە بۆتەی مێینەیەكی لاوازدا كە لای ئـەوان كەم عەقڵ و كەم هێز و كەم ئەندامێك بەڕێوەی دەبەن...؟

ئایا دەکاری بەسەر ئەو کێوە سەختەی دەسەڵاتی ئەواندا سەرکەوی و بگەیتە مرۆڤایەتی خۆت...؟!

بەڵێ دەتوانی، زۆر باشیش دەتوانی ئەگەر خاوەنی کەسایەتییەکی بڕیاردەری وەك "زانا" بیت.

زانا کێیە..؟!

بەسەرهاتی ئەم کچە بە توانا کۆڵنەدەرە لەم کتێبەدا بخوێنەوە، ئەو کچەی توانی بڕیاربدا بۆ ڕزگار بوون لەو چارەنووسەی، کە بەبێ ویست و بێ زانینی خۆی کەسانێکی تر بڕیاریان بۆ دا.بەسەرهاتی ئەو دوو خوشکە بە ڕەگەزی دایك "ئینگلیز" و باوك عەرەبی "یەمەن"ییەی کە باوکیان فرۆشتنی بە باوکی دوو کوڕی "یەمەن"ی و بە بێ ئاگاداری خۆیان و بە ناوی گەشتەوە ڕەوانەی "یەمەن"ی کردن. "زانا"ی شازدە ساڵ و "نادیا"ی پازدە ساڵە لە ناکاو لە دوو کچی "ئینگلیز"ەوە چارەنووسی دوو ژنە "عەرەب"یان بۆ دەستنیشان کرا و دەبوایە بە پێی ئەو پرۆگرامە سەخت و ئەو ژیانە تراژیدیایە بکەن کە پیاوگەلێکی نەریتی "عەرەب" بۆیان دانان.

لێرەدا دوو کەسایەتی جیاواز دەبینین، "زانا"ی بەهێز و خاوەن بڕیار سەری بۆ ئەو چارەنووسە نائاساییە دانەنەواند کە بەبێ ئاگاداری خۆی بۆی دەستنیشان کرا. کەسایەتی "زانا" کەسایەتی کچێکی ئاساییە، هی کچێك کە هەرگیز کۆیلایەتی قبوڵ ناکات، هی کچێك کە دەتوانێ چارەنووسی بگۆڕێ..! کەسایەتی "نادیا"ش کەسایەتی نائاسایی و تەسلیمە، کچێك کە لە خەبات کردن ماندوو دەبێت و پشووی کورتە و هەموو ژیان و چارەنووسی خۆی بەو بێدەنگی و سستییەی دەخاتە بەردەستی کەسانێکی تر و ئەوانیش بە ئارەزووی خۆیان دەیکەن بە کۆیلە.

کەسایەتی "زانا" و کچانێکی وەك "زانا" واتە کچانێکی بڕیاردەر لە ڕووی دەروونییەوە دروست و بە توانا. وێنەی "زانا" لە زۆربەی کۆمەڵگە نەریتیەکاندا کچانێکی ناپەسەندن، چونکە کچ و ژن لەو جۆرە کۆمەڵگایەدا مرۆڤایەتییان لێ دەستێنرێتەوە و کۆیلەی قایل و سەردانەوێنەر و ترسنۆکیان لێ دروست دەکرێ. بێگومان کۆیلەش نە ڕێزی لێ دەگیرێ و نە بۆیشی هەیە لە پلەی ژیان و گوزەرانی

کۆیلەدارەکاندا بێ، بەڵکە دەبێ نە دەنگ و نە سەنگی هەبێ. ژن لەو کۆمەڵگایانەدا بەو بێ دەنگ و سەنگەیە و هەندێ جار لە ژێر پلەی کۆیلایەتیشدا دەژی.

لە وڵاتە "عەرەب"یە نەریتیەکاندا کە تا ئەمڕۆش بە یاسای ئـایینی بـاری خـێزان دەچێ بەڕێوە، کە لەو خێزانانەشدا بـەپێی یاسا پیـاو بڕیـاردەر و ژن بـێ بڕیـارە، پیـاو کڕیـار و فرۆشـیار و ژن فرۆشـراوە، چەوسـاندنەوە بـە پێـی یاسـا و بـە پشـتیوانی یاسـا دەچـێ بـەڕێوە، لـەو وڵاتگەلـە و هاوشـــێوەکانی ژن ئەگـــەر کەســـایەتیەکی یـــاخی و خەباتگێڕی نەبێ ڕێگە بۆ کۆیلایەتی خۆی خۆش دەکا و دەکـڕێ و دەفرۆشـرێ و خـۆی ڕێگە بۆ پیاوان خۆش دەکات کە ئەو مامەڵەیەی لە تەکدا بکەن.

کەسایەتی وەك "نادیا"، واتە ئەو جـۆرەی کـە (منـی بەرگریکـەر) لـە کەسـایەتیدا دەمرێ و ئیدی سەر بۆ چارەنووسی نەخشە بۆ کێشراویان شۆڕ دەکەن، ئەو جۆرەن کـە بەداخەوە لە وڵاتە ئیسلامیەکاندا ئەوان زۆربەن و باون، بۆیەش ژنان لـەو کولتورانـەدا خاوەنی خۆیان نین و کاڵایەکن پیاوان بازرگانییـان پێـوە دەکـەن بـە نـاوی شـووکردن و مارەیی و شیربابییەوە گیرفانی خۆیانیان پێ گەرم دەکەنەوە.

کـە ژن دەکرێتـــە بووکـە پەڕۆینـــەی نـاو چـادری عـــەبا و پەچـە و لـە چـالاکی کۆمەڵایـەتی دوور دەخرێتـەوە، بـە نـاوی ئـاین و پارێزگـاری لـە ڕەوشـتی کۆمەڵگـە و تەندروســتی کۆمەڵگــە. ژن لــە چـالاکی بەرهەمـــهێنان و دەســـکەوتی ئـــابووری دوور دەخەنەوە. بەوەش ئاسانتر دەتوانن دەستەمۆی کەن و پاشـکۆیەتی و وابەسـتەیی بکـەن پیشەی و خۆیان ببنە خاوەنی، کە بۆ ژن یاسا و نەریتی کۆمەڵگـەی هـەزار و چوارسـەد ساڵ پێش ئێستا پیادە دەکرێ، بۆ ئەوە نیە کـە پـەیڕەوەکانی پێغەمبـەر لـە کۆمەڵگـەدا دەپار ێزرێ، دەنا هەر ئەو دەوڵەتانەن کە مۆدرێنترین جۆری چەك بەرهـەم دەهێنـن و نوێترین ماشێن و ئۆتۆمبیل و کۆمپیوتەر لە دەزگاکانی میری و بگرە لە ماڵەکانیشـیاندا هەیە.. ئەدی بۆ وەك هەزار و چوارسەد ساڵ پێش ئێستا کـەر و حوشـتر بـەکار نـاهێنن لە جیاتی ئەو دوا مۆدێلی ئۆتۆمبیلانە...؟ یـان شـیر و تـیر لـە جیـاتی فڕۆکـە و چـەکی کیمیایی و بایەلۆژی و موشەکی دوور هاوێژ...هیتر...؟

کۆمەڵگەی ئیسلامی بۆ لەم ڕووەوە هێندە تازەگەرە و لە ڕووی یاسای خێزانیشەوە تازەگەری حەرامە...؟

ئەو بازارە مۆدرێنانەی کە لە مەککە، مەدینە و جددە و زۆر شوێنی پیرۆزی تری "عەرەبستانی سعود"ی کە ساڵانە ملیۆنان موسوڵمان بۆ زیارەتی لە هەموو شوێنێکی دنیاوە بۆی دەچن، هەر لەو بازاڕانەدا جوانترین مۆدێلی جلی ئەوروپایی و ماکیاژ و خشڵی ژنانە دەفرۆشرێن و لە تەلەفیزیۆنە سەتەلایتەکانیانەوە ژنانی مۆدێل بە نیوە ڕو وتی پڕوپاگەندا بۆ ئەو کاڵایانە دەکەن. کەچی ژنانیش بە پێی یاسا بۆیان نیە جگە لە چاویان بۆ بینینی بەرپێی خۆیان هیچ کوێیان دیار بێ و پێچراونەتە عەبا و پەچەیەکی ڕەشەوە..؟

ئەم سیاسەتە دوو فاقیەی کە دەوڵەتەکان دەیکەن و بەکارهێنانی یاسای قورئان لەهەر بوارێکدا کە بەرژەوەندیان بپارێزێ و بەکارنەهێنانیشی ئەگەر زیان لە بەرژەوەندیان بدا هەموو ئەو دەوڵەتانە و سیاسەت و ئایین و مێنتالیتە و کولتوریان لە بەرامبەر لێپرسینەوە دادەنێ و دەبێ بمانخاتە گومانەوە.

"کۆماری ئیسلامی ئێران" وا لەگەڵ کۆتایی هاتنی ئەم سەدەیە دەبێ بە خاوەنی "چەکی ناوکی" خۆی کە هەڕەشە لە مرۆڤایەتی دەکا و مەترسیەکی گەورە بۆ ناوچەکە و جیهان دەخوڵقێنێ. "کۆماری ئیسلامی ئێران" بە چەکی هەزار و چوارسەد ساڵ پێش ئێستا شەڕ ناکا کە لە شەڕەکانی (بەدر و ئوحد) بەکار دەهێنران، چونکە دنیا ئێستا دنیایەکی ترە و سەردەمی چەکی ناوکییە و وڵاتانی تر پێشکەوتوون و چەکی مۆدێرنیان هەیە. بەڵام بە یاسای هەزار و چوار سەد ساڵ پێش ئێستا ژن دەکاتە کۆیلە لە خێزاندا. ژن دەکاتە کۆیلەی سێکس و بە پێی یاسای (سیغەی ئیسلامی) ئارەزووە زایندەکانی پیاوی پێ تێر دەکات، ئەگەر چی کۆمەڵگەکانی تریش گۆڕاون و سەردەمیش سەردەمی گەیشتنی ژنە بە پلە بەرزەکانی دەسەڵاتی سیاسی و زانستی و ئابووریش.

ئەو ئاینی ئیسلامەی کە پێی ڕاگەیاندوون گەلان و هۆز، ژن و پیاو بە ئاشتی بژین مافی یەکتری نەخۆن...! کە زۆر جار ئەم وتانە و دەقی (قورئان) دەهێنرێتەوە

بۆ مەبەستی تایبەتی خۆیان. لە (تورکیای کەمالیدا) کە ئێستا حیزبی ڕەفـای ئیسـلامی بەڕێوەی دەبات هاتۆتە ریزی یەکێك لە دەوڵەتـە ئیسـلامیەکانەوە پـەیتا، پـەیتا جڤـین لەگـەڵ (ئـێرانی ئیسـلامی و پاکسـتان) و شـوێنانی تـردا دەکـەن بـۆ "یەکێتییـەکی ئیسلامی" ئەمڕۆ نەك مـافی بەڵکە نکوڵی لـە بوونـی نەتەوەیـەکی سـی ملیۆنـی وەکو "کـورد" دەکـەن، کـە پـانزە ملیۆنیـان لـەو بەشـەی کوردسـتاندایە کـە ئـەوان داگیریـان کردووە و بە ترسناکترین شێوە گەلە کوژی و وێرانکـردن و سیاسـەتی ژینۆسـاید دژ بـە نەتەوەی کورد بەکاردەهێنن.

خۆ "عێراق"یش لەسـەر ئالآکـەی دەنووسـێ (الله اکبر)، کـەچی نـاوی یـەکێك لـەو هێرشە گەلکوژییەی کە بۆ سەر کوردستانی کرد، ناوی نابوو (ئەنفال) بە نـاوی یـەکێك لە ئایەتەکانی "قورئان". کەچی دەوڵەتێك، یـان ڕێکخراوێکـی "ئیسلام"ی نـەهات بـۆی ڕوون کاتەوە کە (ئەنفال) ئەگەرچی باسی ئەو کوشت و بڕ و تالآن و دیلی جەنگ و بە کۆیلەگرتنی دیلەکانی جەنگی تێدایە، بەلآم موسوڵمانەکان بۆ کوشت و بڕی موسوڵمانی تر بەکاریان نەهێنا، ئەسڵەن بۆ ئەو مەبەستە نەوتراوە (ئەگەرچی بۆ هەر مەبەستێك وترابێ کوشتنی مرۆڤ و تالآنکردنی مرۆڤ بەو شێوەیە لە مرۆڤایەتی بەدەرە). دادگای ئیسلامی لەسەر قڕکردنی نەتەوەی کورد نەهاتە زمان.

لـێرەدا مەبەسـتمە باسـی ئـەو کچـە کـوردە ئەنفالکراوانـە بکـەم کـە فرۆشـران بـە پیاوانی دەوڵەتە "عەرەب"یـەکانی وەك "عەرەبسـتانی سـعودی، کوەیـت و وڵاتـانی تـری کەنداو، یەمـەن و زۆر وڵاتـی ئیسـلامی تـر". ئەگـەر چـی دەوڵـەتی "عـێراق" و ڕژێمـی هەرە دیکتاتۆری "عـێراق" نـاهێڵن بەڵگـەی ئـەو فرۆشـتنانەی بکەوێتـە دەسـتی کـەس، هـەر وەك چـۆن ئەگـەر ئـەو چـەند کەسـانە نەبوونایـە کـە بەڕێکـەوت لـە "ئـەنفال" ڕزگاریـان بـوو کـەس نـەیدەزانی کـە ئـەو سـەد و هەشـتا و دوو هـەزار کەسـەی کـە لـە هێرشی بەدناوی (ئەنفال)دا لە ساڵی 1988 دا بە دیل گـیران و زینـدوو بـەچاڵ کـران لـە بیابانەکانی (خوارووی عێراق) بە هەمان شێوەش دیل بوونی ئـەو کچـە فرۆشـراوانەش بـێ بەڵگـە ماونەتـەوە، چونکـە ئـەو کچـە کوردانـەی کـە سـاڵەهای سـاڵ چەوسـانەوەی

نەتەوایـەتی و ڕەگەزایـەتی و چینایـەتی هێنـدەی کەسـاس و چەوسـاوەی کـردوون کـە دواترینیان "ئەنفال" بوو.

ئیدی (منی بەرگریکەر) کە لە کەسایەتییاندا کوژراوە جێی سەر سوڕمان نیە کە کەسیان نەیانتوانیوە راپسکێن و خۆ دەربازکەن لەو چارەنووسە تاڵەی کە بەسـەریاندا سـەپێنراوە، تـا ببێتـە بەڵگـەی هـەزارانی تـر کـە لـە لایـەن "دەوڵـەتی "عـێراق"ەوە فرۆشـراون . کـاتێك لـە (ئـەنفال) دەربـاز بوویـەك دەگەڕێتـەوە (کچـەکانیان هـەموو کردبوون بە ژن) .(کام کچە جوان بوایە لەبەرچاوی باوك و براکـانیدا دەیـان بـردن بـۆ ژووری رابـواردن) . ئەوسـا بۆمـان دەردەکـەوێ نـەك کەسـایەتی ژن بەڵکـە هـی "پیـاوی ئـەنفالکراویش" لـەناو زیندانـی (نوگـرە سـەلمان)دا چـی بەسـەر هێـنراوە، ئیـدی چـۆن چاوەڕوانی ئەوە لەو کچە دەروون وێرانانە بکەین کە خۆراپسکێنن خۆ لـە دەسـتی ئـەو پیاوانە ڕزگار کەن کە بەپارە لە "دەوڵەتی عـێراق" کڕیویـانن..؟ رزگـار نـەبوونی یـەك دانەشیان بە داخەوە ئەوەمان بۆ دەردەخات کە ئەو بەهرەی یاخی بوون و بڕیـاری خـۆ ڕزگار کردنە لە ناو ئەو کچە کوردانەدا نەبووە کە لە زیندانەکانیەوە گوێزراونەتەوە بۆ "وڵاتانی تری عەرەبی"، وەك هەر کاڵەیـەك کـە دەکـڕدرێ و دەفرۆشـرێ. چونکـە هیـچ تروسکاییەکی ڕووناکی و هیچ پشـتیوانییەك شـك نابـەن کـە بیکەنـە پاڵپشـتی خـەباتی خۆ ڕزگار کردن.

هەڵبەتە مەسەلەی بە دیلگرتن و کوشتنی پیاوان و بـە کۆیلـە و کـەنیزك گرتنـی ژنان و کچان لە لایەن "عەرەبە موسوڵمانەکانەوە" شتێکی نوێ نیـە و یادگـای مێـژووی ئـەم هـەزار و چوارسـەد سـاڵەی لەمەوبـەر زۆر بەسـەرهات و بابـەتی لـەم جـۆرەی پاراسـتووە. ئەگـەر ئێمـەش وەك ڕۆشـنبیری کـورد بـە دیدگایـەکی مێژووبینانـەوە لـە مەسەلەی بـە کۆیلـە کـردن و فرۆشـتنی کـچ بڕوانـین لـە لایـەن داگیرکەرەکانـەوە دەبـێ بگەڕێینـەوە بـۆ 1364 سـاڵ لەمەوبـەر کـە بـۆ بـە موسـوڵمان کردنـی گـەلانی "ئـێران" هێرشیان بردە سەر "ئیمپراتۆریەتی عەجەمەکان". بە سەرکردایەتی (خالد بن ولید). لە کوردستانیشدا کاتێ کە لەشـکری (عـەرەب) بـە سـەرۆکایەتی هـەردوو سـەر لەشـکری "عەرەب" (عەبدولله ابن العمر و ابو عبیده الانصاری) بـە سـوپایەکی گـەورەوە خـاکی

کوردستانیان داگیر کرد، دەیانویست بە زۆر ئەو ئایینە بەسەر نەتەوەی کوردیشدا بسەپێنن کە ئەو دەمە ئاینی زەردەشتییان هەبوو و ئاگری پەرستگاکانیان دەگەشایەوەو پەیڕەوەکانی زەردەشتی پێغەمبەر لە لایەن کوردەکان و گەلانی تری ئێران پیادە دەکرا. کوردەکان نەیانویست بە ئاسانی دەست لە ئاین و پەرستگای خۆیان هەلگرن و شەڕی بەرەنگارییان لەگەڵ "عەرەب"ەکاندا کرد، یەکەمجار کوردەکان سەرکەوتن و سەرکردەی لەشکری "عەرەب" (عبدالله الانصاری)یان کوشت. بەڵام هێرش لە دوای هێرشی تریان کرایە سەر و ئاکامیش لەشکری "عەرەب" سەرکەوت و ئاینی خۆیان بەسەر کورددا سەپاند و جەنگاوەرێکی زۆری کوردیان کوشت و ژن و کچەکانیان بە دیل گرتن و لە ئایینەکەشیاندا بەکارهێنانی بەدیلگیراوان لە لایەن دیلکەرەکانەوە ئازاد (حەڵاڵ) بوو، بۆیە پیاوەکانیان کوشت و ژن و کچە کوردەکان بوون بە کەنیزەك و کۆیلەی "عەرەبە موسوڵمانەکان" و ئەوانیش یان بۆ رابوردنی خۆیان یان خزمەتکاری بەکاریان دەبردن و یانیش دەیانفرۆشتن، هەرچیەکیان لێ کردبانایە ئازاد بوون چونکە دەسکەوتی "غەزا"کانیان بوون.

چەندان سەدە دوای ئەو تالان و بڕینەی لەشکری "عەرەب" و سەپاندنی بیری ئیسلامی و "عەرەب"ی بەسەریاندا و شوێن و گۆڕینی بنەڕەتی بیری ئاینی تر لە مێشکی کورداندا وایان کرد کە کوردەکان گۆڕی ئەو هێرشبەرانەی لە ئەنجامی شەڕی داگیرکاری لە کوردستاندا نێژران بکەن بە جێگەی پیرۆز و نزرگە و وا لە کوردان بکەن کە داگیرکەری خۆیان لێ ببێتە پیاو چاك و شەخس و تەنانەت قوربانیان بۆ بدەن بە عەرد و لە شوێنانی دوورەوە بۆ زیارەتیان بێن...!

بەهەر حاڵ لێرەدا ئەوەی کە مەبەستم بێ، باسکردنی ئەو داب و نەریتی کچ فرۆشتن و بەدیلگیراو کردنە کۆیلەیەیە کە بوو بە کولتوری "عەرەب" و تەنانەت گەلانی تریش لە ئەنجامی موسوڵمانبوونیانەوە تێکەڵ بە کولتوری "عەرەب" بوون و ئەو نەریتەیان لێ وەرگرتن.

ئەم کتێبەی کە زاگرۆس زەردەشتی وەریگێڕاوە (فرۆشراو) زمان حاڵی کچێکی فرۆشراوە کە بە زەقی نەریتی کۆیلایەتی کە تا ئەمڕۆ بۆ ژنان پیادە دەکرێ و برەوی

هەیــە دەخاتــە ڕوو. زۆر پرســیارمان لا دەخولقێنــێ بەرامبــەر بــە ئــاین و کولتــوری ئیسلامی، ئێمەش کە کوردین و لە ئەزموونی "ئـەنفال"دا ژیـاوین و گەلـێ کچمـان لـێ فرۆشران و بێ ناونیشانن، یەکەم شت کە بیرمان بخاتەوە ئەو (کچە کـوردە ئـەنفالکراوە فرۆشراوانەن) کە ئێستاش نازانین لە کوێن و لە ژێر کام باری ستەمدان، بەڵام بێگومان کە چارەنووسیان ئەگەر زۆر لە هی "زانا" خراپتر نەبێ باشتر نیە، جیاوازی نێوان ئـەو کچە "ئینگلیز" و "ئەو کچە کوردانەی ئێمەش" ئەوەیە، کە رای گشتی "ئینگلستان" و هەموو دنیا لەسـەریان هاتـە دەنـگ و وڵاتـی "یەمـەن" یـان تاوانبـار کـرد، ڕۆژنامـەکان کردیان بەسـەر باسـی ڕۆژنامـەکانیان. ئەوانـەی ئێمـەش نـە خـاوەنی دەوڵـەتن تـا داوای مافیان بکات، نە ڕۆژنامەنووسەکانمان بیریان دەکەوێتەوە کە کێشەیەکی ئـاوا گرنـگ لـە ئارادایە و (سەدان کچی کوردمان فرۆشراون) و دەبێ رای گشـتی دنیـا بەمـە بزانـن. نـە حیزب و ڕێکخراوە سیاسـیە کوردەکـان لـە هیـچ بەشـێکی کوردسـتان خۆیـان لـە قـەرەی باسی ئەو کچە "فرۆشراوانە" داوە.

"کچـە کـوردە فرۆشـراو"ەکانی هێرشـی "ئـەنفال"ی شـووم دەبـێ بهێنرێنــە بــەر بـاس و ڕۆشـنایی ڕۆژنامـە و لـە "کارنامـەی ڕێکخـراوە سیاسـیەکانی کـورد و ڕێکخــراوە مرۆڤایەتیەکانی دنیا و ڕێکخراوە فێمینیستی"ەکاندا جێگەیان هەبێ.

لە کۆتایی ئـەم پێشـەکیەدا دەمـەوێ سوپاسـی زاگـرۆس بکـەم بـە وەرگـێڕانی ئـەم کتێبـە نایابـە و پێشکەشـکردنی بـە "کچـە ئـەنفالکراوەکان". هــەروەها دانــی شــەرەفی پێشەکی بۆ نووسـینی بـە مـن فرسـەتێك بـوو تـا منیـش باسـی "کچـە فرۆشـراو"ەکـانی هێرشی "ئەنفال" بوروژێنم، بێگومان ئەم باسە پێویست دەکا تـا زووتـرە بوروژێنـرێن. کتێبێکـی نایابــە و مــن لــە لای خۆمــەوە وەك ژنێـك ئافـەرینی زاگـرۆس دەکـەم بـۆ هەڵبژاردنی ئەم کتێبە و وەرگێڕانی. دەشزانم کە بە مەبەستەوە هەڵی بـژاردووە و لای ئـەو گرنگـە کـە کەسـایەتی "کچی کـورد"یـش وەك "زانـا" کەسـایەتییەکی بڕیـاردەر و بەهێز بێت و بیەوێ بە م کتێبە ئەو کاریگەرییە لەسەر "کچی کورد" دانێ.

مەهاباد قەرەداغی

1997-1-6

# بەشی یەکەم
# سەردەمی منداڵیم لە ... بیرمینگهام

وا دەزانم ئەو کاتە تەمەنم هەفت ساڵان بوو، لە ماڵەوە لەگەڵ "نادیا"ی خوشکمدا خەریکی یاری کردن بووین، لە ناکاو زرمەم لە "نادیا" هەستان و دەستی بە گریان کرد، دایکم بە پڕتاو گەیشتە سەرم، منیش بۆی دەرچووم، بە دەم پێکەنینەوە خۆم گەیاندە دەرکی دەرەوە، بەرەو شەقامی "Lincoln"، رامدەکرد، لەوە دەترسام دایکم بگاتە سەرم و تێمسرەوێنێ. بە تەنیشتی شۆستەی جادەکەوە ئۆتۆمۆبیلێك وەستابوو، بە چواردەور ی ئۆتۆمۆبیلەکەدا رامدەکرد و دەخولامەوە، لە ناکاودا ئۆتۆمۆبیلێکی تر لێیدام، پێیەکانم بە تەواوی لە زەوی دابڕان و لە بۆشاییدا خۆم بینیەوە، بەوە دەچوو کە باڵم گرتبێ، پێش ئەوەی کە سەرەوژێر ببمەوە و ئەژنۆکان و سەرم بەر زەوی بکەون، خەڵکی بە هاوار هاوار لە چوار دەورم کۆبونەوە.

هێندەی تریشم دێتەوە یاد کە "ئەمبولانس" هات و رووەو نەخۆشخانە بردیانم، ئیتر پاش ئەوە نازانم چی بوو، چی ڕوویدا، بەڵام کە هۆشم هاتەوە بەرخۆم سەرم شکابوو و دروبوویانەوە. ئەژنۆکانم تا ئێستاش جێگای برینەکانی هەر پێوە دیارە. ئەوە یەکەم بەسەرهاتی لە یاد نەچوومە، پێش ئەو ڕووداوە هیچ ڕووداوێکی تری ژیانم نایەتەوە یاد. ئەوەندە دەزانم کە هیچ کاتێك لە ژیانی خێزانیدا ناکامەران و دڵشکاو نەبووم.

من لە گەڕەکی Sparkbook لە دایك بووم، پاش ئەوە گوێزرامانەوە بۆ خانووەکەی نەنکم، کە دەکەوتە گەڕەکی "Lincoln"وە. جگە لە دایك و باوکم، چوار خاڵیشم لە

هەمان خانوودا لەگەڵ نـەنکمدا دەژیـان، ئێمـە خـێزانێکی گـەورە بوویـن. خاڵـەکانم بـە تەمەن هێندە لە من گەورەتر نەبوون، خاڵەکانم پتر لە بـرام دەچـوون وەك لـەوەی کـە خاڵم بن. دایکم خوشکە گەورەیان بوو. نەنکم سیازدە منداڵی ببـوو، لەبـەر ئـەوەی کـە نەنکم بە ساڵدا چـوو بـوو، دایکیشـم لـە هـەموویان گـەورەتر بـوو. بەسـەر خاڵـەکانمدا رادەگەیی، بۆیە هەموو کاروبارێکی ناو ماڵ کەوتبووە ئەستۆی دایکم و سەرپەرشـتکاری ئێمە و خاڵەکانیشم بوو.

دایکم و باوکم دوو زارۆکیان پێش من ببوو، "لەیلا و ئەهمەد". کاتی خۆی باوکم بۆ سەردانی کەسوکاری کە بۆ "یەمەن" گەڕابۆوە، "لـەیلا و ئەهمـەد"ی لەگـەڵ خۆیـدا بردبوو. ئەو کاتە "لـەیلا و ئەهمـەد" تەمـەنیان 4-3 سـاڵان دەبێـت، بـاوکم بـە دایکمـی گوتبوو، پێی خۆشە زارۆکەکان لەگەڵ خۆیدا ببات، ئەویش ڕێگای دابوو. بەڵام هەر ئەو چوونە بوو، ئیـتر جـارێکی تـر ئـەو منداڵانـە نەگەڕانـەوە. ئـەو دەمـە مـن تەمـەنم دوو سـاڵان بـووە، هۆشـم بـەو شـتانە نەدەشکا، پاشـان زانیـم کـە دایکـم چـەند لـە بـیری زارۆکەکانیدا بووەو هەمیشە چاو لە دوویان بووە.

دایکم لە بارەی "لەیلا و ئەهمەد"ەوە نەدەدوا، ئێمەش هەر هێندەمان دەزانی کـە "لەیلا و ئەهمەد" لە شوێنێکی تر دەژین، بەڵام هەرگیز ئەو پرسیارە بە بـیری ئێمـەی منداڵاندا نەدەهات، یان لەو بارەیەوە پرسـیار بکـەین کـە بۆچـی ئـەوان لـەوێ دەژیـن و نایەنەوە..؟

پاش ئەوەی کە باوکم "لەیلا و ئەهمەد" لە تەك خۆیدا بۆ "یەمەن" دەبات، سەر لـە کەسـوکاری دەدات، مـاوەی نـۆ مـانگی پێدەچێـت، بـەبێ ئـەوەی لـەو ماوەیـەدا تــەنیا نامەیەکیش بۆ دایکم بنووسێ و ڕەوانە بکات، کاتێکیش کە بۆ "ئنگلانـد" دەگەڕێتـەوە "لـەیلا و ئەهمـەد"...! لەگـەڵ خۆیـدا ناهێنێتـەوە، دایکـم کـە بـەوە دەزانێـت هـەرگیز بڕواناکات کە باوکم کارێکی وایکردبێت.

لە وەڵامی پرسیارەکانی دایکمدا، باوکم بە دایکم دەڵێت: "بۆیـە منداڵـەکانم لـەوێ لەلای باوکم و دایکم جێهێشت، لەبـەر ئـەوەی کـە منداڵـەکان خۆیـان ئارەزوویـان لـەوە بوو، لە هەمانکاتدا لەوێندەرێ ژیانیان باشترە وەك لێرە، ئێمە دەتوانین هەموو جارێك

داوایان لێبکەین و بێن بۆ ئێرە سەردانمان بکەن، لـە هـەمانکاتدا خانوویـەکی گـەورە و ڕێك و پێکیشم هەیە لە "یەمەن" لە گوندی "مەرایس" لەبەر ئەو هۆیانە و ئارەزووی منداڵەکان خۆیان لەوێ بەجێم هێشتن".

دایکم لە وەڵامی باوکمدا دەڵێت: "چۆن شـتی وا دەبێـت..! دوو منداڵـی بچـوك لـە کوێ دەزانن بڕیاری وا بدەن..؟" بەڵام باوکم گوێ لە دایکم ناگرێت.

پـاش ئـەوە دایکـم نامـە بـۆ هـەردوو شـالیارگای دەرەوە و نـاوەوەی "بـەریتانیا" دەنووسێت و ڕەوشەکەیان بۆ ڕوون دەکاتەوە، بەڵام هەردوو شالیارگا بەم جۆرە وەڵامـی دایکم دەدەنەوە و دەڵێن: ("لەیلا و ئەهمەد" لە دایکەوە هـاووڵاتی "بـەریتانی" یـن لـە ڕێگای باوکیشەوە دوو هاووڵاتی "یەمەن"ین، ئێستا ئەو دوو منداڵە، کە لـە "یەمـەن"ن بە هاووڵاتی "یەمەن"ی دەژمێردرێن، ئێمە ناکارین لەو مافەیان دابڕین).

لە ماوەی ئەو دوو ساڵەدا دایکم پەیوەندی بە گەلێك کەسایەتییەوە کردبوو. بەڵام لە هیچ ڕوویەکەوە کەس نەیتوانی بوو یارمەتی بدا. پاش ئەوە دایکم جارێکی تر سکی پڕدەبێتەوە، ئیتر ناچار دەبێت درێژە بە ژیانی خۆی بدات. دایکم هەمیشە هـەوڵدەدات کـە خـۆی بـەوە رابـهێنێ و بڵێـت: (ڕاسـتە "لـەیلا و ئەهمـەد"، لـە "یەمـەن"ن، بـەڵام ژیانیان لای نەنك و باپیرەیان لێرە خۆشترە و چاکترە).

کـاتێکیش کـە ئێمـە گـەورە بوویـن و هۆشمـان کـردەوە، لـەو بارەیـەوە هێنـدە نەدەدواین.

مـن و "نادیـا"، دوو خوشـکی بچکۆلـە ترمـان هـەبوو بـە نـاوی "ئاشـیا و تینـا" هەروەها برایەکی بچکۆلەش بە ناوی "مۆ". ئێمە هەموومان لە خانوویەك لـە گـەڕەکی Lincoln دەژیاین. هەر لە دەرگای ئەو خانووەوە بوو کە ڕامکردە سەر جادەی Lincoln و ئۆتۆمۆبیلەکە لێیدام.

لـە پشـتەوەی خانووەکەمانـەوە باخچەیـەکی گـەورەمان هـەبوو، لـەوێ کۆترمـان ڕاگرتبوو، ماڵی ئێمە هەمیشە میوانمان هـەبوو و جمـەی دەهـات، زۆربـەی ئـەو کەسـانە خزم و کەسوکاری دایکم بوون، باوکم کەسوکاری لـە "ئینگلانـد" نـەبوو، لەبـەر ئـەوەش

هیچ شتێکمان لە بارەی کەسوکاری باوکمەوە، یان چۆنیەتی هاتنی بۆ "ئنگلاند"، نەدەزانی، بەڵام هێندە نەبێت ئەوەی کە خۆی دەیویست بۆی دەگێڕاینەوە.

باوکم ئەو کاتە لە کارگەی "British Steel" کاری دەکرد، لەملاو لاشەوە کەمە کارێکی تری دەکرد، بۆ ئەوەی شتێکی تریشی دەستکەوێ. لە بارەی دەرامەتەوە دایکم دەستی کورت بوو، لەبەر ئەوەی خێزانێکی گەورەی کەوتبوو بەسەردا، دەبوایە ورگی هەمووومان تێر بکات. کەچی لەگەڵ ئەوەشدا بە بیرم نایەت کە ڕۆژێك بێدڵی کرابم.

پاش ئەوەی کە نەنکم مرد، خاڵەکانم یەك لە دوای یەك گواستیانەوەو ڕۆیشتن، ئێمەش لە Lincoln نەوە بۆ گەڕەکی Washwood Heath گواستمانەوە ماوەیەکیش لەوێ ژیاین، پاش ئەوە باوکم بڕیاری ژیانێکی نوێی دابوو، دەستی لە کارەکەی هەڵگرت کە لە "British Steel" بوو بە هیوای ئەوە کە کارێکی سەربەخۆ بکات.

لەو گەڕەکەشەوە جارێکی تر بۆ گەڕەکی Sparkbook گواستمانەوە، وا دەزانم ئەو دەمە تەمەنم نزیکەی "دە" ساڵان بوو کە باوکم خانووەکەی ئاڵوگۆڕ کرد لەگەڵ دوکانێکی سەندەویچ فرۆشدا، خاوەنی دوکانەکە کابرایەکی تورك بوو، ئەم پیاوە هاوڕێی باوکم بوو. بەو گواستنەوەیە گەلێك دڵخۆش بووم، هەر لە سەرەتاوە ئەو گەڕەکە تازەیەم بە دڵ بوو. ئەو پیاوە لە دوکانەکەدا ماسی و پەتاتەی سوورەوەکراوی دەفرۆشت، لە دوکانەکەدا هەندێك کورسی و مێز هەبوو بۆ دانیشتنی ئەو کەسانەی کە بۆ نانخواردن دەهاتن. لە سەرووی دوکانەکەشەوە نهۆمێکی تر دروستکرابوو لە چەند ژوورێك پێکهاتبوو، ئێمە وەکو خێزان گواستمانەوە ئەوێ و لەوێ دەژیاین، ئەم گەڕەك و ناوچەیە تا بڵێی ساکار و دلگیر و پڕ لە دوکان و خانوو بوو، ئاواتخواز بووم هەموو ژیانم لەو گەڕەکەدا بەسەر بەرم.

کاتێك کە هەموو کەل و پەلەکانمان بۆ گەڕەکی Sparkbook گواستەوە، دایکم پێی گوتم: "تۆ و نادیا لەم گەڕەکە لە دایك بوون".

هەر کە گواستمانەوە دەستبەجێ کەوتینە پاککردنەوە و ماڵ ڕێکخستن. پاشان کەوتینە گەسکدان و پاککردنەوەی ناو دوکانەکە، بە دڵێکی خۆشەوە یارمەتی دایکمان

دەدا، باوکیشم کەوتە دەست پیاداهێنانی دوکانەکە. هەندێك ئاڵوگۆڕی لە دوکانەکەدا کرد، نزیکەی هەفتەیەکی خایاند تا بە یەکجاری دوکانەکەمان کردەوە.

لە کاتێکدا کە منداڵ بووین باوکم زۆر گوێی بە ئێمەی کچ نەدەدا، هەموو ڕۆژەکان بەکارەوە خەریك بوو، شەوانەش کە بۆ ماڵەوە دەگەڕایەوە، هەمیشە هاوڕێ "ئارەب"ەکانی میوانی بوون و کۆڕیان گەرم و بە "ئارەب"ی دەپەیڤین.

ئەو کاتەی کە چووینە فێرگەی ناوەندی، باوکم وەك هەموو باوکانێکی تر هەڵسوکەوتی بەرامبەرمان گۆڕا، بەڵام لە چاوەکانی ئەمدا، ئێمە ژنی تەواو بووین و لە تەمەنێکی زیادەڕۆیی ترسناکدا خولمان دەخوارد، هەمیشە باوکم بەرامبەرمان مۆن و گرژ و داخراو بوو. من و "نادیا" کە تەمەنمان گەیشتە دوازدە و سیازدە ساڵان، هەمیشە باوکم چاو لە دوومان بوو، کە چی دەکەین و چی ناکەین، هەر کاتێك کە دەمانویست بچینە دەرەوە، دەبوایە بیانویەکمان بۆ چوونە دەرەوەمان بدۆزیایەتەوە، زۆرجار بە ناچاری پێم دەگوت: (دەچم بۆ ماڵی خاڵم و بە دیار منداڵەکانەوە دەبم). ئەمە تەنیا لەبەرئەوە کە دەمخواست سەر لە هاوڕێیەکم بدەم، یان لەگەڵ هاوڕێکانمدا بۆ سینەما، یان دیسکۆ بچین.

لە نزیکی ماڵەوەمان پارکێکی خنجیلانە هەبوو، لەسەر سوچی ئەو پارکە دیسکۆیەك هەبوو هەموو هەفتەیەك دەکرایەوە، گەلێك ئارەزووم دەکرد لەگەڵ هاوڕێکانمدا بۆ ئەو دیسکۆیە بچین. هەر کاتێکیش باوکم لوتی بە لوتی خاڵمەوە ببوایە، خاڵم بە باوکمی دەگوت: (نادیا لە ماڵی ئێمەیە). بە هەمان شێوەش دایکم دەیزانی کە لە کوێم، بەڵام دەنگی نەدەکرد، لە هەمانکاتدا دایکم ئەوەشی چاك دەزانی کە بۆچی هەمیشە باوکم بەرامبەرمان گرژ و مۆن و تووڕەیە، بەڵام هەرگیز دەری نەدەبڕی.

کاتێك کە تەنورەمان لەبەر دەکرد هەرگیز باوکم چاوی پیاماندا هەڵنەدەهات، هەرچەندە تەنورەکانمان درێژو تا سەر ئەژنۆمان دەهات، یان بەوە شێتگیر دەبوو کە کاسکێتمان لەسەر بکردایە، لە چاو و مێشکی ئەودا کاسکێت لەسەرکردن، پیشەی سۆزانیەکان بوو، کە کاتێك دنیا تاریك دادێت بە شەقامەکاندا بۆ کڕیار دەسووڕێنەوە.

ئەو مـ ڕۆڤانەی کە هەمیشە باوکم کینی لێیان بوو، مرۆڤی ڕەشپێست بوون، هاوڕێ "ئارەب"ەکانیشی هەر بە هەمان شێوە دڵڕەش بوون.

لـەو باخچەیـەی نزیـك ماڵـەوەمان کۆمـەڵێك کـوڕی ڕەشپێسـت ڕۆژانــە مۆسـیکی "جامایکا"یيان دەژەنی، بە ڕیتمێکی ناسك و دڵفڕێن، باوکم دەیزانـی کـە مـن ئـارەزووم لەو جۆرە مۆسیك و ڕیتمانەیە، لە هەمانکاتدا هاوڕێیەتیم لەگەڵ ئەو کەسانەدا خۆشە، بـە تاسـەوە گـوێ بـۆ ئـەو جـۆرە مۆسـیکانە رادەدێـرم، لەبـەر ئــەوە دوو چـاوی پێمـدا هەڵئـەدەهات، هەمیشـە کینـی لـەو مرۆڤانــە دەبـوەوەو نــەفرەتی لێدەکـردن. زۆرجـار پرسیارم لە دایکـم دەکـرد، (بۆچـی بـاوکم چـارەی ئـەو مرۆڤانـەی نـاوێ و کینـی لێیـان دەبێتەوە...؟) دایکم ئـاوا وەڵامـی دەدامـەوە (نـازانم، دەتوانـی ئـەو پرسـیارە لـە بـاوکت بکەیت.) بەڵام من هەرگیز نەمدەوێرا ئەو پرسیارەی لێبکەم.

باوکم نەیدەتوانی بەرامبەر بـەو مرۆڤانـە ئـەو دڵرەشـییەی بشارێتەوە، هەمیشـە دەیگوت: "لەو شوێنەی کە منی لێوە هاتووم، ئەو مرۆڤە رەشانە کۆیلەن، ئـاوا پێویسـت دەکات."

من ئەو کاتە نـەمدەزانی و هیـچ زانیاریـەکم دەربـارەی دیرۆکـی مرۆڤـە رەشـەکان نەبوو، پاشان تێگەیشتم، کە "ئەتیوپی"ەکان چەند کار و تێکۆشانیان کردووە تـا وڵاتـی "میسـر" و وڵاتـانی تـری "ئـارەب"یـان دروسـتکردووە. "ئـارەب"ەکـانیش لـە سـەرەتاوە زمانەکەیان هەر لـە "ئـەفریکا"وە هـاتووە. مـن هـەرگیز لـەوە نەدەگەیشـتم کـە بۆچـی بـاوکم ئـاوای بـیری دەکـردەوە..! لـە کـاتێکدا کـە مـن لـە نـاو مرۆڤـە ڕەگـەز جـۆر بـە جۆرەکاندا گەورە ببووم، هەرگیز وا بـیرم نـەدەکردەوە کـە هیـچ جودایـی لـە نێوانیـاندا هەیە، هەموو هاوڕێکـانمم خۆشدەویست، لـە فێرگـە هـەمووومان تێکـەڵاو بوویـن، بـەبێ جودایی ڕەنگەکانمان، کاتی خۆشمان پێکەوە بەسەر دەبرد.

ئەوەی کە جێگای سەرنـج بوو، لە کاتێکدا کە ئەو کوڕ و پیاوانە دەهاتن لـە دوکـان نانیان دەخوارد، من بە ئاسـایی دەمدوانـدن و خـواردنم لـە بـەردەم دادەنـان و خزمـەتم دەکردن، کەچی لەم بارەوە باوکم هیچ جۆرە دژایەتیەکی بەرامبـەرم نـەدەکرد..! بـەڵام هـەر کـاتێك لـە دەرەوەی دوکـان لەگـەڵ یـەکێك لـەو پیـاو و کوڕانـە جـا رەش، یـا سـپی

بپەیڤیمایە، باوکم بە جارێك کەللەیی و شێتگیر دەبوو، دەکەوتە پرسیار لێکردنم، "ئەوانە کێن..؟" لە کاتێکدا کە خۆشی دەیناسین، پێی دەگوتم: "ئاگات لە خۆت بێت، واز لەمانە بێنە، جارێکی تر مەیان دوێنە." باوکم ئەم هەڵسوکەوتەی بەرامبەر بە "نادیا"ش هەبوو. لەمانەش بترازێ هەندێ جاریش بەرامبەر بە خاڵەکانم نائاسایی بیری دەکردەوە، ڕێگەی ئەوەی لێدەگرتم کە سەردانی ئەوانیش بکەم...! ئەو تێڕوانین و بیرانەی، هێندەی تر باوکمیان لەبەر چاوم چارەگران کردبوو.

هەر کاتێك هاوڕێکانم بیانویستایە دەیانتوانی بە ئازادی بچنە دەرێ، باوکەکانیان تەنیا ئەوەندەیان پێدەگوتن: "پێویستە کە کاتژمێری نۆ، لەماڵەوە بن، یان بەو شێوەیە".

بەڵام من کە لە فێرگە دەگەڕامەوە، بۆم نەبوو پێ بخەمە دەرکی دەرەوەش، بە ناچاری درۆم دەکرد. درۆم کردە بەردەباز بۆ چوونە دەرەوە، من لە کۆششی ئەوەدا بووم کە باوکم ڕێگای ژیانم لێنەگرێت. کە تەمەنم گەیشتە پازدە ساڵی بەبێ گوێدانە باوکم بە خشکەیی بۆی دەردەچوومە دەرەوە، ئەو چی دەگوت و چۆنی بیری دەکردەوە، ئەوە کاری بە منەوە نەبوو، وازم لێدەهێنا دایکم بۆی ڕوونکاتەوە، کە لە کوێم و لە کوێ نیم.

من ئەوەم چاك دەزانی کاتێك کە بۆ ماڵەوە دەگەڕێمەوە، دەبێت بە هەڵاوهۆریا و بگرەو بەردە، باوکیشم وای لێنەدەدام کە بە ئازار بێت، لەگەڵ ئەوەشدا هەرگیز بڕوای پێمان نەبوو، کە پێمان دەگوت: "بۆ شوێنێك دەچین" زۆر جار بە دزیەوە دووراو دوور شوێنمان دەکەوت، تاکو بزانێت بەرەو ئەو شوێنە دەچین یان، نا..! هەندێك جار خۆمان لەبەر چاوی وندەکرد، ئەو کاتەی کە بۆ ماڵەوە دەگەڕاینەوە، دەکەوتینە بەر پرسیار و لێپرسینەوە، لە کوێ بوون و بۆ کوێ چوون، چیتانکرد، لەگەڵ کێ بوون و کێتان بینی..؟ بەڵام من بەرامبەر بەو شتانە ڕاهاتبووم. کردبووم بە پیشە، کاتێك کە بەرەو ماڵەوە دەگە ڕامەوە، یەکسەر لە دەرگای دەرەوەوە ڕێگای ژوورەکەی خۆم دەگرتە بەر بەبێ ئەوەی کە سەیری کەس بکەم و کەس بدوێنم، ئاوا خۆم ڕاهێنا بوو کە باوکم پشتگوێ بخەم. باوکم بەم کارە گەلێك شێتگیر دەبوو. من بڕوام بەو گوتە پڕو پوچ و

ناوەڕۆك بۆشانە نەبوو کە دەری دەبڕین، یان ئەو شتانەی کە ئەو چاوەڕێیان بوو لێمان ڕوویدات، کاتێك بە شەو دەچووینە دەرەوە، هەمیشە لە هاتوو چۆکردندا بێ ترس بووین، ئەو گەڕەکە، گەڕەکی خۆمان بوو، زۆربەی ئەو کەسانەمان دەناسی کە هاتوو چۆیان دەکرد، ئێمەش دەمانزانی چی دەکەین و چی ناکەین.

لە کاتێکدا ئەگەر کاتژمێر شەشی ئێوارەش بۆماڵەوە بگەڕاینایەتەوە، باوکم هەر لە هەمان دڵە ڕاوکەدا بوو، زۆری لێدەکردین تا بزانێت لە کوێ بووین و چیمان کردووە. منیش کردبووم بە ڕێباز و پێم دەگوت: "لە فێرگە بووم" لە ڕاستیدا لەگەڵ هاوڕێکانمدا لە باخچە و پارکەکەی نزیك ماڵی خۆمان بووین. لەو تەمەنەدا هەرگیز ئارەزووی ئەوەم نەدەکرد بۆ ماڵەوە بگەڕێمەوە.

دایکم هەمیشە بێدەنگ بوو، دەمزانی کاتێك کە من و "نادیا" لە ماڵەوە نابین لەسەرمان بە دەنگ دێت و هەڵدەداتێ. لە ڕاستیدا ئێمە بە بەردەوامی نەدەچووینە دەر ەوە، کاتێك من و "نادیا" کە لە فێرگە دەگەڕاینەوە، لای ئێواران لە دوکان یارمەتی دایکمان دەدا و بەردەستیمان دەکرد، مێزەکانی نانخواردنی دوکانمان پاکژ دەکردەوە، ئێمە کارمان زۆر بوو، لەبەر ئەوەی کە خەڵکانێکی زۆر ڕوویان لە دوکان دەکرد، دایکم پێش ئێمە دەستی بەکار دەکرد و خەریکی ئامادەکردنی خواردەمەنی بوو، من و "نادیا"ش بەلامانەوە خۆش بوو کە یارمەتی دایکمان بدەین و بە هەرەوەزی و بە کۆمەڵ کار بکەین. ئەو خانووەی کە تیایدا دەژیاین لەسەر دوکانەکەی خۆمان بوو، دوو هۆڵی دانیشتن و سێ ژووری خەوتنمان هەبوو، من و "نادیا" بە هەردووکمان ژوورێکمان هەبوو، ژوورەکەی ئێمە کەوتبووە بەشی ژووروی خانووەکەوە.

من و "نادیا" وەکو هەموو جووتە خوشکێکی تر هەمیشە پێکەوە بووین، تەواو پێکەوە هەڵمان دەکرد و لەگەڵ یەکدا دەگونجاین، بەڵام خوشکەکەی ترمان کە لە من و "نادیا" گچکەتر بوو "ئاشیا" بۆ هەموو شوێنێك بە دوامانەوە بوو. من هەر وەك منداڵێك سەیرم دەکرد، هەمیشە پاڵمان پێوەدەنا تا لە کۆڵمان بێتەوەو یەخەی لە یەخەمان بکاتەوە. ئەویش دەکەوتە هەڕەشە لێکردنمان و دەیگوت: "دەبێت بۆ باوکم بگێڕمەوە کە چی دەکەن". بەڵام من و "نادیا " پشتی یەکترمان دەگرت و بەرگریمان لە

یەکتری دەکرد، من لەگەڵ "نادیا"دا زۆر کامەران بووم، هەردەم دەمویست یارمەتی بدەم، "نادیا" بۆ من مرۆڤێك بوو لە بری هەموو شتێك، لەگەڵ ئەوەشدا کە دوو هاوڕێی هەمیشەیی یەکتری بووین، بەڵام هەریەکەمان هاوڕێی خۆشی هەبوو، ئەو لە خوێندندا پۆلێك لە دوای منەوە بوو، بەڵام ئەو لە من زرنگتر بوو. کاتێکیش کە پێکڤە بۆ ناو پارکەکە دەچووین، زۆر جار ئەو لەگەڵ هاوڕێکانیدا بە تۆپ تۆپێنەوە، یان هەڵگەڕان بەسەر درەختی ناو پارکەکەدا خەریك بوون. بەڵام ئەو کاتانەی کە بە تەنیا دەبووم، کاتەکانم لە یانەی ناو پارکەکە بە یاری تێنس و بیلیارد یان بە خوێندنەوەی پەرتوکەوە بەسەر دەبرد.

من و "نادیا" هەریەکەمان، ئارەزوویەکی جودامان هەبوو، بەڵام هەر یەکەشمان دەیزانی ئەوی کەمان لە کوێیە. هاوڕێکانی "نادیا" بە ڕێکەوت لەگەڵ پۆلیسدا تووشی گاشەی ەك هاتبوون، بەڵام شتێکی هێندە گرنگ نەبوو، تەنیا ناکۆکیەکی سەر ڕێگا بوو. لە یانەکەدا زۆر شت هەبوو کە مرۆڤ خۆی پێیانەوە خەریك بکات، زۆرجار بە دروستکردنی وێنە و کاری بۆیەکاری و ئەو شتانەوە خەریك بووین کە زارۆکانی دەخستە جموجۆڵ و چێژیان لێوەردەگرت، بۆ نموونە تابلۆمان دەکێشا، شانۆنامەی کورتمان دەنووسی، کە بۆ منداڵان بگونجێ، تاکو زارۆکان بکارن بە سانایی ڕۆڵی خۆیانی تێدا بلێژن.

لە ڕاستیدا ئەو یانەیە بۆ هەموو مرۆڤە تەمەن جۆر بە جۆرەکان بوو، ئێمەش زۆرمان ئارەزوو دەکرد، یارمەتی ئەو کارمەندانە بدەین کە لەوێ خەریکی پەروەردە کردنی زارۆکان بوون. جارجاریش لەگەڵ زارۆکاندا بە گاڵتەوگەپ و کێبڕکێ و چاوشارکێوە کاتمان بەسەر دەبرد.

دێتەوە یادم جارێکیان وێنەیەکی گەورەی جەژنی "کرسمس"مان کێشا، لە کێبەرکێیەکدا دوو "پاوەن"مان بردەوە.

کاری دوکانەکەمان باش دەڕۆیشت، هەمیشە کڕیار بۆ خواردنی چبس و ماسی سوورەوە کراو دەهاتن. هەبوون چبس و ماسیان بۆماڵەوە لەگەڵ خۆیاندا دەبردەوە. لە ناو دوکانەکەدا مێزێکی "بیلیارد" هەبوو کوڕان بە دەوریدا کۆزیلکەیان دەکرد،

هەروەها "ستروپ"ێکی گەورەی ئۆتۆماتیکیشی لێبوو بە دراو کاری دەکرد و گۆرانی دەگوت، هەمیشەش کڕیار لە دوکان هەبوون. ئەو کاتانەی کە من و "نادیا" لە دوکان کارمان دەکرد و یارمەتی دایکمان دەدا، سەر مێزەکانمان خاوێن دەکردەوە و خواردنمان دەخستە بەردەمی کڕیاران، بە هۆی کارەکەمانەوە وامان لێهات، زۆربەی خەڵکانی گەڕەك و ناوچەکە بناسین. ئەم مرۆڤانە سەرجەم مرۆڤی ئاسایی بوون و ڕۆژێك لە تەکیاندا تووشی گاشە و ئاستەنگ نەهاتین. لە فێرگەش من و "نادیا" دوو شاگردی باش بووین. بەڵام هەندێك گلەیی و گازندە لە "نادیا" دەکرا، هەندێك جار گرژی لە نێوان "نادیا" و هاوڕێکانی پۆلەکەیدا ڕوویدەدا. بەڵام لە بارەی خۆمەوە لەسەر کارتی نمرەی ساڵانە، لە بارەی خووڕەوشتەوە بۆیان دەنووسیم "دەمەوەرە". من لە زمانی "ئینگلیز"یدا باش بووم، زۆر ئارەزووم لە خوێندن و نووسین و واژەکردن هەبوو، هەمیشە لە پۆلدا مامۆستاکانم هەڵیان دەستاندم، بۆ ئەوەی بە دەنگی بەرز شت بخوێنمەوە، منیش زۆر ئارەزووم لەو بەزمە هەبوو. بە بەردەوامی لە جانتاکەمدا پەرتوکم لەگەڵ خۆمدا هەڵدەگرت، بۆ هەر شوێنێك بچووومایە ئەو پەرتوکانەم دەخوێندەوە، وەك ڕۆمانی دڵداری و خۆشەویستی. ڕۆژانی پشوودانیش بە تەنیا دەچووم بۆ پارکەکەی نزیکی ماڵەوە و لەسەر جۆلانەیەك دادەنیشتم، تا درەنگ بە پەرتوك خوێندنەوەوە کاتم بەسەر دەبرد، کە دەستم بە خوێندنەوەی پەرتوکێك بکردایە، نەمدەتوانی بە سانایی دەست لە خوێندنەوەی هەڵگرم تا تەواوم نەکردایە. هەندێك جاریش ئەگەر ڕۆمانەکە بە شێوەیەکی خەمناکانە کۆتایی بهاتایە دەگریام. من هەمیشە دڵناسك بووم، ئێستاش هەروام، کاتێك ڕووداوێکی بە ئازار و خەمناك دەبینم، یان لە پەرتوکێکدا کارەساتێك دەخوێنمەوە، وەکو ڕووداوی ڕۆمانی "ڕەگەکان" دەربارەی کۆیلە ئەفریکیەکان، کە چۆن لە ماڵەکانی خۆیان لە "ئەفریکا" بۆ شوێنە دوور و شارە باشووریەکانی ئەمریکا ڕاپێچکران. بە سەرنجەوە ئەو پەرتوکەم شەش جار خوێندەوە. ئەو دەمە نەمدەزانی کە ئەو پەرتوکە چەند بەکەڵك و گونجاو دەبێت، کوتومت ژیانی داهاتووی منیش دەبێت.

له ڕۆژێکی شەممەی ساڵی 1979 من و دایکم و "نادیا" بۆ ناو شار چووین، بۆ ئەوەی هەندێك کەلوپەل بکڕین، چووینە ناو "سۆپەرمارکناد"ێکی گەورەوە لە خەڵکیدا جمەی دەهات، ئێمە سەیری ئەو جلوبەرگ و شتانەمان دەکرد کە هەڵواسراو و دانراوبوون. هەر لە زێڕەوە تا جانتای دەست و گرامافۆن و زۆر شتی تریش. "نادیا" لای ئەو شوێنەوە ڕاوەستا کە زێڕیان لێ دانابوو، "نادیا" بە سەرنجەوە سەیری دەکردن، لەو کاتەدا دڵی بە موستیلەیەکدا دەچێ و هەڵی دەگرێت بۆ ئەوەی کە نیشانی دایکمی بدات، "نادیا" خۆی بۆ لای دایکم وەرچەرخاند، هاواری لە دایکم کرد، "دایە دەتوانی ئەم موستیلەیەم بۆ بکڕی..؟ نرخی نەوەد "پێنس"ە". کە دایکم لە "نادیا" چووە پێشێ، یەکسەر پیاوێك لە دواوە بە هەڵە داوان پەلاماری پەلی "نادیا"یدا و گرتی، بە "نادیا"ی گوت: "تۆ ویستت ئەو موستیلەیە بدزی و بۆی دەرچی، بەبێ ئەوەی کە بتەوێ بایبەکەی بدەی...!"

بوو بە هاتو هاوار، لێپرسراوی ئەو شوێنە گاڵی پۆلیسی لێکردین، "نادیا"ی بەوە تاوانبار کرد، کە گوایا ویستویەتی ئەو موستیلەیە بدزێ. پاش ئەوەی بۆ ماڵەوە گەڕاینەوە. چەند ڕۆژێك بەسەرچوو "نادیا" درایە دادگا. من و دایکم بووینە گەواهیدەری، کەسی تر بە ئاگا نەبوو کە ببێتە گەواهیدەر، من و دایکم ڕاستی ڕووداوەکەمان ڕوونکردەوە کە چۆن بووە. پێمان گوتن: ("نادیا" نیازی دزینی موستیلەکەی نەبووە). بەڵام لێپرسراوی ئەو شوێنە لەسەر وتەکانی خۆی سوور بوو، ئاسان نەبوو کە بڕوا بە من و دایکم بکات. لە ئەنجامدا دادگا داوای لێپرسراوی پەسەند کرد، دایکم "دراوە سزا"کەیدا، "نادیا"ش کەوتە ژێر مەرج و چاودێریەوە، پێش ئەم ڕووداوە ئێمە کەسمان هیچ جۆرە گرفتێکمان لەگەڵ پۆلیسدا نەبوو، بەم بڕیارە تەواو پەستی دایگرتین، لەبەر ئەوەی دەمانزانی کە "نادیا" بە هیچ جۆرێك مەبەستی دزینی ئەو موستیلەیە نەبووە. ئێمە نەمانزانی لە کوێوە و چۆن باوکم ئەمەی زانی بوو، لەگەڵ ئەوەشدا بۆ ڕۆژی دادگا لە تەکماندا نەهات، یان لە لایەکەوە مشوری یارمەتیمان بخوات، بە پێچەوانەوە لەگەڵ هاوڕێ "ئارەب"ەکانیدا، کەوتبووە تانە لێدانمان، دەربارەی شەرم و شوورەیی پێی گوتبوون: "ئابڕووی تکاوە و خێزانەکەی ڕاپێچی دادگا

کراوه و کچەکەشی ناوی کەوتۆتە لیستەی دزانەوه..!" باوکم وا هەستی دەکرد و پێی لەسەر ئەوه دادەگرت، کە خووڕەوشتی ئێمە کەوتۆتە مەترسیەوەو پێویستە لەسەری کە بمانخاتەوه سەر ڕێگای ڕاست و فێری ئەوەمان بکات کە خووڕەوشتی ژنانی پاك و ڕووسووری "ئارەب" هەلگرین..! باوکم شەڕی ئەوەی دەکرد کە "نادیا" مۆری دزی لێدراوه. کاتێك کە لە "یەمەن" تێکەڵاوی خزمەکانی باوکم بووم. ئەوەیان درکاند و پێیان گوتم: "کە باوکم خۆی دز و دەستبڕ بووه". بۆیان گێڕامەوه کە باوکم هەرچی خشڵ و زێڕ و زیوی باوەژنەکەی هەبووه، هەمووی دزیوه و فرۆشتویەتی، بە پارەکەی سەفەری "ئنگلستان"ی کردووه.

لە کۆتایی ساڵی شەستدا، ئێوارەیەك دایکم بروسکەیەکی پێدەگات، لە بەندیخانەی Wnison Grenوه، لەو بروسکەیەدا باوکم داوا لە دایکم دەکات، کە بۆ لای یەکێك لە هاوڕێ "ئارەب"ەکانی بچێت، هەندێك دراویان لێ وەرگرێت بۆ ئەوەی "دراوه سزای" دادگا بدات. پێش ئەوەی ئەم بروسکەیە بە دایکم بگات، لای بەیانی هەمان ڕۆژ، دایکم بەوەی زانی بوو کە باوکم بەرەو پۆلیسخانە ڕۆیشتووه، بۆ ئەوەی چاوپێکەوتنی لە تەکدا بکرێت، بەڵام تا ئەو کاتەی کە بروسکەکەی بە دەست دەگات، دایکم نازانێ کە باوکم فڕێدراوەتە کونی زیندانەوه، دایکم داخوازیەکەی باوکم بەجێدێنێ و دراوەکەی بۆ دەهێنێ و ئازادی دەکەن. پاش ئەوەش تا ئەو دەمانەش دەبوایە دایکم هەموو هەفتەیەك بەرەو پۆلیسخانە بچێت و "دراوەسزا"ی باوکمی بدایە، لە سزای ئەو سەرپێچی کردنانەی کە کردبوونی، وەك نایاسایی و سەرپێچی کردن لە ترافیك و هاتوچۆ کردن و نەدانی کرێخانوو و پارەی ئاو و ئەلەتریك... هتد. باوکم پێی شوورەیی بووه، کە خۆی بچێتە لای پۆلیس و ئەو کارە بکات.

# بەشی دووەم
# پیلانێکی نەهێنی باوکم

ئەوەی دێتەوە یادم، سالانێکی دوورە، کە هەمیشە هاورێ "ئارەب"ەکانی باوکم لە ماڵەوە لای باوکم کەوتبوون، هاورێکانی باوکم تەنیا پیاو بوون، شەو و ڕۆژیان بۆ نەبوو، هەمیشە لەگەڵ یەکتردا بە "ئارەب"ی دەپەیڤین، ئەز هەر لە منداڵیەوە لە تەك ئەم بەزمەدا راهاتبووم، بەلامەوە ئەم دانیشتنانە گرنگییەکیان نەبوو. ژن و کیژەکانی ئەم پیاوانە بۆیان نەبوو لەم کۆڕە پیاوانانەدا بەشدار بن، بەوە دەچوو کە ئێمەی "مێینە" لەلای ئەم "نێرینانە" هەر بوونیشمان نەبێت.

لەناو ئەم پیاوانەدا پیاوێکیان تێدا بوو،ناوی "جەواد" بوو، بەتایبەتی ئەم پیاوە زۆربەی کات لە ماڵی ئێمە بوو، هەر لەو دەمەوە کە ئێمە زارۆکی گچکە بووین، ئەم پیاوە هاتووچۆی دەکردین، ئەم پیاوە نزیکترین هاورێی باوکم بوو، لەگەڵ باوکمدا هەمیشە سەریان بە سەری یەکترەوە بوو، زۆربەی جار پێکڤە یاری کاغەزیان دەکرد.

ئەم دوو پیاوە هەمیشە نێوانیان گەرم بوو، بەدرێژایی ئەو کاتانەی کە پێکەوە بوون هەرگیز لێیان تێنەدەگەیشتم و نەمدەزانی باس لە چی دەکەن. لە چەند وشەیەکی "ئارەب"ی بەولاوە، وەکو سوپاس، یان کوپێك چام دەوێ" هیچی تر تێنەدەگەیشتم، لەبەر ئەوەی کە ئەوانە پیاو بوون و گەورە بوون، لە هیچ روویەکەوە گرنگییان بە من نەدەدا، بەهەمان شێوە هیچ شتێکی ئەو پیاوانەش، سەرنجی منی زارۆکیان رانەدەکێشا.

زۆربەی ئێواران ئەم پیاوانە بۆ یانە دەچوون، دایکیشم لە دوکان خەریکی کارکردن بوو، من و "نادیا" یارمەتیمان دەدا، ئێمە هیچمان لەبارەی ئەو پیاوانەوە نە دەزانی کە چی دەکەن و چیان لە ژێر سەردایە.

دایکم هەمیشە ئاوا خۆی نیشان دەدا، کە تەنانەت بیر لەوەش ناکاتەوە کە باوکم چۆن هەڵسوکەوتی لە تەکدا دەکات. دایکم لەگەڵ ئەو خوورەوشتەی باوکمدا راهاتبوو، وادەزانم دایکم هەستی بە جیاوازیەك دەکرد لە نێوانی خۆیی و هاورێکانیدا، دوای ئەوە لە کەسانی ترەوە بەر گوێم کەوتەوە، ئەو دەمانەی کە ئێمە منداڵ بووین، کاتێك کە دایکم دەیبردین بۆ دەرەوە بە ناو پارکەکاندا دەیگەڕاندین و باوکم لە تەکماندا نەدەهات، ئەوە گەلێك دایکمی نائارام کردووە، لە کاتێکدا دایکم ژن و مێردی تری بینیوە کە چ ۆن پێکەوە بەلاو دووی یەکتر و زارۆکەکانیاندا دێن، ئەم بینین و دیمەنانە گەلێك ئازاریان بە دایکم چەشتوە.

لە ماوەی بیست ساڵی رابردوودا دایکم و باوکم پێکڤە هاوژینی یەکتری بوون و هەفت منداڵیان هەبووە، بە درێژایی ئەم ساڵانە مارەبڕی یەکتری نەبوون.

تەمەنی دایکم هەڤدە ساڵان بووە کە باوکمی ناسیوە. باوکم لە وڵاتی "یەمەن"ەوە. لە گوندی "مەرایس"ەوە هاتووە، کە دەکەوێتە دەرەوەی بەندەرە شاری "ئەدەن"ەوە. باوکم بۆ دایکمی گێڕابۆوە، کە لە تەمەنی پازدە ساڵیەوە لە وڵاتی "یەمەن"ەوە رایکردوە و خۆی گەیاندۆتە "ئنگلستان"، هۆکەشی ئەوە بووە، باوکی ویستویەتی بە زۆر ژنی لێ مارە ببڕێ و بۆ بهێنێ.

باوکم ئەو کاتەی کە "لەیلا و ئەهمەد"ی لەگەڵ خۆیدا بۆ "یەمەن" برد بوو،دایکمی بە تەنیا لەگەڵ ئێمەی سەرو پێچکە لە ژوورێك لە گەڕەکی birmingham بەجێهێشت بوو، زۆربەی هاورێکانی باوکم هەر هەمان هەڵسوکەوتیان لەگەڵ ژنەکانیاندا هەبوو، کاتێك کە بۆ "یەمەن" دەگەڕانەوە، ماوەی چەند مانگیان پێدەچوو، دوای ئەوە پیاوەکان بە خشکەیی بۆ "ئنگلاند" دەگەڕانەوە، ماوەیەکی تریش دەستیان بەکار دەکردەوە، هەندێك لەم پیاوانە بۆ کارکردن بۆ وڵاتە خاوەن

نەوتـەكان دەچـوون، وەك "كویـت"، "سـەئودى"، بـۆ ئـەوەى هـەندێك دراو پاشـەكەوت بكەن و هەندێكیش بۆ ژن و خێزانەكانیان لە "یەمەن" بنێرنەوە.

بەهۆى گەڕان بە دواى كاردا، پیاوانى "یەمەن"ى رەهەندەى ولاّتـان بـوون. لەگـەڵ ئەمەشدا پیاوەكان ئارەزووى زۆریان لە گەڕان بـە ولاّتـاندا هەیـە، بـە ئـارەزووى خۆیـان چۆنیـان بـە دڵ بێـت رادەبوێـرن، ژنەكانیشـیان لـە كونجـى ژوورەوە و نـاو گونـدا بەجێدێڵن، ژنەكانیان دەبێت بە بەخێوكردنى منداڵ و ئاژەڵ و كـارى ناومـاڵ و زەوى و زار و كشتوكاڵەوە خەریك بن.

ماوەیـەك پێـش ئـەوە كـە پشـووى خوێندنـى سـاڵانەمان دەسـت پێكـات، كـارێكم دۆزیـەوە،دواى ئـەوەى پـاش نیـوەرۆژ لـە فێرگـە دەگەڕامـەوە، لەگـەڵ "لینێـت" كـە نزیكـترین هـاوڕێ بووین، كـاریى گەسـكدان و پاككردنـەوەى چـەند دام و بیرۆیـەكمان دەكرد. ئەو كەسانەى لە بیرۆكاندا كارمەند بوون، ئەوان پێیـان دەگوتـین كـە چۆن كـار بكـەین. ئـەم كـارە یارمـەتى ئـەوەیدام كـە هـەندێك دراو پاشـەكەوت بكـەم بـۆ كڕینـى جگەرە و كاسێت و قەوان... هتد. من زۆر ئارەزووم لە مۆسیكى ئەمەریكایى soul reggae هەبوو، ئێستاش بە بەردەوامى ئەو كاسێتانە دەكڕم.

هەر لەو دەمانەدا بەدزى باوكمـەوە دەسـتم بـە جگـەرە كێشـان كـرد، رۆژى چـەند جگەرەیەكم دەكێشا، ئەو سەردەمە لە دوكانەكاندا جگەرە بـە تـاك دەفرۆشـران، منیـش تاكە تاكە جگەرەم دەكڕى، پێش ئەوەى كە هەندێك دراوم لە دەسـتدا بێـت بـە دزیـەوە ناخونەكم لە جگەرەكانى دایكـم دەدا،ئاودەسـتێكمان هـەبوو كـەوتبووە پشـت باخەكـەى دوكانـەوە، بـۆ جگـەرە كێشـان خـۆم بـەوێدا دەكـرد و دەرگـام لەسـەر خـۆم دادەخسـت، رۆژێكیان دایكم بەسـەردا هـات، لـەو كاتـەدا خـەریكى جگـەرە كێشـان بـووم. پێـى گـوتم :"ئەگەر باوكت بزانێ جگەرە دەكێشى دەتكوژێ."

نایەتەوە یادم هۆى چى بوو، كە دەستم بە جگەرە كێشان كرد. بەلاّم دێتەوە یـادم پێش ئەوەى دەست بە جگەرە كێشـان بكـەم، دانـەكانم گـەلێك سـپىو جـوان بـوون، زۆر خزمـەتم دەكـردن، بـەلاّم جگـەرە كێشـان ئـەو جوانیـەیانى لـە نێوبـرد. لـە سـەرەتادا جگەرەم كەم دەكێشا، تا ئەو كاتەش كە "ئنگلاند"م جێهێشت.

هیـچ کـاتێك بـاوکم دژایـەتی ئـەوەی نـەدەکردم کـە هاوڕێیـەتی "لینێت" بکـەم و یـەکتر ببینـین، بـاوك و دایکـی "لینێـت" دوکانێکیـان هــەبوو کــەوتبووە ســەر جـادەی Stratford Road منیش بە بەردەوامی سەرم لێدەدان و بە پێی توانا یارمەتیم دەدان. من بیرم لەوە نەدەکردەوە کە کاری گەسکدان بکەمە پیشە، ماوەی کارکردنەکەش تەنیا دوو سێ مانگ بوو، بە تایبەتی ئـەو کاتـەی بـاوکم دای بـە گوێمـدا، بـۆ پشـووی هاوینـە، بـۆ "یەمەن" دەمانبنێرێت.

لەڕاستیدا دەمویست چەند کۆرسێك وەربگـرم، ببمـە "پـەروەردەکار"ی منـداڵان و کار لەگەڵ منداڵاندا بکەم، زۆر دڵم بەوەوە بوو لە یانەکەدا یارمەتی منـداڵان بـدەم، لـە فێرگەش لە بەشی خوێندنی پراکتیکـدا هـەر ئـەو رشـتەیەم هـەڵبژارد، هـەموو ڕۆژانـی چوار شەممەیەك لە پۆلەکەماندا هەر شاگردێك بەو کار و رشتەیەوە خەریك دەبوو کە هـەڵی بژاردبـوو، هـەندێك لـە هاوڕێکـانی پۆلەکـەم دەچوونـە پەرتوکخانـە، بــۆ ئــەوەی خۆیان فێری چۆنیەتی کارکردنی ناو پەرتوکخانە بکەن. ئەوان دەیانویست لـەو بـوارەدا کـار بکـەن. ئـەز دەچوومـە باخچـەی سـاوایان و سـەیری کــارگێڕانم دەکـرد، کـە چـۆن کاردەکەن و چۆن زارۆکان پەروەردە دەکەن، ئاواتم ئەوە بوو، بچمە زانکۆ بــۆ خوێنـدنی باڵا ئەو رشتەیە بخوێنم، مـن هەسـتم بـە خـۆم دەکـرد کـە ئـەو بەهرەیـەم تیادایـە، لـە هەمانکاتدا تەمەنیشم گونجاوە.

ئێوارەیـەکیان مـن و "نادیـا" و "ئاشـیا"ی خوشـکم پێکـەوە لـە یانـەوە بـۆ ماڵــەوە گەڕاینەوە، کاتژمێر نۆی ئێوارە بوو، بە پێپلیکانەکانی دوکاندا سەرکەوتین بۆ ســەرەوە، چووینە هۆڵی دانیشتن، کە بینیمان چـەند پیـاوی "ئـارەب" لەگـەڵ دایکـم و بـاوکم لـە هۆڵەکەدا دانیشتون، یەکێك لەو پیاوانە "جەواد"ی کۆنە هاوڕێی باوکم بوو.

ئەوە بۆ یەکـەمجار بـوو کـە بـاوکم بەرامبـەرمان ڕووگـرژ و تـووڕە نـەبوو، لەگـەڵ ئەوەشدا کە درەنگ بۆ ماڵەوە گەڕابووینەوە، باوکم ئێمەی بە میوانەکان ناسـاند، ئەمـە کارێکی سەر سووڕ هێنەر بوو..!؟ ئەو پیاوانە تێکڕا بە "ئارەب"ی دەپەیڤین، ئێمەشـیان بۆ ناو کۆڕی گفتوگۆکە ڕاکێشا، دانیشتنێکی ئاسایی بوو، لە ناویـاندا پیـاوێکی تێـدا بـوو بە ناوی "ئەبدولکەدا"، لەگەڵ کوڕەکەیدا کە ناوی "مهەمەد"بوو.

پرسیارم له "مهمهد" کرد، "ماوەی چەندە لە "ئنگلاند"ی..؟"

"مهمهد" وەڵامی دامەوە: "ماوەی چوار ساڵە و لە کارگەیەك کاردەکەم،" درێژەی پێداو گوتی: "پێش ئەوەی بێمە ئێرە لە "ئارەبستانی سەئودی"بووم و کارێکی باشم هەبوو، لە هەمانکاتدا دراوێکی باشم چنگ دەکەوت."

ئەز تێگەیشتم ئەو کوڕە بۆیە بۆ "ئنگلستان" هاتووە، کە خۆی فێری "ئنگلیز"ی بکات، لە هەمان کاتدا پەساپۆرتی ئێرە وەرگرێ و ببێتە هاوڵاتی "بەریتانی" و بە ئارەزووی خۆی بێت و بچێ و گەشت بکات، ئەم خواستە، ئاواتی زۆربەیان بوو، بەلای ئەم پیاوانەوە گەلێك گرنگ بوو، کە خۆیان فێری زمانی "ئنگلیز"ی بکەن، کاتێك کە بۆ "یەمەن" دەگەڕانەوە بەکاریان دەهات.

"مهمەد" "ئنگلیز"ییەکی باش دەپەیڤی، کوڕێکی کراوەش دیار بوو، "ئەبدولکەدا"، پیاوێکی کورتە بنەی بەخۆ، سمێڵێکی زل و دوو چاوی گەورە و کاکۆڵ لوول بوو، بەرامبەر بە منیش کراوە بوو.

"جەواد" وێنەی خێزانەکەی دەرهانی و پیشانی ئێمەی دا، ئێمەش زۆر بە ئاسایی و ڕێزەوە تێمان ڕوانین و سەیری وێنەکانمان کرد، هیچ شتێکی تایبەتی سەرنجی ڕانەکێشاین، "جەواد" بەرامبەر بە "نادیا" زۆر کراوە بوو. ئەم دانیشتن و گفتوگۆیە ماوەیەکی برد، پاشان پیاوەکان ڕۆیشتن، باوکم ڕوویکردە "نادیا" و پێی گوت: نادیا "جەواد" بانگهێشتی تۆی کردوە، بۆ پشووی هاوینەکەت بۆ ماوەی مانگێك بۆ "یەمەن" دەتبات، لەوێشەوە دەکاریت سەردانی "لەیلا"ی خوشکت و "ئەهمەد"ی برات بکەیت.

باوکم کەوتە پەسنکردنی وڵاتی "یەمەن" کە چەند وڵاتێکی بێ وێنە و خۆشە، لە بارەی ڕۆخانە لماویەکانی سەر دەریاوە دەدوا کە چەندە دلگیر و خۆش و جوانن و ڕازاونەتەوە بە دارخورما و ئەو ناوچانە هەمیشە خۆرەتاوە، پاشان سواربوونی پشتی هوشتر بە نێو بیاباندا. دوایی هاتە سەر پەسنکردنی خانووی خێزانەکەی کە چۆن بەسەر ئەو لوتکە چیایەوە دروستکراوەو دەڕوانێت بەسەر ئەو دەریا شین و ڕۆخە لماوی و پاك و دلگیرانەدا، باسی قەڵایەکی کرد کە چۆن لەسەر لم دروستکراوە. ئەم

پەسنکردنەی لەوە دەچوو، کە "پروپاگەندە" بۆ کێکی چوکلاتەی Bounty بکات، باوکم بە "نادیا"ی گوت:"ئەو ماوەیەی کە لە "باخی ئیرەم" دەژیت خۆت فێری سوارببوونی پشتی ئەسپی بێ زینیش بکە". بەم شێوەیە، وای لە من و "ئاشیا"ش کرد کێچ بکەوێتە کەوڵمانەوە، لەبەر ئەوە داوامان لە باوکم کرد کە ئێمەش دەچین.

ئەز دڵم بەوەوە نەبوو کە "نادیا" بە تەنیا ئەو گەشتە بکات، بیرم لەوە دەکردەوە کە "نادیا" کچێکی گەنجە و منداڵکارە، چۆن دەبێت بە تەنیا لەگەڵ پیاوێکی نەدی و نەناس بڕوات و ڕێگایەکی وا دوور و درێژ ببڕێ، تەمەنی "نادیا" هێشتا پازدە ساڵانی پڕ نەکردبۆوە، جگە لەوەش تا ئەو کاتە بەبێ من بۆ هیچ شوێنێکی تر نەچوو بوو. هەر بۆیە داخوازیم لە باوکم کرد و پێم گوت: "منیش دەمەوێ لەگەڵ نادیا بچم، ئیرەیی بە "نادیا" دەبەم کە بە تەنیا ئەو گەشتە خۆشە بکات".

باوکم گوێی بۆ وتەکانم ڕادێرا، ئەوەی درکاند کە لە پێشدا نیازی وا بووە من بنێرێت، پاشان گوتی: "با بزانین، بیری لێدەکەمەوە". وا دیار بوو دەیویست لەو بارەیەوە لەگەڵ هاوڕێکانی مشتومڕ بکات. چەند ڕۆژێکی بەسەردا تێپەڕی، ڕۆژێکیان باوکم پێی گوتم: "زانا داخوازیەکەی تۆش جێبەجێکرا، "ئەبدولکەدا" و "مهەمەد"ی کوڕی چەند هەفتەیەك پێش "جەواد" بۆ "یەمەن" دەگەڕێنەوە ئەوانیش بە دڵخۆشیەوە دەیانەوێت تۆ لە تەك خۆیاندا بۆ "یەمەن" بەرن و هەمان شتیش بۆ تۆ بکەن. پاشان لەگەڵ ئەواندا سەر لە خێزانەکەیان بدە، دوای ئەوە کە "نادیا"ش گەیشتە لاتان، پێکەوە بچن سەر لە "لەیلا و ئەهمەد" بدەن، لای ئەوان بمێننەوە و ژیان بەسەربەرن، تا ئەو کاتەی بۆ "ئنگلاند" دەگەڕێنەوە. بەم هەواڵە تەواو شاگەشکە بووم، لە دڵی خۆمدا گوتم: ئەمە دەبێتە یەکەم گەشتم کە بە فڕۆکە بفڕم. هەستم دەکرد ماوەیەك پێویستم بە پشوودان و دوورکەوتنەوە هەیە و نەختێك خۆم لەبەر خۆرەتاو هەڵخەم و پێستم کەمێك گەنمڕەنگ ببێت، پاش گەشتەکەشم بگەڕێمەوە و لە ڕشتەکەمدا دەست بە خوێندن بکەمەوە لە بارەی منداڵان پەروەردە کردنەوە.

ئەز گەرەکم بوو لەگەڵ "نادیا" هەمان ڕۆژ بە فڕۆکە هەڵفڕین، بەڵام لەوە دەترسام ئەگەر لەو ڕۆژەدا کە پیاوەکان دیاریان کردووە نەچم بەجێم دەهێڵن.

تەنانـەت بليتـى فرۆكەكەشـيان بـۆ كـڕى بـووم، ناچـار دوو هەفتـە بـەر لـەوە كـە "ناديـا" و "جـەواد"، بـە فرۆكـە بـەرەو يەمـەن هـەڵفڕن، مـن و "ئەبدولكـەدا" و "مهەمەد"ى كوڕى بەرەو "يەمەن" بە فرۆكە هەڵفڕين.

دايكم ئەو ماوەيە بێدەنگ بوو، بەڵام بەڕوويەوە ديار بوو كە بەوە دڵخۆشـە ئێمـە بۆ ماوەيەك پشوو دەدەين و گەشتێكى خۆشمان لەبەرە.

دێتەوە يادم پرسيارى ئەوەم لە دايكم كرد كە چۆن ئـەو كاتانـە بەسـەر بـەرم، لـە كاتێكدا كە نازانم بە زمانى ئارەبى لەگەڵياندا بپەيڤم...؟"

ئەوەم دەزانـى كـە "لـەيلا و ئەهمـەد" نـاتوانن بـە "ئنگليـز"ى بپـەيڤن. ئاگادارى ئەوە بووم كە چەند جارێك "لەيلا و ئەهمەد" كاسێتێكيان بە دەنگى خۆيان بە زمـانى "ئارەب"ى تۆمار كرد بـوو، بـۆ باوكميـان ڕەوانـە كـرد بـوو، لـە بـارەى ژيـانى خۆيانـەوە دەدوان. بـاوكم زۆر جـار ئـەو كاسـێتانەى بـۆ هـاوڕێ "ئـارەب"ەكـانى لێـدەدا و گوێيـان لێدەگـرت، تـەنيا مەبەسـتى بـاوكم خـۆ هەڵكێشـان بـوو لەبـەر چـاوى هاوڕێكـانى خـۆى دەرخست و شانازى بەوەوە دەكرد كە گوايا منداڵەكانى بەختەوەرانە دەژين.

هەرگيز من ئەو پرسيارەم بە مێشكدا نەدەهات، لە دايكم بپرسم كە ڕاى بەرامبەر بـەو كاسـێتانە و منداڵـەكانى چيـە، بـەڵام وا دەزانم كـە دايكـم گـەلێك خـەمى بـەوە دەخوارد و بـەو ئـازارەوە دەتلايـەوە، لـە كـاتێكدا كـە هيـچ شـتێكى لـە دەسـت نـەدەهات بيكات، وابزانم هەر لەبەر ئەوەش بوو لەو بارەيـەوە هەميشـە بێدەنـگ بـوو، بـەڵام مـن ئەو كاتە بڕوام بە وتەكانى باوكم دەكـرد كـە دەيگـوت: "لـەيلا و ئەهمـەد" تەندروسـت باشن و ژيانێكى بەختەوەرانە دەژين".

دەربـارەى "ناديـا" كـە بتوانـێ بـۆ "يەمـەن" ئـەو گەشـتە بكـات، دەبوايـە مۆڵـەتى پۆليسى بۆ وەرگيرێت، ئەو چاودێريەى كە لـە سـەرى دانـرا بـوو هـەڵگيرێت، دايكـم لـەو بـاوەڕەدا بـوو پـاش ئـەو كێشـەيە كـە لـە دادگـادا بـۆ "ناديـا" دروسـت ببـوو. "ناديـا" پێويستى بەوە هەيە ماوەيەك دوور كەوێتەوە و پشوويەك بدات.

دايكـم بـە تەلـەفۆن داواى مۆڵـەتى بـۆ كـرد، بـەڵام هـەر هـەمان ڕۆژ وەڵامەكـەى وەرنەگرتـەوە، پێيـان ڕاگـەياندبوو، كـە پێويسـتە ماوەيـەك چـاوەڕێ بكـات تـا وەڵامـى

دەدەنەوە. پاش ئەوەش لێپرسراوی چاودێری سەردانێكی ماڵەوەمانی كرد، بە دایكمی ڕاگەیاند كە "نادیا" مۆڵەتی ئەوەی هەیە و دەتوانێ وڵات جێبهێڵێ، دەتوانێ لەگەڵ "جەواد"دا ئەو گەشتە بكات. دوای ئەوە كە "نادیا" ئەو مۆڵەتەی درایە، من و "نادیا" هەر لە بیركردنەوەی گەشتەكەماندا بووین، كەمێكیش ترسی گەشتەكە دایگرتبووین.

# بەشی سێیەم
# گەشت

لە کۆتایی مانگی یونی ساڵی 1980دا بوو، هەفتەیەك پێش ئەوەی تەمەنم چوار مانگ و شازدە ساڵان پڕ بکاتەوە. پێش ئەوەی کە "نادیا"یش تەمەنی پازدە ساڵان پڕ کاتەوە، من و "ئەبدولکەدا و مهەمەد" بەرەو "یەمەن" هەڵفڕین.

شەوێك پێش ئەو رۆژەی کە بۆ بەیانیەکەی بەرەو "یەمەن" هەڵفڕین،هاوڕێکانمان بە من و "نادیا"یان گوت: کە دەبێت سەردانێکی یانە بکەین، دوای نیوەڕۆژێکی درەنگ بەرەو یانە چووین، باوکم دەیزانی بەرەو ئەوێ دەچین،بەڵام دەستی نەهێنایە ڕێگامان. کاتێ کە ئێواری بۆ ماڵەوە گەڕاینەوە، باوکم هیچ گرنگی پێنەدا...! ئەم هەڵسوکەوتەی باوکم بە لامانەوە ئاسایی نەبوو.

لە یانە لەگەڵ هاوڕێکانماندا کاتێکی خۆشمان بەسەربرد و گەلێك خەنی بووین، پاش ئەوەش هاوڕێکانمان هاتن بۆ لامان و لە کۆڵان کۆبووینەوە و دەستمان بە شۆخی و چرپە چرپ و پێکەنین کرد، بەدەم پێکەنین و خۆشیەوە هەمووومان بەرەو باخچەکەی خوار ماڵی خۆمان شۆڕبووینەوە، "ئاشیا"ی خوشکیشمان لەتەکدا بوو، کاتێك کە دەرگای باخچەکەم کردەوە،میزەلانێکی زۆر هەڵواسرا بوو، هاوڕێکانمان هەموو ئەو ناوەیان رازاندبۆوە.

پرسیارم کرد:"ئەم بەزمە چیە...؟"

هاوڕێکانم تێکڕا وەڵامیان دایەوە:"ئەوە بە بۆنەی گەشتی تۆ و"نادیا"وە سازمان کردووە." ئەو ناوەیان بە شێوەیەکی جوان و دلگیر رازاندبۆوە، کردبوویان بە دیسکۆ و

شوێنی سەماکردن و خواردنەوە، ئـەو شـەوە، شـەوێك بـوو لـە هـەرە شـەوە خۆشـەکانی ژیانم، ئەو کەسانەی لەوێ بـوون، هـەموویانم دەناسـی و هیـوای گەشـتێکی خۆشـیان بـۆ دەخواستین، هەمووشیان ئیرەییان بـە مـن و"نادیـا" دەبـرد، ئـەوانیش سـەد خۆزگـەیان بەوە دەخواست کە گەشتێکی لەو بابەتەی ئێمەیان بکردایە و جیـهانی دەرەوە و وڵاتـان و ژیانی ناو بیابان ببینن.

ئەو کەسانەی لەوێ بوون، هەموویان باوکمیان دەناسی و دەیـانزانی کـە بـاوکم لـە وڵاتێکـی دووری ئەفسـوناوی و جوانـەوە هـاتووە، یـەکێك لـە هاوڕێکانمـان چـووە سـەر کورسـی‌یەك و راوەسـتا، میکرۆفۆنـی بەدەسـتەوە گـرت و دەسـتی بـە ئاخـافتن کـرد، گوتی:"هیوادارم کە کاتێکی خۆشـتان بەسـەر بردبێـت،" ئەسـرین لـە چـاوانم دەبـاری و زەنگۆڵەیان دەکرد، دەمزانی دەبێت بەیانی هاوڕێکانم جێـهێڵم لـە هـەمانکاتدا دڵخۆشـی خـۆم بـەوە دەدایـەوە کـە تـەنیا بـۆ مـاوەی شـەش هەفتـە دوور دەکەومـەوە. ئەمـە بـۆ یەکەمجار بوو، لە هاوڕێکانم دوور کەومەوە، دەنا هەمیشە هەر پێکەوە بووین، جارجـار دڵم لێیدەدا کە ئەم گەشتە، گەشتێکی بێ کۆتا یی و بێ بڕانەوەیە، ئەو شەوە تا کاژێری دوازدە بە بەزم و خۆشی و گریان و وتووێژەوە خەریك بووین.

لەو شەوە تاریك و بێدەنگـەدا لـە مـاڵی ئێمـە پیاوەکـان لـە کونـی ژوورەوە خۆیـان مەڵاس دابوو، هـەموو پێویسـتیەکی گەشـتەکەیان ئامـادە کردبـوو، ئێمـەش لـە جیـهانی خۆماندا خەریکی دانس و پێکەنین بووین.

لە کۆتاییدا ئاهەنگەکەمان جێهێشت و بەرەو ماڵەوە گەڕاینەوە، دنیـا کـش و مـات بوو، کامەران و دڵشـاد بـووم. کـاتێك "مـن و نادیـا و ئاشـیا" گەیشـتینە ماڵـەوە، دایکـم، باوکم،"ئەبدولکەدا" و "مهەمەد"ی کوڕی لە هۆڵەکە دانیشـتبوون. وەکـو ئاگـادار کـرام، کـاتژمێری سـێی سـەرلە بـەیانی پاسـێك بـە شـوێنماندا دێـت و دەمانگەیەنێتـە فڕگـەی heathrow لـە نزیکـی"لـەندەن"ەوە. لەبـەر ئـەوە دایکـم پێـی گوتـین:"بچـن لەسـەر جێگەکانتان راکشێن، بۆ ئەوەی مـاندوو بوونتـان دەرچێـت، تـا ئـەو کاتـەی کـە پاسـەکە دێت." وەڵامی دایکم دایەوە:" ئەز ماندوو نیم... خەوم تۆراوە." دایکم بێدەنگی لێکرد.

هەموو هاوڕێکانم لەسەر ئەوە ڕێککەوتبوون، کە لە نێوان کاژێری یەك و دووی شەودا بۆ بەر دەرگای ماڵەوەمان بێن، بۆ دواجار ماڵئاوایی لە یەکتری بکەین. لەبەر ئەوە من ڕێگای هاتنە ژوورەوەم پێنەدان، دەمزانی ئەگەر بێت و بێنە ژوورەوە باوکم شێتگیر دەبێت.

لە هۆڵی دانیشتن ئەو سێ پیاوە درێژەیان بە دانیشتندا و بە "ئارەب"ی لەگەڵ یەکدا دەپەیڤین. پاشان لەوە دڵنیا بووم، کۆڕیان گەرمە و بەو زووانە دەست لە گفتوگۆ هەڵناگرن، من و "نادیا" بە هەلمانزانی بەخشکەیی دەرچووینە دەرەوە، زانیمان هاوڕێکانمان هاتوون و لە دەرەوە کۆبوونەتەوە و چاوەڕێی ئێمە دەکەن. کاتێك کە چووینە دەرەوە هەموویان لە دەوری پەرژینی باخچەکە کۆببوونەوە و کۆڕیان گەرم کردبوو.

یەکێك لە هاوڕێ نزیکەکانم "سۆزان" بە گریانەوە و پێی گوتم:"نادیا تکایە ئەو گەشتە مەکە و بیدەرە دواوە...!"

منیش دڵیم دایەوە و پێم گوت:"پێویست ناکات وا خۆت خەمبار بکەیت هێندەم پێناچێت بە زووترین کات دەگەڕێمەوە، لەڕاستیشدا لە دڵەوە گەلێك بە پەرۆشتانم کە ئێوە بەجێدەهێڵم و بەرەو وڵاتێکی وا دوور دەچم."

"سۆزان" وەڵامی دامەوە گوتی:"ئۆکەی، بەڵام، پەیمان بدە نامە و هەواڵی خۆتمان بۆ ڕەوانە دەکەیت." پاش درەنگێك هەریەکەمان بەرەو ماڵ بووینەوە، من و "نادیا"ش خۆمان بە ژووردا کردەوە. "نادیا" ماندوو دیار بوو ماچێکی کردم و گوتی:"شەوباش"... بەرەو ژووری نووستن ڕۆیشت.

منیش بەر ەو هۆڵی دانیشتن چووم، تەواو لەشم داهێزرا بوو، لەگەڵ ئەو سێ پیاوە دانیشتم، ئەوان لەسەر دراو یاری کاغەزیان دەکرد. تا ئەو کاتەی پاسەکە پەیدا بوو دەستیان لە یاری هەڵنەگرت. دەنگی مەکینەی پاسەکە لەو شەوەدا تەنیا دەنگێك بوو بەر بای گوێمان کەوت، پیاوەکان بە بیستنی دەنگی پاسەکە لە شوێنی خۆیان هەستانە سەر پێ و ڕاست بوونەوە، یاری و کاغەز و دراوەکانیان جێهێشت، وا پێدەچوو پەلەیان بێت و بیانەوێت بە زووترین کات بەڕێکەوون.

پاش ئەوەی لە "یەمەن" "نادیا"م بینیەوە، بۆی گێڕامەوە،گوتی:"پاش ئەوەی کە ئێوە سواری پاسەکە بوون و ڕۆیشتن، بۆ بەیانی کە لە خەو هەستاین، کاغەز و دراوەکانمان بینی هەر لە شوێنی خۆیان مابوون. ئەو ڕۆژە باوکم بەو دراوە شیرینۆکی بۆ هەمووومان کڕی."

ئەو کاتەی کە چوومە ناو پاسەکەوە، ناوەوە زۆر سارد بوو، بەر لە ئێمە پاسەکە چەند سەرنیشینێکی تری تێدا بوو، هەر یەکەیان لە شوێنێکدا هەڵکورما بوون، ڕووناکی گڵۆپی نێو پاسەکە دەموچاوی سەرنیشینەکانی ڕوونکردبۆوە و بە ئێمەدا هەڵیان دەڕوانی، ماندوێتی لە ڕوویاندا بەدی دەکرا.

دایکم و باوکیشم سەرکەوتن، لە شووشەی پەنجەرەی پاسەکەوە بە تاریکایی دەرەوەدا دەمڕوانی، بیرم لەوە دەکردەوە."ئایا "یەمەن" چۆن بێ و لەوێ چی بکەم...؟"

پاسەکەمان ئاژووت، تا گەیشتینە فڕگەی heathrow، وردە وردە تاریکی ڕەوایەوە. فڕۆکەکەی ئێمە کاتژمێری دەی سەر لەبەیانی دەفڕێ...! بەڵام پێش فڕۆکەکەی ئێمە زۆر فڕۆکەی تر لە گۆڕەپانی فڕگەدا لە گوڕی باڵگرتندا بوون، پیاوە گەورە و ناودار و سەرمایەدارەکان لە ناو ئەو فڕۆکانەدا لە تیشکە چاوێکدا باڵیان دەگرت و لە چاو ون دەبوون.

بۆنی خواردنی خۆش دەهات برسێتی تاوی بۆ هێناین، بۆ فراڤین خواردن خۆمانکرد بە "ریستۆرانت"ی فڕگەدا، "ئەبدولکەدا" زۆر ڕێزی لێدەنام و بەرامبەرم هێژا بوو، بەو مەبەستە کە هەست بە تەنیایی نەکەم و نائارام نەبم، ئەز گەلەك بڕوام بەو ڕێزلێنانەی ئەو هەبوو، وا بیرم دەکردەوە کە پیاوانی "ئارەب" مرۆڤی ئاینین و لە کردەوەی ناپەسەند و لە کاری نابەجێ دوورن.

بلیتی سوار بوون و فڕینی هەرسێکمان لای "ئەبدولکەدا" بوو، من هەرگیز چاوم بە بلیتەکەی خۆم نەکەوت، هەر بۆیە واشم دەزانی کە بلیتەکەی من بلیتی چوون و گەڕانەوەشە، دەبوایە بلیتەکەیان نیشان بدامایە، بۆ ئەوەی بزانم کەی گەشتەکەم تەواو دەبێت و دڵنیابم لە گەڕاندنەوەم. بەڵام من نەمدەویست خۆم بەو جۆرە

بیرکردنەوانـەوە خـەریك کـەم و لـە نـــاخمدا پەشـێوی دروســتکەم. گـەلێك دڵخـۆش و کامـەران بـووم بـەوە، کـە ئـەو پیـاوە نابـەدڵی نـەکردم،ئـەو هـەموو ڕێـزەی لێدەنـام و لێدەگرتم.

ورده ورده لەبەرەوە بیرم دەکردەوە، پەستی دایگرتم، بە دایکم گوت:"باشە ئەگـەر لەوێ هەڵم نەکرد دەکارم زووتر بگەڕێمەوە... ؟" ئەو کاتەی کە ئەم پرسیارەم لە دایکم کـرد پیاوەکـان لێمانـەوە نزیـك نـەبوون. دایکـم هـێزێکی دایـە بـەرم، گوتـی:"بێگومـان دەکاری بگەڕێیتەوە."

ئەو کاتەی بۆ ناو گۆڕەپانی فڕگە چووین، بۆ ئەوەی سواری فڕۆکەکە بین، ترسێك سەرتاپای لەشی داگرتم، ئەمـە یەکـەمجارم بـوو سـواری فڕۆکـە دەبـووم، کـاتێك نـزیکی فڕۆکەکە بووینەوە، دەنگە دەنگ و ژاوەژاوی ماتۆڕی فڕۆکەکە و بای پەسیو ئەو نـاوەی تەنی بوو، فڕۆکەکە، فڕۆکەیەکی گەلەك مەزن بوو، ئاوڕێکم بۆ دواوە دایـەوەو، ویسـتم بـۆ دواجـار دایکـم ببینـم و دەسـتەکانمی بـۆ راوەشـێنم، بـەڵام هۆڵـی چـاوەڕوانی و ئـەو خەڵکانە هێندە لێمانەوە دوور بوون، پیاو نەیدەکاری دەموچاوەکان لێك جودا بکاتەوە. بـۆ کورتـە هەناسـەیەك تاسـە بردمیـەوە، لـە دڵـی خۆمـدا بـــەخۆم دەگـوت و پرسـیارم دەکرد:"چ ڕێگایەکم هەڵبژاردو بەرەو چ شوێنێك دەچم..؟ لەگـەڵ دوو پیـاوی نـەدیو و نەناسدا کە هێندە نابێت یەکترمان بینیوە و ناسیوە، هەموو شتەکان بە من نامۆن..!؟"

هەرسـێکمان سـواری فڕۆکەکـە بوویـن، شـوێنی دانیشـتنەکەم کەوتـە لای ژنێکـی "ئینگلیز"وە، ئەو ژنە بەرەو "ئەبوزەبی" هەڵدەفڕی.

کـاتێك مـن و ئـەو ژنـە دەسـتمان بـــە ئاخـافتن کـرد، هـەموو لەشـم دەلـەرزی و موچوڕك بە گیانمدا دەهات، من و ئەو ژنە بەردەوام بووین لە ئاخافتن، تا ئـەو دەمـەی فڕۆکەکە تینیدایە خۆ و گوڕی بەستەوە بۆ بالگرتن.

ئەو ژنە بۆی گێڕامەوە، کە کاری مامانی دەکات، ژنێکی هێژا بـوو، وەڵامـی هـەموو ئـەو پرسـیارانەی دەدامـەوە کـە ئاڕاسـتەیم دەکـرد، زۆر یارمـەتی ئـەوەی دام کـە ترسـم بڕەوێتەوە، "ئەبدولکەدا" لە کورسیەکەی بەری ئەو بەرم دانیشتبوو، لە ناو ئـەو وژە و گەرمەی فڕۆکەیەدا بە درێژای ئەو نۆ کاژێرە، خەوی لێکەوت.

ئەز بە هيچ كلۆجێ خەو نەچووە چاوم و نەشمدەتوانی بێ سرەوت دانیشم، هەر لە پەیڤیندا بووم، لە هەوڵی ئەوەدا بووم كات بكوژم و كاتەكە بڕوات.

فڕۆكەكەمان یەكسەر بەرەو "یەمەن"هەڵنەدەفڕی، دەبوایە لە وڵاتێكی سەر ڕێگامان بنیشتایەتەوە، دەبووایە ئەو فڕۆكەیە بگۆڕن، پاش نیوەڕۆژێكی درەنگ فڕۆكەكەمان نیشتەوە، كاتێك كە لە فڕۆكەكە دابەزین، هوروژمی گەرمی شاڵاوی بۆ هانیم، بەوە دەچوو كەوتبێتمە ناو تەنورێكی گەرمەوە، هەرگیز لەوەوبەر ئاوام بەسەر نەهاتبوو، من وای بۆ چووم ئەو گەرمایە تەوژم و گەرمی ماتۆڕی فڕۆكەكە بێت،كاتێك لە ناو ئەو گرمەو وژە وژی ماتۆڕ و گەرمیەدا لە گۆڕەپانی نیشتنەوە دەرباز بووین، هاوارم لە "ئەبدولكەدا" كرد و پرسیارم لێكرد:"ئەرێ ئەو گڕەوگەرمیە چیە...؟ ئەوە گڕوگەرمی ماتۆڕی فڕۆكەكەیە...؟"

"ئەبدولكەدا" پێدەكەنی" ئەم گەرمایە زۆر ئاساییە، ئەوە كەشی ئەم وڵاتەیە، ئێرە "ئنگلاند"ە سارد و سڕە كۆنەكەت نیە."

دەنگێك لە بڵندگۆكانەوە بەرز بوەوە، ناوی ئەو وڵاتەیان هێنا كە لێی دابەزین. بەڵام لەبەر هاژەوهوژە و ورتە ورت گوێم لێنەبوو، چ وڵاتێكە.

پرسیارم لە "ئەبدولكەدا" كرد:"ئێرە كوێیە و ئێستا ئێمە لە كوێین...؟"

وەڵامی دامەوە:"ئێرە "سوریا"یە، ئێمە ئێستا لە "سوریا" ین."

بە بیستنی ئەو وەڵامە خورپەیەك لە دڵم هەستا و ترسێك دایگرتم، بیری ئەوەم دەكردەوە كە چەند لەماڵەوە دوورم، لە ناخمدا هەستم بە نامۆیی دەكرد، تاسەو پەستیەك بۆ وچانێك دڵ و دەروونیان داگرتم، هێندەی نەمابوو خۆ وەرگێڕم و بەرەو فڕۆكەكە ڕاكەم، ڕووە و ماڵەوە بۆ sparkbook بۆ لای دایكم و "نادیا" و هاوڕێكانم بگەڕێمەوە، چاوم بە چواردەوری خۆمدا دەگێڕا،بە دوای ڕێگای دەرباز بووندا وێڵ بووم، خەڵكەكانی تر لەسەرخۆ ملیان بەرەو هۆڵی چاوەڕوانی نابوو، بەرەو ئەوێ خۆیان كێش دەكرد، خۆم بەخۆمم دەگوت: "بەبێ ئەوەی كە ئاگادار بم كارێكی نابەجێكراوە،" پاشان هەر خۆم وەڵامی خۆم دەدایەوە:"نا هیچ شتێك لەگۆڕێدا نیە،

تەنیا گەشتێکم لە پێشە." بیرم لەوە دەکردەوە کە ئێستا "نادیا"م لێ پەیدا ببێت و هێمن ببمەوە، وەکو ئەو خەڵکانە ئێمەش ڕێگا بگرینە بەر.

بە بڵند گۆکان رایانگەیاند ئەو فڕۆکەیەی کە بەرەو "یەمەن" هەڵدەفڕێت، ماوەیەك دوا دەکەوێت، من وای بۆ چووم کە پاش چەند خولەکێکی تر دەکەوێت، بەڵام کار لە خولەك و کاژێریشدا نەما، هەڵم و هاڵاوی گەرمی بە تەواوی شەکەتیان کردم، لە شوێنانی تریشەوە فڕۆکەی تر دە هاتن و دەنیشتنەوە، خەڵکی نوێ بەرەو هۆڵی چاوەڕێ کردن دەهاتن، وردە وردە ناو هۆڵەکە بە تەواوی پڕ بوو لە چاوەڕێکاران، تا وایلێهات جێگا بەرنەدەکەوت، بوو بە پاڵەپەستۆ و پاڵنان، ئەم دیاردەیە بۆ ئەوان گەلێك ئاسایی بوو، بەڵام بۆ من شتێکی نوێ بوو، بە ناچاری لە تاو ئەو هەموو هەڵم و هاڵاوە کۆکاکۆلام دەخواردەوە، لە دەموچاو و جلوبەرگی ئەو مرۆڤانەم دەڕوانی کە بە بەردەممدا تێدەپەڕین.

لەو هۆڵە گەورەی چاوەڕوانیدا تەنیا سێ کورسی درێژی بۆ دانیشتن تێدابوو. هێندە شەکەت و گەرمام بوو، لەشم هەمووی کەوتبووە سەر ئاو، ئاواتخواز بووم کە هەرگیز پێم بەم ئاگرەدا نەنایە و ئەم گەشتەم نەکردایە. خۆزگەم دەخواست ئاوێك بکەم بەگیانمدا، یان مەلەیەك بکەم، بڕیارمدا بەرەو ئاودەستی ژنان بڕۆم، نەختێك خۆم فێنك بکەمەوە... خۆم کرد بە ئاودەستی ژناندا بۆن کاسی کردم، ژووری ئاودەست لە بەر ژنان بەرنەدەکەوت، ئاودەستەکە تەنیا چاڵێك بوو لە زەویەکەدا هەڵکەنرا بوو، لە هەموو لایەکەوە پیسی و گەنگوگو بوو. ئەمە بۆ یەکەمجار بوو، شوێنێکی واپیس ببینم. هەر چۆن بە پرتاو خۆمکرد بە کونی ژوورەوەدا ئاواش بە پرتاو خۆم کوتایە دەرەوە. ئەم دیمەنەم بۆ "ئەبدولکەدا" گێڕایەوە، مەبەستم ئەوە بوو کە شوێنێکی پاکترم نیشاندا، من وا بیرم کردەوە وەك چۆن لە "ئنگلاند" شوێنی تایبەتی بۆ گەشتکاران هەیە، دەبێت لێرەش شوێنێك لەو بابەتە هەبێت...ئەو بە پێکەنینەوە گوتی:"لەسەری مەڕۆ." ناچار لەسەر کورسیەکە لێی دانیشتم، لە هەموو روویەکەوە هەستم بە دڵشکاوی دەکرد.

تـاریكی ورده ورده خەسـتر دەبـوو، ئاسمـان سـامالْ و ئەسـتێران دەیـان جریوانـد، چاوەڕێكاران هێدی هێدی دەچوونە دەرەوە، بۆ سوار بوونی ئەو فڕۆكەیەی كە چراكانی دەسوتان و بۆ فڕین ئامادە دەكرا.

لـە كۆتـاییدا نزیكـەی بیست كەسێك لـەو هۆڵـە گەورەیـەدا ماینـەوە، هـەموومان چاوەڕێی هەمان فڕۆكەمان دەكرد كە بێت و ئێمەش هەڵفڕین، كش و ماتی ئـەو نـاوەی داگرتبوو، بێزاری و چاوەڕوانی بەتەواوی تەنگی پێهەڵچنیم، شەوگار تا دەهات تاریكـتر دەبوو، ماوەی هەفت كاژێر چاوەڕێمان كرد.

فڕۆكەكە مان شەوێكی درەنگ گەیشتە فڕگە، بـە بڵندگـۆ ئاگـادار كرایـن، لـە هۆڵـی چاوەڕوانی چووینە دەرێ، بە بەجێهێشتنی ئەو شوێنە ئاهێك بە دەروونمدا گەڕا، بەڵام ترسی سواربوونی فڕۆكە پێشی پێگرتم، بەتایبـەتی ئـەم فڕۆكەیـە گـەلێك بچوكـتر بـوو لەو فڕۆكەیەی كە پێی هاتین ، لە سوار بوونی فڕۆكەی گچكە دەترسام، كاتێك كە بۆ ناو فڕۆكەكە سەركەوتین و دانیشتین، نـاو فڕۆكەكـە گـەلێك بەرتـەنگ بـوو، كـە پیـاو ئـەم فڕۆكەیەی بەراورد دەكرد لەگەڵ فڕۆكەی،"جۆن بۆین"دا، ئەم فڕۆكەیە لە فڕۆكەیەكی دڵنیـا نـەدەچوو. ئـەمجارەیان لـە تەنیشـتی پەنجـەرەوە دانیشـتم، كورسـی دانیشـتنەكەم كـەوتبووە سـەرو باڵـەكانی فڕۆكەكـەوە، لـەوێوە سـەیری دەرەوەم دەكـرد، كـاتێك كـە بەتەواوی فڕۆكەكە باڵی گرت، باڵەكانی تەكە تەكیان دەهات، لە ترساندا فـزەم لـە خـۆم بڕیبـوو، وام دەزانـی باڵـەكانی شـكاون و هـا كــە ئێسـتا بەردەبنــەوە، بەتــەواوی تــرس دایگرتم، پرسیارم لە "ئەبدولكەدا" كرد، "ئەو فڕۆكەیە بۆ ئاوا دەكات؟"

ئـەو بـۆی روونكردمـەوە، كـاتێك كـە فڕۆكـە بـاڵدەگرێت، بـەو شـێوەیە باڵـەكانی دەلـەرزن. بـاوەڕم بـە وتـەكانی كـرد، سـەرەڕای ئـەوە كـە مـاندوو بـووم، بـەڵام هـەرگیز نەمدەوێرا لە فڕۆكەیەكی ئاوادا بخەوم.

كـاتژمێری پێنجـی بەربـەیان گەیشـتینە شـاری"سـەنئا" ئـەو دەمـە كـازیوە بوو"سەنئا" گەورەترین شاری "یەمـەن"ە، دەكەوێتـە بـەرزی 2500 مـەتر لـە بارسـتایی دەریاوە،"ئارەب"ەكان جار و بـار پێـی دەبێـژن:"هـەورەبانی ئـارەب" هـەوای ئـەم شـارە، هەوایـەكی بۆخنـك و پەسـیوە، هـەر بەگەیشـتنم بـۆ ئـەوێ سـەرم دایـە ژان و هەناسـەم

سواربوو. به گەیشتنمان بۆ "سـەنئا" کۆتـایی بـەخاڵی مەبەسـتی گەشـتەکەمان نـەهات، دەبوو بەرەو باشوور بۆ شاری "تایز" بفرِینایە. لە گوندێکی دەرەوەی ئـەم شـارە مـاڵ و خێزانی "ئەبدولکەدا"ی لێدەژیان.

شاری "سەنئا" گەلێك لە شاری "دیمەشق" فێنکتر بوو راستە ئێمە کـە گەیشـتینە "سەنئا" بەری بـەیانی بـوو، بـەڵام خەڵکەکـە دەیـان گـوت:"شـاری "سـەنئا" گـەلێك لـە شاری "دیمەشق" فێنکترە."

فرِگەی شاری "تایز" دەکەوێتە دەرەوەی شار و لە بیاباندایـە، لەبـەر ئـەوە مـرۆڤ کە لە فرِگـە دێتـە دەرێ هیـچ ئاوەدانیـەك نابینـێ، پـاش ئـەوەی لـە فرِۆکەکـە دابـەزین بەرەو کۆنترۆڵی "گومرگ" چووین. ئـەو کەسـانەی کـە دەیـان بینیـم بـە سەرسـامیەوە سەرنجیان دەدام، سەیری جلوبەرگەکانیان دەکـردم، تەنوورەیـەکی درێـژم لەبـەردا بـوو، بلوزێکی قۆڵکورت و جوتێك پاپوجم لە پێدابوو. لـە نـاو فرِۆکەکەشـدا چـەند ژنێکمـان لەگەڵدا بوو، ئـەوانیش هـەموویان سـەرو پۆتـەڵاکی خۆیـان لـەژێر پەچـە و سەرپۆشـدا شاردبووەوە و جلکی درێژی ئاودامانیان لەبەر خۆیان دادووری بوو.

پرسـیارم لـە "ئەبدولکـەدا" کـرد: "ئـەو خەڵکانـە بۆچـی وا بـە سـەرنجەوە تێـم دەرِوانن... ؟" بە زەردەخەنەیەکەوە وەڵامی دامەوە، گوتی:"خـۆت سـەغڵەت مەکـە ژنـان لێرە پۆشاکی وا ناپۆشن، بەڵام ژنانی شارەکان پۆشـاکی مۆدێـل دەپۆشـن لەوانـەی بـەری تۆش مۆدرێنترن."

لـە دەرەوەی فرِگەکـەش تـا چـاو برِکـات بیابـانێکی لـاوی رۆمانسـیانە، وەك چـۆن زۆرجار پیاو لە فلیمدا دەیبینێ، لەو بیابانە پان و بەرینەدا تەنیا گوندێکی بچکۆلـە لـە چـەند خانوویـەکی لـە بـەرد دروسـتکراو دەبینـرا، لـەو گونـدە لامـاندا بـۆ مـاوەی 10 خولەکێك راوەستاین، تاکسیەك هات و خۆمان فرِێدایە ناوی، ئێمە هەرسێکمان لە دواوە دانیشتین، تاکسیەکە جێگای شەش کەسـی تێـدا دەبـۆوە، تاکسـیەکە هـاژووت، رێگایـەکی نـاخۆش و چـاڵوچۆڵ بـوو، لەبـەر مـاندوێتی و برسـێتی بـۆم نـەدەکرا سـەرنجی ئـەو دەوروبەرە بدەم، چوار کاژێری تریش رێگامان برِی، پاشان گەیشتینە شاری "تایز".

پیاوەکان لەگەڵ شۆفێرەکە بە "ئارەب"ی کەوتنە گفتوگۆ بەڵام من گوێم پێنەدان، بەلامەوە گرنگ نەبوو، هەستم دەکرد کە خەو دەبینم.

کاتێك کە گەیشتینە "تایز" بە تەواوی پەستی دایگرتم، کە چاوم بەو هەموو پیسی و گەن و گوانە دەکەوت لەسەر شەقام و ناو کۆڵانەکان و لە هەموو شوێنێك فرێدرابوون، رێگاکان لە خەڵکیدا جمەیان دەهات، خانوو و دوکانەکان ترنجابونە ناو یەکتریەوە، لە ناو کۆڵانە تەنگەبەرەکاندا بۆنی پیسی و هەوای گەرمی بۆخنك تێکەڵاو بەیەك ببوون، ئاژەڵ و مەڕوماڵات، لە پشتی پیکاپ و تراکتۆرەکاندا سوارکرابوون. لەبەر پەڕینەوەی مرۆڤەکان بەسەر رێگا گشتیەکاندا ئۆتۆمۆبیلەکان لەسەرخۆ دەڕۆیشتن. هەندێك لەم مرۆڤانە بەسواری کەرەوە بوون، یان کەرو باریان پێبوو،هەندێکیشیان رەشە وڵاخیان پێش خۆیان دابوو، لە هەموو لایەکەوە ژاوە ژاو و تەپوتۆز بوو،لە هەموو شوێنێکدا پیسی و پاشماوەی خواردن و میوەی تەپیوی کۆن فرێدرابوونە سەر رێگاکان و لە ژێر پێی خەڵکیدا پێخوسکرابوون، یان لەژێر تایەی ئۆتومۆبیلەکاندا پانکرابوونەوە.

شێوەی دروستکردنی خانووەکانیان هەمان ستیلی باوی سەردەمەکانی 1000 ساڵ لەمەوبەرە، کاتێك ئەو ئاپوورەی خەڵکی و ئەو هەموو تاکسی و ئاژەڵانەت لە دوورەوە دەبینی کە تێکڕا هەموویان لە جوڵەدا بوون، دیمەنێکی سەرسوڕهێنەریان هەبوو. هەندێك ژنم بەرچاو کەوت پۆشاکی خۆرئاواییان پۆشی بوو، دەنا سەرجەم جلکی باوی "ئارەب"یان پۆشی بوو و پەچەیان گرتبووەوە.

"ئەبدولکەدا" گوتی: "هاورێیەکم هەیە لەم شارە دەژی، ئێستا بۆ ماڵی ئەوان دەچین و شەوێ لەلای ئەوان دەمێنینەوە، "زانا" تۆش دەتوانی شەوێ بە باشی بخەوی، بەیانیەکەشی بەرەو گوندەکەی خۆمان بەڕێ دەکەوین"

منیش پێم گوت:"باشە." بە ناچاری دەبوو بۆ هەر کوێیەکیان بوێ لە تەکیاندا بڕۆم، بەمەرجێك کۆتایی بەم گەشتە بێ، بۆ ئەوەی تۆزێك خۆم بشۆم و پاکبمەوە.

ئۆتۆمۆبیلەکەمان پێچی کردەوە و خۆی بە کۆڵانێکی تەنگەبەردا کرد کە چەند دە سی مەترێك لە ئۆتۆمۆبیلەکە پانتر بوو، خۆمان بەناو ئەو خەڵك و خانووانەدا

کرد، خانووەکان زۆربەیان سێ نهۆم و چوار نهۆم بوون، لە ئەنجامدا خانووی هاوڕێکەی "ئەبدولکەدا" مان دۆزیەوە، لە بەردەمی دەروازەیەکی گەورەدا ئۆتۆمۆبیلەکەیان راوەستاند، "ئەبدولکەدا" پێی گوتم:"گەیشتین دابەزە."

دەروازەکە کرابۆوە، هەر لە تاکسیەکە دابەزین، کەوتینە ناو هالاوی گەرمیەوە، هاوڕێکەی "ئەبدولکەدا" هاتە دەرەوە، دزداشەیەکی لەبەردا بوو بەرەو رووومان هات، بە گەرمەوە سلاوی لێکردین، ئەو پیاوە لە تەمەنی "ئەبدولکەدا"دا بوو، بەلام نەیدەزانی بە "ئنگلیز"ی بپەیڤێت.

لە دەروازەکە چووینە ژوورەوە بۆ ناو هۆلێك دیوارەکانی بە چیمەنتۆ دروستکرا بوو، لەسەر زەوی هۆلەکە فەرشی گەورە و بچوکی بە نەخش چنراو راخرابوو، لە هەموو لایەکەوە بۆ دانیشتن و پالدانەوە دۆشەکەلە و سەرین دانرا بوو.ئەم جۆرە شوێنانە لەناو خەلکی "یەمەن"دا تەرازووە بۆ پێوانەی دەولەمەندی و بەراوردی چینایەتی. بەلام من لەگەل ژیان و کولتوری خۆماندا راهاتبووم، ئەم جۆرە پێوانانە لای من جێگای بایەخ نەبوو. لەناو هۆلەکەدا تەلەفزیۆنێك و پانکەیەك لەسەر مێزێك دانرا بوو، پانکەکە هەندێك فێنکایی دەگەیاندینێ، لەشم چلکن و بێهێز و ماندوو بووم، پاش ئەوەی کە بیست و چوار کاژێر بە رێگاوە بووین.

خاوەن مالەکە گەرماوی نیشان دام تا خۆم بشۆم و جلکەکانم بگۆڕم، گەرماوەکە ژوورێکی گەورە بوو، لەسەر شێوەی خۆرئاوایی دروستکرابوو، بەلام ئاودەستەکە تەنیا کونێك بوو لە زەویەکە هەلکەنرا بوو، من گوێم بەوە نەدا، ئاواتم ئەوە بوو کە خۆم بشۆم و نەختێك بێمە سەر خۆ و پاك بمەوە.

کاتێك لە خۆشتن بوومەوە، پۆشاکی خاوێنم لەبەر کرد، هەستم بە لەش سووکی دەکرد، پاشان گەڕامەوە بۆ هۆلی میوان، پیاوەکان دانیشتبوون و لە گەرمەی ئاخافتندا بوون، هەر کە چوومە ژوورەوە ئەوان هەستان و گوتیان:"دەچین بۆ دەرەوە تۆزێك خواردەمەنی دەکڕین تا بیکەین بەچێشت و بیخۆین."

ئەوان لێیاندا و رۆیشتن، منیش لەسەر دۆشەکەلەیەك دانیشتم بە تەنیا مامەوە، هەستم بەتەنیایی دەکرد، بەتایبەتی کە "ئەبدولکەدا" لەوێ نەبوو کە بمدوێنێ و

وەڵامی پرسیارەکانم بداتەوە، شتەکانم بە "ئنگلیز"ی بۆ روونکاتەوە، دەرگای هۆڵەکە کرایەوە، ژنی خاوەن ماڵ لەگەڵ دوو کیژی بچکۆلەدا هاتنە ژوورەوە، پاشان بۆم دەرکەوت کە ژنان بۆیان نیە بێنە ژووری پیاوانەوە، لە کاتێکدا کە پیاوی بیانی لێبێ، بە تایبەتی ئەو پیاوە خزم و کەسوکار نەبێ، تا ئەو کاتەی پیاوی بیانی لە ماڵیاندا بێ، ژنان دەبێ خۆیان بشارنەوە و بە ئەرکی خۆیانەوە خەریکبن، وەك پاككردنەوەی ناو ماڵ و چالێنان و چێشتلێنان...هتد. دەبێت کوڕی بچوکی خاوەن ماڵ هەستێت بە خزمەتکردنی میوانی دیوەخان.

ئەم ژنە و کچەکانی، تاکە وشەیەکی "ئنگلیز"یان نەدەزانی، لەڕاستیدا من دەمویست لەگەڵیاندا بدوێم، هەرچەندە گەلێك ماندوو و برسیش بووم، لە ناکاو دامە پڕمەی گریان، هەستم بە نامۆیی و دووری ماڵەوە دەکرد، نەمتوانی کۆنترۆڵی خۆم بکەم، فرمێسك لە چاوانم خوڕ خوڕ دەهاتنە خوارێ، دەستم بە لوشکە لوشك کرد، وام دەزانی لەم جیهانەدا بە تەنیا جێهێڵراوم. ژنەکە لێم هاتە پێشێ و ماچێکی کردم، خۆی و کچەکانی لە چواردەورم کۆزیلکەیان کرد، هەوڵیان ئەدا بمدوێنن، زۆر ڕێزیان لێنام ، وەکو یەکێك لە خۆیان تێیان دەڕوانیم. هێمام بۆ یەکێك لە کچەکان کرد، داوای کاغەز و پێنووسم لێکرد بۆم بهێنێ، کچەکە ڕۆیشت و پێنووس و کاغەزەکەی بۆ هێنام، دەستم بە نووسینی وشەی "ئنگلیز"ی کرد. نازانم بۆچی وا بەبیرمدا هات...!؟، وابزانم هۆکەی ئەوە بوو هەستم بە تەنیایی دەکرد، دەمویست بە "ئنگلیز"ی بپەیڤم.

ئەو وشانەی کە دەمنووسین، یەکێك لە کچەکان دوابەدوای من وەك خۆی هەمان وشەی دەنووسیەوە، بە بەردەوامی بەدەم وشە نووسینەوە دەگریام، هێندەم نەزانی ژنەکەش دایە پڕمەی گریان. کاتێك کە پیاوەکان گەڕانەوە، ئێمەیان بینی کە دەگرین، ویستیان بزانن بۆچی دەگرین؟

من وەڵامم نەدانەوە.

"ئەبدولکەدا" بە ئارەبی پرسیاری لە ژنە کرد، کە بۆچی دەگری؟

"ئەبدولکەدا" وەڵامی ژنەکەی بۆ کردم بە "ئنگلیز"ی گوتی:"ئەو ژنە بۆ تۆ دەگری، بەزەیی بە تۆدا دێتەوە، کە نەیتوانیوە لەگەڵتا بپەیڤێت."

پاش چەند ساڵێك دوای ئــەوە، ئـەو ژنــەم بینیــەوە، ئـەو كاتـە دەمتوانـی بـەزمانی ئارەبی بپەیڤم. بۆی گێڕامەوە كە لەسەرەتادا ئەو دەیزانی چیم بە سـەر هـاتووە و كـام رۆژی رەش چاوەڕێمە، بۆیە گریا بوو كە نەیتوانی بوو لـە تـەكمدا بپـەیڤێ و لـەو كـارە ئاگـادارم بكـات. ئـەو ژنـە چـووە دڵمـەوە و خۆشـم دەویست، كـە ئـەو دەمـە هێنـدە بــە پەرۆش و خەمخۆری من بووە بۆم نائارام بووە. بەڵام ئەو كاتە نــەیتوانیبوو یارمـەتیم بدات، لەبەر ئــەوەی درەنـگ بـووە، كـە بتوانێـت ئـەو پیلانـە پوچكاتـەوە و كـار لـە كـار ترازابوو، دەربازبوونم ئەستەم بـووە. پـاش ئـەوە كـە پیـاوان گەڕانـەوە چێشـت لێـنرا و دەستمانكرد بە نانخواردن، بەڵام من نــەمتوانی زۆر بخـۆم، لەبەرئـەوەی گـەلێك مـاندوو بووم. بۆ شەوێ كاتی خەوتن، پۆپەشمینێكیان دامێ و لەسەر یـەكێك لـە فەرشـەكان لـە ژووری میوان خۆم دا بە زەویدا و خەوتم، ئەو شەوە بە تەواوی خەوم لێكەوت.

# بەشی چوارەم
# سەرکەوتن بەرەو چیا

بۆ بەیانی کە لە خەو بێدار بوومەوە، بۆنی هێلکە و پیاز دەهات، لەسەر جێگەکەم هەستام، چووم دەموچاوم شت، پاشان فراڤینمان خوارد، ماوەیەکی کورتی پێچوو ماڵئاواییمان لە خێزانەکە کرد، دوای ئەوەی کە پشوومدا و باش لێی خەوتبووم، هەستم بە تونگ و تۆڵیەك دەکرد، هەستم کرد کە ئێستا ئامادەی دەست پێکردنی رۆژانی گەشتەکەمم، کاتی ئەوە هاتوە کە نەختێك ژیانی بێ جڵەوی بەسەربەرم.

هەر کە لە دەروازە گەورەکە بۆ ناو کۆڵانەکە هاتینە دەرەوە، هوروژمی گەرمی و بۆنی پیس شالاویان بۆ ه ێنام، بەو تینوتاو و وشکە "با"یە، یەکسەر بەری دڵم دەگیرا و ئارەزووی هیچم نەدەکرد، بەڵام تینوم بوو.

پرسیارم لە "ئەبدولکەدا" کرد:"ئایا دەتوانین بچینە بازاڕ بۆ ئەوەی هەندێك دیاری بکڕم، کاتی گەڕاندنەوەم، لەگەڵ خۆمدا بیانبەم...؟"

"ئەبدولکەدا" وەڵامی دامەوە گوتی:"کاتمان زۆرە، ئەوە با بمێنێ بۆ دوایی." درێژەی پێداو گوتی:"دەبێت ئەمرۆ بەرەو ناوچەی چیای "مۆکبان" بەڕێکەوین و لەوێ ژیان بەسەر بەرین،"ئاگاداری ئەوەشی کردم و گوتی:"رێگایەکی دوور و درێژمان لەبەرە، پیاو ماندوو دەکات".

منیش ئامادەیی خۆم وەرگرت، هەندێك میوە و خۆشاوی ناو پاکەتم بۆ رێگا کڕی و خستمە ناو جانتاکەمەوە.

"ئەبدولکەدا" پێشنیاری ئەوەی کردم، کە چەند پۆستکارتێك بنووسم و بە پۆستا ڕەوانەی ماڵەوەیان بکەم، با لە گەیشتنمان ئاگادار و دڵنیابن کە باشین. گوتی:"دەچینە پۆست، هەر لەوێوە پۆستکارتەکان بۆ ماڵەوە ڕەوانە بکە با یەکسەر بینێرن، خێراتر دەگات،" منیش لەگەڵ ئەو ڕاو پێشنیازەدا بووم.

لە ناو شار تاکسی زۆر بوون، بەڵام "ئەبدولکەدا" جێپێکی "لاند ڕۆڤێر"ی بەکرێ گرت، تەنیا شتێك کە بمانگەیەنێتە چیای "مۆکبان" جێپی "لاند ڕۆڤێر" بوو، لەم ناوچە چیاییانە ئەم جێپانە لە بری تاکسی و پاس بەکاردێنن، لەبەر سەختی و دژواری ڕێگاوبان و بەرزی و نزمی و لۆفە.

خۆرەتاوێکی بەتین و تاو بوو، پاش نانخواردنی نیوەڕۆژ، خۆمانکرد بە ناو جێپەکەدا، شۆفێرەکە شوبرای خوشکەکەی "ئەبدولکەدا" بوو، ئەو کەسانەی کە دەمان بینین، یان خزم، یان ناسیاوی "ئەبدولکەدا" بوون.

ئێمە بە تەنیا سەرنیشینی جێپەکە نەبووین، کۆی هەموو سەرنیشینی ناو جێپەکە دوازدە کەس بووین، دوو ژن لە پێشەوە، سەرتاپای لەشیان بە "ئەبا"ی ڕەش داپۆشیبوو، سەرپۆش و پەچەیان گرتبۆوە، من و "ئەبدولکەدا و مهەمەد" هەرسێکمان لە پشتەوە دانیشتین.

ماوەی کاژێرێك جێپەکە بەسەر ڕێگایەکی ئەسفلت کراودا ڕۆی، ئەو ڕێگایە "ئاڵمان"ەکان دروستیان کردبوو، بە درێژایی ئەو ڕێگایە، تەنیا دەوەنی وشك هەڵاتو بەدی دەکرا، لێخوڕینی ئۆتۆمبێل لە لایەن ئەو پۆلیس و سەربازە چەك بە شانانەوە کە بە درێژایی ڕێگاکە دەبینران سنووری بۆ دانرابوو.دەبوایە خێرایی ئۆتۆمۆبیل لە کاژێرێکدا "سی" کیلۆمەتر بێت. ئەم سەربازانە کە سەیری ناسنامە و پسوڵەکانیان دەکردین چەکەکانیان بە دەستەوە بوو. لە هەمانکاتدا خەریکی جووینی "گات" بوون. "گات" لە بری "تلیاك" بەکار دێنن، لە "یەمەن"دا ئەگەر مرۆڤێك ویستی لە لایەکەوە بچێت بۆ لایەکی تر، پێویستە لەسەری کارتی ڕێپێدان و ناسنامەی بۆ هاتوچۆ کردن لەگەڵ خۆی هەڵگرێ. تەنانەت بۆ هاوڵاتی "یەمەن"ی خۆشیان، بەو شێوەیە بوو.

سەربازەكان هیچ شتێكی تایبەتیان لە كەس نەدەخواست، ئەم رێگا كۆنترۆڵ كردنە بۆ ئەوەیە، كە سنورێك بۆ ئەو خێڵ و تیرە گوندیانە دابنێن، ماوەی ئەوەیان نەبێت ئامبازی یەكتری ببن و شەڕوشۆڕ لە نێوانیاندا بەرپابێت، ئەم تیرە و خێڵانە هەموویان سەر و كونی یەكن، بەڵام كاتی خۆی ئاژاوە و شەڕ و دوژمنایەتی لە نیۆوانیاندا سەری هەڵداوە و جاروباریش شەڕ لە نێوانیاندا گەرم دەبێت.

پاش كاژێرێك رێگا برین، جێپەكە لە رێگای ئەسفلت لایدا، كەوتینە سەر رێگایەكی بەردەڵانی رووەو چیا كشابوو، جێپەكە ئەوەندە هەڵتەك و داتەكی كرد ناوسكمان كەوتە خوارەوە، ئەو پیاوانەی لەگەڵمان سوار ببوون، ئەوانیش پێدەچوو ناسیاوی "ئەبدولكەدا" بن، بە درێژایی ئەو رێگا كەندو كۆسپاویە ئەم پیاوانە لە پەیڤیندا بوون، پیاوانی ئەم گوندانە هەموویان یەكتری دەناسن.

ئەز لە بینینی ئەو دەشت و دەر و چۆڵەوانیە تەواو بێزار بووم، كەوتمە كەڵكەڵە و بیركر دنەوە لەوە لە كاتێكدا كە بۆ "ئنگلاند" بگەڕێمەوە چ جۆرە دیاریەك بۆ دایكم و ئەوانی تر بكرم...؟ بەدەم بیركردنەوە و پرسیار لە خۆ كردنەوە هەندێك میوەم خوارد و پاكەتێك خۆشاوم خواردەوە.

ئەو شوێنانەی پیایاندا تێدەپەرین، ژیان تیایاندا ئاسایی نەبوو، ژیانی خەڵكەكان زۆر سەرەتایی بوو، لە هەندێك گوندا منداڵی پیس و چڵكنمان دەبینی، بێهیوا شوێن چەند بەرخ و مانگای ناوكەرێژ كەوتبوون، مانگاكان بەدوای شتێكدا دەگەڕان لەو زەویە وشكوبرنگەدا هەڵی كرێنن و بیخۆن، لە نێو ماڵ و بەربەرۆچكەكانیشدا مریشك و جوجك بە هەموو لایەكدا فرتە فرتیان بوو، یان چەند سەگێكی گەری مێشومەگەز لێنیشتو لە نێو كۆڵانەكاندا، لورەو كروسكەیان بوو، یان هەڵتوتا بوون، كاتێك كە جێپەكە بەناو گوندە بچكۆلەكاندا تێدەپەڕی، ژنانی سەرپۆش بەسەر بەخۆیان و گۆزە و تەنەكە ئاوەكانی سەرشانیانەوە لەسەر چەم و بیرەكان لە ئاو هێنان دەگەڕانەوە، هەروەها ئەو پیرەژن و پیرەپیاوانەمان دەبینی لەبەر دەركی خانووەكانیاندا كۆڕیان گەرم كردبوو، كاتێك كە جێپەكەی ئێمەیان دەبینی تێكرا روویان بەرەو جێپەكە وەردەچەرخاند و لە گفتوگۆ دەكەوتن، بە تایبەتی بە سەرنجەوە لە منیان دەڕوانی،

وادەزانم ئەو گوندیانە بۆیە بەو شێوەیە لە منیان دەڕوانی، لەبەر ئەوەی تا ئەو کاتەش هەمان جلوبەرگی خۆرئاواییم لەبەردا بوو و سەرپۆشم نەپێچا بوو.

لەبەر گەیشتنی هەندێك لە سەرنیشینەکان بۆ گوندەکانی خۆیان، دەبوایە ئێمەش بۆ وچانێك راوەستین و دابەزین. لەو کاتانەدا ژنانی گوند بە خۆیان و گۆزە و تەنەکە ئاوەکانی سەرشانیانەوە لە ئاو هێنان دەگەڕانەوە، کە چاویان بە ئێمە دەکەوت، رادەوەستان و لە دوورەوە سەرنجیان ئەدا، منداڵە پاپەتی و جلوبەرگ دڕاوەکان، بەشەرمەوە پەنجەکانی خۆیان دەمژی، کچە منداڵەکانیش یان دۆلکە ئاویان بەسەر شانەوە، یان گورزە چەڵتوکیان بەسەر سەرەوە بوو، کوتومت بە دایکەکانیان دەچوون، هەموویان لە دوورەوە رادەوەستان و بەشەرمەوە سەیریان دەکرد.

پیاوە گوندیەکان بە تۆپەڵ خڕببوونەوە و خەریکی جووینی "گات" تلیاکی لای خۆیان بوون، کە چاویان بە "ئەبدولکەدا" دەکەوت، خۆیان وەردەچەرخاند و بە گەرمەوە سڵاویان لێدەکرد و شادمانی خۆیان بە هاتنەوەی نیشان دەدا، "ئەبدولکەدا" ماوەی چوار ساڵ بوو وڵاتی "یەمەن" و ئەو ناوچەیە و گوندەکەی خۆی جێهێشت بوو، من زوو هەستم کرد کە ئەمانە لە بارەی منەوە دەدوێن، بەڵام من هیچ شتێك لەوان تێنەدەگەیشتم، تەنیا ئەوە نەبێت کە ئەو کاتەی سەیریان دەکردم، منیش بە زەردەخەنە و سەر راوەشاندن بەرسڤم دەدانەوە.

کاتێك کە خانووە سەربان پانەکانم دەبینی، بەوە دەچوو هەزاران ساڵ لەمەوبەر دروستکرابن، پەنجەرە بچکۆلەکانی خانووەکان هەموو بە رووی ئەو گڕوگەرمای خۆرەتاوی پاش نیوەڕۆژەدا داخرابوون. مۆدێلی ئەم خانووانە هەمان تەرزی هەزار ساڵ لەمەوبەر بوون، سانا نەبوو کۆن و نوێ جودا بکەیتەوە،

هەر گوندێك لەم گوندانە کەوتبووە چەپەکێکەوە و لێك ترازا بوون، کاتی وا هەبوو نیو کاژێر بە جێپەکە دەڕۆیشتین، لە چۆڵەوانی بەولاوە تاکە خانوویەك، مرۆڤێك، ئاوەدانیەکمان نەدەبینی.

لە گوندێك لاماندا و راوەستاین بۆ ئەوەی خواردنەوەیەك بخۆینەوە، ئەو گوندە ناوی "ریسیان" بوو، رووبارێکی بچکۆلە بە ناویدا تێدەپەڕی، بە پانایی و درێژی چەند

کیلۆمەترێك كێڵگەكان شین دەچوونەوە، کەوتینە مێرگستانێکەوە، لە هــەموو لایەکـەوە شینایی و درەختی میوەی بەردار دەبینرا، وچـانێکم داو سـەرنجی ئـەو گوندیانـەم دەدا، کـە چـۆن کـار لـە کێڵگـەکانیاندا دەکـەن، چـۆن زەوی دەکێڵـن و بـــە پەرۆشـــەوە لەگـەڵ کارەکـەیان خـەریکن، هـەموو جـۆرە سـەوزەیەکیان هـەبوو، وەکـو پەتاتـە، گـێزەر، پیــاز، کــاهوو، کەلــەرم، نــەئنا، تــەرخون، هــەندێك ســەوزەی تریــش کــە پێشــتر بـــەرچاوم نەکەوتبوون و نەمدەزانی چین. هەندێك رەزی ترێی شەرابیشیان هەبوو لەگەڵ ئــەوەی کە لە "یەمەن"دا شەراب یاساخە، بەڵام کشمیش بە برەوە و بەکاری دەهێنن، هــەروەها زۆر درەختی میوەی ترم بەرچاو کەوت، وەك دار چواله، دار گوێز، دار قەیسی، هــەڵوژە، لیمۆ، هەروەها دارمیوەیەکی تـر کـە نـەمدەزانی چیـە؟ پـاش ئـەوەی کـە پرسـیارم کـرد وتیان:"دار هەنارە."

کاتێك بە جێپەکە بە هەندێك گونــدی تـردا تێپـەڕ دەبوویـن، جاروبـار تاکـە تاکـە مرۆڤما ن بەرچاو دەکەوت، گوندیەکان زۆربەیان لەسەر کشــتوکاڵ و کێڵگـەکانیان بـوون، بەو گرەوگەرمایە خــەریکی کـارکردن بـوون. ئـەم ناوچەیـە تـا بڵێـی دلگـیر و رەنگـین و خەمرەوێن بوون، بـە ئاواتــەوە بـووم لـە شـوێنێك لـە شـوێنەکانی ئـەم ناوچەیـە بژیـم، مرۆڤەکانی ئەم ناوچەیە تێکـرا "ئـارەب"ی رەشپێسـتن، ویسـتم لـە بارەیانــەوە پرسـیار بکەم، بەڵام بۆم نەلوا لەبەر ئەوە بێدەنگیم لێکرد.

"ئەبدولکەدا" پێی گوتم: "پێویستە سواری جێپەکە بینەوە و بەڕێ کەوین"

خۆمـــان خزانـــە نـــاوەوە. جێپەکـــە دەســـتی بـــە وژە وژی رۆیشـــتن کـــردەوە، "ئەبدولکەدا" رووی تێکردم بە "ئینگلیز"ی گوتی: "دەزانم دڵت بە گوندەکـەی ئێمـەش دەکرێتەوە"

منیش بە زەردەخەنەوە وەڵامم دایەوە گوتم:"ئاوا...؟"

ئـەویش بـە زەردەخەنــەوە بەرسـڤی دامــەوە گوتـی: "درەختــی سـێو و پرتــەقاڵی نایابمان هەیە،" بە رێزەوە پێم گوت: "مژدەیەکی خۆشە."

لە پێشی جێپەکـەوە چـەند سەرنیشـینێکی نـوێ دانیشـتبوون، لـە پەنجەرەکانــەوە کەوتمە روانینی دەرودەشت، بیرم لەوە دەکردەوە ئێمەش بە رێگـاوەین بـەرەو گوندێکـی

نەشمیلەی وەك گوندی "ریسیان" هێندەی نەخایاند کەوتینەوە ناو بیابانی چۆڵ و وشکوبرنگ، وەك ئەو بیابانەی کە لە پێش گوندی "ریسیان"وە پیایاندا تێپەڕین، هەر چاوەڕێی شینایی و ئاوەدانی بووم کە جارێکی تر دەست پێبکاتەوە.

کاتێك کە جێپەکە گەیشتە بەرزایی چیا، ناوچەکەمان بە باشی لێوە دیار بوو، جێپەکە بە ئاسۆیی بەرەو ملەی چیاکە بە گرمە و فڕەفڕ و پەنتەرناش کردن، بەسەر وردە بەرد و خرکە بەردی سەر ڕێگاکەدا هەڵدەگەڕا و دەهاژووت.

پاش دوو کاژێر بەو ڕێگایەدا، لە ناوچەیەکی چۆڵەوانیدا جێپەکە راوەستا، "ئەبدولکەدا" گوتی: "زانا ئێمە لێرە دادەبەزین." مـن و"ئەبدولکەدا و مهەمەد" هەرسێکمان دابەزین، لە لاتەنیشتی ڕێگاکەوە وەستاین، پیاوانی ناو جێپەکە ماڵئاواییان لێکردین، جێپەکە لەناو خۆڵ و تەپوتۆزی ڕێگاکە لە چاومان ونبوو.سەیرێکی چواردەوروپشتی خۆم کرد، بەڵام هیچ ئاوەدانی و خانوو و مرۆڤم نەبینی، تەنیا چیایەکی کش و مات و چەند بنجە دەوەنێك نەبێت...؟!

پرسیارم لە پیاوەکان کرد،"لەکوێ دەژین...؟!"

"ئەبدولکەدا" دەستی راکێشا بۆ چیایەك کە کەوتبووە پشتمانەوە، گوتی:"ئا لەو سەرە." زەردەخەنەیەکی کرد و جانتاکەی هەڵگرتم، دەستمان بە ڕۆیشتن کرد، بە شێوەیەکی ستونی بەرەو ملەو ئاسۆ و یاڵێك سەرکەوتین،سەد ئاواتخواز بووم، ئەم گەشتەم نەکردایە و خۆم نەخستایەتە ژێر ئەم بارەوە.

پاپوجەکانم بە پێمەوە نەدەوەستان، لەسەر ئەودارو بەردە لۆترم دەدا، تینوێتی و گەرما زۆریان بۆ هێنا بووم، سەرتاپای لەشم ئارەق و تەپوتۆز بوو. کاتێك کە گەیشتینە سەر ترۆپکی چیاکە، گوندی "هۆکایل"مان لێدەرکەوت، هەناسەیەکی ئۆخەیم هەڵکێشا. ئەو گوندە هەرگیز وێنەی گوندی "ریسیان" دڵگیر و جوان نەبوو، لەبەر خۆمەوە گوتم:"ئۆخەی کە گەیشتینە جێ، ئەمشەو دەکارم خۆم بشۆم".

پرسیارم کرد:"کام خانووە ماڵی ئێوەیە...؟" بە ئاواتەوە بووم نزیکترین خانووبێت. ئەو وەڵامی دامەوە گوتی:"ئا لەو سەرەوەیە،" دەستێکی بۆ دەرەوەی گوندەکە راکێشا، خانوویەکی تەنیایە،دەکەوێتە سەر بەرزترین چیای ئەم

دەوروبەرە."خانووەکە بە لوتکەیەکی بەرزەوە بوو، لە شینایی ئاسماندا مەلەی دەکرد، باڵندەی بەرزەفڕیش نەیدەگەیشتێ، بۆ ئەوەی بگەینە ئەوێندەرێ، بەرەو ترۆپکی چیاکە بە ڕێگایەکدا سەرکەوین، کە بە پێپلیکەی لە بەرد تاشراو دروستکرا بوو، کە بیرم لە ژیانی ناو ئەو خانووە کردەوە، خورپەیەك لە دڵمەوە هات و ترس دایگرتم. خانووەکە کەوتبووە شوێنێکی دوورە دەست و دابڕاو و چۆڵەوە، لەسەر ترۆپکی چیایەکی وشك و برنگ و جیهانێکی بێ ژیان.

خانوویەکی گەورەمان لێدەرکەوت، وا پێدەچوو خانوویەکی خۆش و دلگیر نەبێت، پاشان بەخۆم گوت: "گرنگ نیە بۆ چەند شەوێکە، پاش ئەوە دەڕۆم و سەردانی "لەیلا"ی خوشکم و "ئەهمەد"ی برام دەکەم، ئەم خانووە دابڕاوە بەشێکە لەو شتانەی کە لە گەشتەکەمدا دەیانبینم." بە تامەزرۆوە دەمویست بزانم چۆن ئەو مرۆڤانە دەکارن لەم جۆرە شوێنانەدا ژیان بەسەر بەرن.

یەکەم خانوو کە گەیشتینێ خانووی براکەی "ئەبدولکەدا" بوو، کە ناوی"ئەبدولنور" بوو. خانوویەکی بچکۆلەی یەك نهۆمی، تەنیا دەرگایەك و دوو پەنجەرەی تێدا بوو. هەرچەند بیرم دەکردەوە لەوە نەدەگەیشتم کە ئەو مرۆڤانە چۆن دەکارن بەو شێوەیە بژین...!؟ خانووەکەی "ئەبدولکەدا" کەوتبوە سەرو خانووەکەی "ئەبدولنور"ی برایەوە، بە تەواوی لەسەر ملەی چیاکە بوو. ئەگەر یەکێك لە سەربانی ماڵی "ئەبدولنور" وە بوەستایە لەو ژێرەوە هاواری بۆ سەرەوە بکردایە، بە سانایی دەنگیان دەگەیشتە ماڵی "ئەبدولکەدا"یان ئەگەر داخوازی شتێك بکرایە یان بە پێچەوانەوە، یان کارەساتێك، ڕووداوێك لە ناو "دێ" ڕووی بدایە، یان یەکێك بهاتایەتە نێو "گوند" بۆ سەردان، هەر هەواڵ و دەنگ و باسێکی تر ببوایە لە پێشدا دەگەیشتە ماڵی "ئەبدولنور" پاشان لە سەربانەوە ئەوانیش ئاگاداری ماڵی "ئەبدولکەدا"یان دەکرد.

"ئەبدولکەدا" بە تووڕەییەوە پێش خۆی دام،"دەی وەرە سەرکەوە." ڕووە و ملەویاڵ تێی خوڕیم، هاوارم لێهەستا. پێم گوت:"ناتوانم لە توانامدا نیە بەم ملەو

یاڵەدا سەرکەوم." بە تووڕەییەوە وەڵامی دامەوە: "با دەتوانی...دەی سەرکەوە." پاشان خۆی پێشکەوت و ڕێگاکەی نیشان دەدام.

زۆر بەئاگاو لەسەرخۆ رووە و ملە و یاڵەکە ملم دەنا، جێگا پێی ئەو مەڕوماڵاتانەم هەڵدەگرت کە بزنە ڕێیان دروستکرد بوو. هەوڵمدا زۆر ئاگاداری خۆبم و سەیری ئەو بەردە خلیسکانە نەکەم، ئاگاداربم کە چۆن پاکانم لە زەویەکە داکوتم و بڕۆم، بەڵام هەستم دەکرد بەردەکان لە ژێر پامدا دەخزێن، پاپوجەکانم بە پامەوە خلیسك ببوون و بەند نەدەبوون.لە ئاکامدا کەوتم و لەگەڵ خڕکەبەردا منیش سەرەولێژ گلۆر بوومەوە و توێخی سەر ئەژنۆکانم دامالدران، هاوارم لێهەستا،"ئەبدولکەدا" گەیشتە سەرم و پەلی گرتم و هەڵی ساندمەوە، جارێکی تر دەستمان بە ڕۆیشتن کردەوە، تا گەیشتینە بەردەمی ماڵەوە"سی"خولەکمان پێچوو، سەرتاپا لەشم لە ئاو و ئارەق هەڵکێشابوو، ئەژنۆکانم خوێناوی بوون، کزە و ئازاریان لێدەهات،ماسولکەکان و دەمارەکانم، سەرجەم بروسکەیان دەدا، بەڵام پیاوەکان راهاتبوون، بەلایانەوە ئاسایی بوو.

ئەو خانووە بەو کەشکەلانەوە، لە دوورگەیەکی بچوکی ناوەڕاستی زەریا دەچوو، دیمەنێکی درامیی هەبوو، دەیروانی بەسەر هەموو ناوچەکەدا، لەو دەمی ئێوارێیەدا شەماڵێکی فێنك و سازگاری هەبوو، بە ئاستەم تاریکایی باڵی بەسەر گوند و ئەم دوورگەیەدا کێشابوو. خۆر کەوتبووە پشتی چیاکانەوە، مەڕوماڵات کرابوونە پەچە و گەوڕەکانەوە.

کاتێك گەیشتینە جێ، خێزانەکانیان بەرەو پیرمان هاتنە دەرەوە و پێشوازیان لێکردین، ژنەکەی "ئەبدولکەدا" ناوی"وەردە" بوو، ژنەکەی "مهەمەد" ناوی"بەکالە" بوو، دوو منداڵەکەی "مهەمەد""شیفا و تەمەنا" کە تەمەنیان هەشت ساڵ و پێنج ساڵ بوو، پیرەژنێك و پیرەمێردێکی کوێر، ئەم ژن و پیاوە پیرە، دایك و باوکی "ئەبدولکەدا"بوون. "ئەبدولکەدا"منی بە هەموویان ناساند، منیش بە زەردەخەنە و سەر راوەشان وەڵامم دەدانەوە، کاتێك کە "ئەبدولکەدا" منی بەوان دەناساند، بە ئاواتەوە بووم بمزانیایە و تێبگەیشتمایە کە چیان دەگوت. هەموویان زەردەخەنە لە

لێویـان دەبــاری، دەم بــە پێکــەنین بــوون، وا هەســتم دەکــرد کــە میوانێکــی زۆر خۆشەویستبم، ژنـەکان جلــی "ئــارەب"ی باویــان لەبــەردا بــوو، هــەروەها کیــژە بچکۆلـەکانیش کراسی درێژیـان لەبـەردا و دەرپێی درێژیـان لـەژێرەوە لـە پێـدا بـوو، هەموویان سۆولەیان لە پادا بوو، تەنیا پیاوە پیرەکە نەبێت جووتێك جاش کەوشی بـن لاستیکی لە پێدا بوو بە بزماری کەوش بزمـارڕێژ کرابـوو، ژنـەکان و کیـژە بچکۆلـەکان سـەرجەم سەرپۆشـیان لەسـەریان ئـالآند بـوو، کیـژان دەبێـت پـاککیژەیی خۆیـان نیشـان بـدەن و بپـارێزن، بەتایبـەتی کـە نزیکی ئـەوە بوونـەوە بـە شـوو بدرێـن و پیاویـان بـۆ دەستنیشان بکەن. لێرە ژنان دەکارن لە ماڵەکەی خۆیاندا پەرچـەم و بسکیان بکـەن بـە پرچ و بە ناو شانیاندا بـەری بدەنەوە، بەڵام کە لە ڕێگاوبان تووشی پیاوی بیـانی هـاتن، دەبێت بسکیان لە ژێر سـەرپۆش و دەموچاویـان لـە ژێـر پەچـەدا بشـارنەوە بـۆ ئـەوەی پیاوان نەیانبینن.

کـاتێك خۆمـان بـەناو خانووەکـەدا کـرد، وا هەســتم کــرد کــە دەچینــە نــاو ئەشکەوتەوە، کە سەرم کرد بەژووردا زانیم لـە ژێرخانەکـەیاندا مـاڵات هەیـە، یەکسـەر بۆنی ریخ و شیاکە هات بەسەر و پۆتەڵاکمدا، ماڵاتەکان لە پشتیرەکەدا گرمە و تەپەیان دەهـات، نـاو خانووەکـە هێنـدە تـاریك بـوو، وچـانێکی ویسـت تـاوەکو بـەری چـاوم بـە تاریکاییەکە راهات، هەندێك جوجك و مریشـك لـە نێوانـی پێوپلمـاندا جـرت و فـرت و راکە راکیان بوو.

بـە پێپلیکـەی لـە بـەرد دروسـتکراو بـەرەو نـهۆمی سـەرەوە بـۆ نـاو باڵەخانەیـەك سەرکەوتین. دیواری ژوورەکان لە بەرد دروسـتکرابوون، زەویەکـەش بـەردەرێژ کرابـوو، دیوارەکـان بـە قـوڕ سـواخدرابوون، هـەموو نـاو ماڵەکـە بۆنـی گـەوڕی لێدەهـات، کـە بـە پێپلیکانـەکاندا سـەردەکەوتی بــۆ ســەرەوە دەهاتیتــە نێــو هەیوانێکــەوە لــێرە چــەند دۆشەکەڵەیەك داخرابوو، لە سوچێکی هەیوانەکـە چـەند دەسـتە نوێنێـك هـەڵچنرابوو، دەرگـای ژوورەکـانی تـر هـەموویان کەوتبوونـە سـەر ئـەم هەیوانــە، دەرگــای ژوورەکــان هێنـدە بچـوك و نـزم بـوون، دەبوایـە مـرۆ لـە کـاتی چوونـە ژوورەوە و هاتنــە دەرەوەدا خۆی لاشان و بچەمێنێتەوە، دەرگای ئەم ژوورانـە سـەرجەم کێلونـدار بـوون. هـەر ئـەو

رۆژە کە گەیشتمە ئەوێ، "وەردە" ژووری نووستنەکەی خۆی بۆ چۆڵکردم، من ئاوا بیرم دەکردەوە کە ئەم خێزانانە زۆر ڕێزم لێدەگرن و میوانداریەکی باشم دەکەن.

لەسەر زەوی ناو ژوورەکە فەرشێکی ڕەنگ کەتانی ڕاخرابوو، هیچ کام لە ژوورەکانی تر وەکو ئەم ژوورە نەبوون، ئەم ژوورە پێنج پەنجەرەی تیادا بوو، لە دیوارێکیاندا دوو پەنجەرە بە تەنیشتیەکەوە، سیانەکەی تریان لە دیوارێکی تردا بوون، پەنجەرەکان لە دوولاوە دەیانڕوانی بەسەر چیاکاندا، ئەم پەنجەرانە لە دیوی دەرەوە بە تەلی هێڵەك گیرابوون، لەبەر ئەوەی کە پەنجەرەکان کرابوونەوە شەماڵێکی فێنك دەهاتە ژوورەوە. لە ژوورەکەدا چرایەکی نەوت هەڵواسرا بوو، پاش خۆرئاوا بوون چراکەیان هەڵکرد، بۆنی دووکەڵی نەوت و پڵێتەی چراکە دەهات، هەروەها ئەو TV ڕەش و سپیەیان لە ژوورەکە دانا، کە بە پاتری کاری دەکرد، کاتێك کە لە شاری "تایز" بووین"ئەبدولکەدا" بۆ منی کڕی بوو، بۆ ئەوەی لە ماڵی ئەوان سەغڵەت نەبم. ئەم TV یە، تەنیا کەناڵی "ئارەب"ی وەردەگرت، بەڵام من نە ئارەزووم هەبوو سەیری بکەم، نە لە "ئارەب"یش تێدەگەیشتم، نە ئەو پرۆگرامانەشم بەلاوە شتێك بوون، پاشان بۆ ئەوە نەهات بووم لە کونی ژوورەوە بخزێم، بەڵکو دەمویست بچمە دەرەوە بۆ بەر ڕووناکی و خۆرەتاو و شنەی شەماڵی سازگار هەڵمژم.

مۆبێلەی ناو ژوورەکە تەنیا چرپایەکی لە ئاسن دروستکراو و سەرینێك و دۆشەکێکی گەورەی ئەستوور جاجمێکی لەسەر ڕاخرابوو، لە بەشی لای سەرووی ژوورەکە سەکۆیەکی درێژی بە قوڕ دروستکراو بە دیواری ژوورەکەوە نووسابوو، ئەگەر لەسەر چرپاکە ڕانەکشامایە، زۆربەی جار لەسەر ئەو سەکۆیەی ژوورەوە دادەنیشتم، سەکۆیەکی تریش لەو با بەتە لە بەردەمی دەرگای دەرەوەی خانووەکە دروستکرابوو، کە زۆربەی جار دایك و باوکی "ئەبدولکەدا" دۆشەکەڵەیان لەسەر دادەخست و بە ڕۆژ لە ژێر ئەو هەتاوە گەرمەدا دادەنیشتن، منیش جارو بار لەوێندەرێ دادەنیشتم.

لەناو ئەم گوندانەدا خەڵکی زۆر ڕێز لە مرۆڤە پیرەکان دەگرن، لە ڕوانگەی ئەو خەڵکانەوە ئەم مرۆڤە پیر و پەککەوتوانە دەبێت خزمەت بکرێن، لەبەر ئەوەی کاتی

خۆی هەمیشە کاریان کردووە، بۆیە دەبێـت لـە کـاتی پـیری و پەککەوتـەییدا پاداشـتیان بدرێتەوە و رێزیان لێبگیرێت، ئەرك ناخرێتە ئەستۆی ئەم مرۆڤە پیرانەوە.

هـەر لـە هـەمان خـانوودا ژوورێـك بـۆ ئــەم پــیرەژن و پــیرەمێردە دروســتکرابوو، ژوورێکیش بۆ "مهەمـەد" و خێزانەکـەی، هـەموویان بـە شـەو لەسـەر زەوی دەخـەوتن، هـەروەها ژوورێکـی درێژکۆلـەی بەرتەسـك بـۆ "ئەبدولکـەدا و وەردە"ی ژنـی، هــەر لــە بەشی ژووروەی هەیوانەکەوە چەند پێپلیکەیەك کە لە بەرد دروستکرابوو بۆ ســەربانی خانووەکە دەچوو، لەوێوە دەچوویتە ناو حەوشەیەکەوە، کە سەرتەنورێکی تێدا بوو کە زۆرجــار کەلانــە و chapatis کــە خواردنێکــی ســەرەکیانە هــەروەها نانیشــیان تێــدا دروستدەکرد، بە تەنیشتی ئـەم سـەر تـەنورەوە ژوورێکـی بچکۆلانـە تـەباخێکی بچوکـی تیابوو بە نەوت کـاری دەکـرد بـۆ چێشـت لێنـان و ئاوگـەرمکردن بـەکاریان دەهێنـا. بـە تەنیشـتی ئـەم ژووری چێشـت لێنانەشـەوە گـەرماوێك بـوو، یەکـەمجار کـە پرسـیارم لـە "ئەبدولکەدا" کرد ئاودەستەکەیان کەوتۆتە کوێوە ئەو لەگەڵمدا هات بۆ ئەم سەربانە و دەرگایەکی زۆر بچوکی نیشاندام . کاتێك کە ویستم بچمە ژوورەوە خۆم چەماندەوە، کـە چوومە ژوورەوە ناو ئاودەستەکە تاریك و نوتـەك بـوو، ئاودەسـتەکە چاڵێکی خـڕ بـوو، هەر لە زەویەکە هەڵکەنرا بوو، لەم کونی ئاودەستەوە رووناکیەکی کەم لە دیوی دەرەوە دەهاتە ژوورەوە. لەبەر ئەوەی بنمیچی ژووری ئاودەستەکە نزم بوو، مرۆڤ نەیدەتوانی بـە پێـوە راوەسـتێ دەبوایـە خـۆی گرمۆڵـە و بچەمانایەتـەوە. نــاو ژووری ئاودەســتەکە هێنـدە بەرتەسـك بـوو لـەکاتی وەرچـەرخاندا لەشـی مــرۆڤ بــەر هــەر چواردیوارەکـە دەکەوت، پاش ئەوە هەرکاتێك بچوومایــە بـۆ سـەرئاو، لایتێکـی دەسـتیم لەگـەڵ خۆمـدا دەبرد بۆ ئەوەی بەر چاوم رووناك بکەمـەوە. لـە نـاو ژووری ئـاو دەسـتەکەدا هەمیشـە جامولکەیەکی لێبوو، بۆ تاراتگرتن پڕمان لە ئاو دەکرد، کونی ئاوەڕۆی ئەو ئاودەسـتەی کە زووتر باسم کرد، بە جۆگەلەیەکی درێژ کۆلەی سەر دانــەخراودا یەکسـەر لـە پشـتی دیواری ئاودەستەکەوە دەچووە سەر دەو ەنە وشکەکان لە دەرەوە، لەو چیا بەرزەدا لەبەر ئەوخۆرەتاوە ئەو پاشەرۆیانە وشکدەبوونەوە.

هەر کاتێك کە پێویست بوایە بۆ سەرئاو بچم، پێشان دەچوومە سەربان بە چواردەوری خۆما هەڵۆێستەیەکم دەکرد، شەرمم دەکرد نەبا خەڵکی لەو دەوروبەرە دیاربن، پاش ئەوە کە دڵنیا دەبووم کەس دیار نیە، خۆم دەکرد بە ژووردا. ناو ژووری گەرماوەکە جوڕنەیەکی هەمیشە پڕ لە ئاوی لێبوو، ژنەکان بە بەردەوامی پڕیان لە ئاو دەکرد پیاو دەیکاری بە ئاسانی بە ئاوی ناو ئەو جوڕنەیە خۆی پاکبکاتەوە و تاراتیش بگرێت، ئەو کاتانەی کە دەمویست دەموچاوم بشۆم جامولکەیەکم لە ئاوی ئەو جوڕنەیە دەردەهێناو لەگەڵ ئەو سابونە بچکۆلەیەی کە لە "ئنگلاند"ەوە لەگەڵ خۆم هێنابووم، دەموچاوم پێدەشت، لێرە ئاوی گەرم بۆ خۆشتن پێویستنیە، گڕەوگەرمی هێندە بەتین و تاوە، مرۆڤ تەنیا پێویستی بە ئاوی سارده بۆ خۆشتن و خۆ فێنك کردنەوە.

ئەو ماڵە کۆمەڵێك تەنکی پڕ لە ئاویان هەبوو، یەکەم شەو پرسیاری ئەوەم کرد،"ئایا ئاوی ئەو تەنکیانە لە کوێوە دێن...؟" لەبەر ئەوە ئەو پرسیارەم کرد لە "ئنگلاند"یش بە هەمان شێوە تەنکی بەکاردێنن. بەڵام ڕۆژگار بۆی دەرخستم کە ژنان بە چ کلۆج و ئازارێك بە تەنەکە ئەو ئاوە بەسەر سەرو بەشان دێنن و ئەو تەنکیانە پڕ لە ئاو دەکەن، بۆ ئەوەی لە کاتی بێ ئاویدا پەکیان نەکەوێت. شەوی یەکەم کە گەیشتمە ناو گوند، برسیم نەبوو، بە هەموو شتێك نامۆ بووم، هەستم بە شەرم دەکرد، لەگەڵ ئەوەشدا گەلێك ماندوو بووم، دەمویست هەناسە و پشوویەك بدەم، پرۆگرامێك بۆ ئەو ڕۆژانە دانێم کە لە "یەمەن" دەبم چی بکەم و چۆنیان بەسەر بەرم، لەسەر زەوی ژوورەکە دانیشتم و دەرگای ژوورەکەم کرابۆوە، خێزانەکان سەرجەم لە هەیوانەکەدا لەسەر دۆشەکەڵە بە چواردەوری کاسەیەکی خەراتی شکاوی پڕ لە شیرو"chapatis" دا کۆزیلکەیان کرد و دانیشتن، هەریەکە کاسەیەکی بچکۆلەی لەو تریتە پڕکردبوو، بەدەم پێکەنینەوە خەریکی تێك هەڵشێلان و خواردنی بوون.

من هەرگیز بە بیرمدا نەدەهات ئاوا بەو شێوە ئەفسوناویە دابنیشم و نان بخۆم، کاتێك کە گوێم لە وتووێژی نێوانیان بوو، لە تەنیا وشەیەکیش نەدەگەیشتم کە چیان دەگوت و لە مەڕ چی دەدوان. بۆنەی هاتنی من و گەڕانەوەی پیاوەکانەوە شووشەیەك

خۆشاوی "vimto" یان کرِیبوو، ئەو خۆشاوە تامی خۆشـاوی گێـلاس دەدات، ئـەم خۆشـاوە تەنیا لە بۆنەکاندا، یان بە بۆنەی رۆژی ئاهەنگەوە دەخورێتەوە.

کاتێك هەموو خێزانەکە لە نانخواردن بوونــەوە، هـەموویان بـەرەو ژوورەکـەی لای من جمان و هاتنە ژوورەوە، هەریەکـە لـە لایەکـەوە لێیدانیشـت و دەسـتیان بـە وتوویـژ کرد، رێز و میوانداریان پێوە دیار بوو، گەلێك بەو رێزگرتنە بەختەوەر بـووم، لـە دڵی خۆمدا دەمگوت: "کاتێك بۆ "ئنگلاند" دەگەرِێمەوە رێزلێنـان و سـادەیی ئـەم مـرۆڤ و خێزانانـە بـۆ هاورِێکـانم و کـەس و دۆسـتانم دەگێرِمــەوە." پـاش وچـانێك دانیشـتن، هەریەکەیان بەرەو ژوورەکانی خۆیان رۆیشتن بخەون. منیش بە بێدەنگی خۆم گەیاندە گەرماوەکە، بۆ ئەوەی ئەو پیسی و خۆڵ و ئارەقەی رێگا لە خۆم داماڵم و خـۆم خـاوێن بکەمەوە. کاتێك لە خۆشتن بوومەوە، بۆ ژوورەکەی لای خۆم گەرِامەوە، لەسەر چرپاکە یەك تەختە خۆمدا بەسـەر جێگاکـەدا، هەرچـەندە جێگـای نووسـتنەکەم نـاخۆش بـوو، لەگـەڵ ئەوەشـدا باشـیش پـاك نەببوومـەوە، بـەڵام لـە هـەموو روویەکـەوە هەسـتم بـە ئارامی و لـەش سـووکی دەکـرد. لـە ناکـاو هەسـتم بـە برسـێتی کـرد، برسـێتی تـاوی بـۆ هێنام، بەڵام پتر لـەوەی کـە دەبوایـە دان بـەخۆمدا بگـرم هیـچ چـارێکی دیکـەم نـەبوو. لەبەر خۆمەوە دەمگوت:"ئەمە شتێکی ساتیە، چەند رۆژێك لەم ماڵە لای ئـەم خێزانـە دەمێنمەوە". بەدەم ئەم بیرکردنانەوە خەوم لێکەوت.

بــەیانی لــە جوکــەجوکی جوجــك و مریشــك و خوێندنـــی کەڵەشــێر، کــە لــە ژێرخانەکەی ژێرەوە دەژیان، لە خـەوبێدار بوومـەوە، ژنـانی خانـەخوێش بـە خۆیـان و تەنەکە ئاوەکانی سەرشانیانەوە لـە ئاوهێنـان گەرِانـەوە و خـەریکی کـارکردن بـوون، لـە پەنجەرەی ژوورەکەمەوە چیاکان دیاربوون، لە شینایی ئاسمان و گزنگی خۆردا مەلـەیان دەکرد، دیمەنێکی دراماتیك بوو.

بۆ فراڤین خواردن جارێکی تر Chapatis و کەلانەیان ئامادە کرد بـۆوە لەگـەڵ رۆن و هێلکەدا سوورکرایەوە، چایەکی خەستو خۆڵی پرِ لە شەکریشـیان دەمکـرد و کردیانـە نــاو تــەرمۆزەوە، بــۆ ئــەوەی هــەر کــاتێك ویســتیان بیخۆنــەوە. شووشــەیەك شــیری

بچکۆلەشـیان بـە تایبـەتی بـۆ مـن کڕیبـوو، دەیـانزانی کـە ئێمـە لـە "ئنگلانـد" چـا بـە شیرەوە دەخۆینەوە.

بۆ ماوەی دوو ڕۆژ وەك میوانێك لە خۆم دەڕوانی، هەستم بە ئازارەکان نـەدەکرد، پتر چاوەڕێی ئەوە بووم کە لە بارەی ئەو ولاتەوە بزانم و بیرم لای گەشـتەکەم بـوو، بـە تایبەتی سەردانی "لـەیلا"ی خوشـکم و "ئەهمـەد"ی بـرام بکـەم، بـە بینینیـان شـادبم، ئەگەر چی ئەوە بۆ یەکەمجارە کە دەیانبینم، لەگەڵ ئەوەدا کـە دەمزانـی ئـەوان نـازانن بە "ئنگلیز"ی بپەیڤن، ئەو ئاستەنگە بۆ من گرنـگ نـەبوو. هـەر چۆنێـك بێـت ئـەوان خوشك و برام بوون، خوێنمان یەکە و بە یەکترەوە گرێدراوین، بـە تایبـەتی لـەم دووره ولاتیەدا. ئەو چەند ڕۆژە چاوەڕێی "ئەبدولکەدا" بـووم، کـە پێـم بڵێـت، چـی بکـەین و چی نەکەین. لەڕاستیدا بە تەواوی ئارامم لە بەر بڕا بوو، بەلاّم دەرم نەدەبڕی.

بە ڕۆژ لەگەڵ ئەو دوو زارۆکە کچەدا لـە دەرەوە بـە یاریکردنـەوە خـەریك بـووم، ئەوانیش هەوڵیان دەدا کە هەندێك وشەی هاسانی "ئـارەب"یـم فێرکـەن، ئـەو زارۆکانـە دەروونپاك و بێئاگاو دڵشاد بوون، من و ئەو دوو کیژۆڵەیە هەر زوو پێکەوە گونجـاوین. لەو ماوەی دوو ڕۆژەدا کە لەوێندەرێ بووم، "ئەبدولکەدا" لە تەکمدا هەڵسوکەوتی زۆر ئاسایی بوو، ئەوەی باش دەزانی کە بـۆ مـن ئاسـایی نیـە بـە دەسـت نـان بخـۆم و لەسـەر دۆشەکەڵە لەسەر زەوی دانیشم، لەبەر ئەوە خواردنی بۆ چێدەکـردم، لـە سـەر سـینی و لەگەڵ دەفر و چەتاڵ و چەقۆدا بۆی دەهێنامە ژوورەوە.

پاش نیـوەڕۆژی ڕۆژی دووەم "ئەبدولکـەدا" لەگـەڵ خۆیـدا بـۆ نـاو گونـد بردمـی. دوکانەکانی ناو گوندەکە لە شـێوەی کۆلێتـدا دروسـتکرابوون، ئـەم دوکانانـە لـە هـەموو جۆرە میوە و جگەرەو خواردنی قوتو و هەندێك کەلوپەلی پێویستی تریشیان هەبوو.

ژنان لەم گوندەدا بە ئاسایی بۆیان نیە جگەرە بکێشن، بەلاّم من پێـش ئـەوەی کـە بۆ ئەم ولاتە بێم جگەرەکێش بووم. لەبەر ئەوە "ئەبدولکەدا" دەیزانـی بـۆ مـن هاسـان نیە کە واز لە جگەرەکێشان بـهێنم، هـەر بۆیـە چـەند پاکـەت جگـەرەی بـۆ کڕیـم. لـەو ماوەیەدا وەکو کیژێکی "ئنگلیز" هەڵسوکەوتی لەگـەڵ دەکـردم. وەك هاوشـانێکی خـۆی

تێیدەڕوانیم، نەك وەك ژن و کیژی وڵاتەکەی خۆی. تا ئەو دەمەش بیرم بۆ کارێکی ناپەسەند و پیلانێکی ناهەموار نەدەچوو.

خەڵکانی ئەم گوندە سەرجەم "ئەبدولکەدا"یان دەناسی، زۆربەیان خزم و کەسوکاری بوون، لە هەموو شوێنێك بە پیریەوە دەهاتن و لە تەکیا ڕادەوەستان و گفتوگۆیان دەکرد، زۆربەی ئەم پیاوانە پیاوی بەساڵاچوو بوون، زۆربەیان کاتی خۆی بۆ کارکردن بەرەو "ئنگلاند" چوو بوون. هەر بۆیەش پرسیاریان لێدەکردم: "ئایا وڵاتی یەمەن خۆشە... ؟" ئەم پیاوانە کەسیان لەوە نەدوان کە بۆ چ مەبەستێك منیان بۆ ئێرە هێناوە. پ اشان پێمزانی کە ئەم مرۆڤانە هەموویان ئەوەیان زانی بوو کە بۆ چ مەبەستێك بۆ ئەم وڵاتە هێنراوم.

پاش ئەوەی کە من و "ئەبدولکەدا" لە ناو گوند بەرەوماڵەوە گەڕاینەوە، لەسەر سەکۆکەی بەردەمی دەرگای ماڵەوە، لەگەڵ پیرێژن و پیرەمێردەکە و دوو کچە بچکۆلەکە دانیشتین و دەستمان بە ئاخافتن کرد، هەر پاش وچانێك، هێندەم زانی "ئەبدولا"ی برای "مهەمەد"یش لەو ڕێگایەوە دەرکەوت کە ئێمە لە یەکەم ڕۆژ پیایدا هاتین، من زووتر ئەوەم دەزانی کە "ئەبدولکەدا" جگە لە "مهەمەد" کوڕێکی تریشی هەیە بە ناوی "ئەبدولا" ئەو کوڕە بەسەردان چووە بۆ شارێکی تر کە ناوی "کامپایس"ە دوو کاژێر لەم گوندەی لای خۆیانەوە دوورە، "ئەبدولکەدا" چێشتخانەیەکی لەو شارۆچکەیە کڕی بوو، کە دەکەوتە سەر ڕێگای شاری "سەنئا"ی پایتەختەوە. "ئەبدولا" لەبری باوکی چوو بوو بۆ چاکردن و پاککردنەوەی و ڕێکخستنی "ریستۆ رانت"ەکە، پێش ئەوەی کە بیکەنەوە و دەست بەکار بکەن.

لە "ئنگلاند" پێش ئەوەی کە بەرەو "یەمەن" بەڕێبکەوین، وێنەی ئەو کوڕەم بینی بوو، بەڵام هیچ مەبەستێکم لە سەیرکردن و بینینی وێنەی ئەو کوڕەدا نەبوو، ئەوەشم دەزانی کە ئەو کوڕە تەمەنی چواردە ساڵە، بەڵام ڕەنگ و ڕووی بە کوڕێکی دە ساڵان دەچوو، کوڕێکی ڕەنگ زەردی لاواز، نەخۆشی بە ڕوویەوە دیار بوو. بە دەرکەوتنی "ئەبدولا" هەموو کەس و کارەکانی بەرەو ڕووی چوون، دایکی جانتاکەی لێوەرگرت. "وەردە"ی دایکی، ئەم کوڕەی لە کوڕەکەی تری خۆشتر دەویست، دواتر بۆم

دەرکەوت، کە "ئەبدولا" هەر لەو ڕۆژەوە لە دایک بووە، "تەن" نادروست و نەخۆش بووە، لەبەر ئەوە دایکی زۆر بە تەنگیەوە دەهات و مشووری دەخوارد، کاتێك کە "ئەبدولا" گەیشتە لامان "ئەبدولکەدا" پێیناساندم، گوتی: "ئەمە "ئەبدولا"ی کوڕمە"، منیش دەستم ڕاکێشا بۆ دەستی و دەست لە ناو دەستێکی ئاساییم لەگەڵدا کرد، هەروەك چۆن لە ماوەی دوو ڕۆژی ڕابردوودا لەگەڵ مرۆڤەکانی تردا کردبووم..
پاش ئەوەی کە دەستە بچوکەکانی لە دەستم جودا بووەوە، جارێکی تر لەسەر سەکۆکە لێی دانیشتمەوە، لەگەڵ "ئەبدولکەدا" و ئەوانی تردا دەستم بە ئاخافتن کردەوە، پاش وچانێك زۆربەی خێزانەکە چوونە ژوورەوە و ئێمەیان جێهێشت، دوای کەمە دانیشتنێك، خۆر کەوتە پشتی چیاکانەوەو دنیا بوولێڵە، کزە بایەکی سارد دەهات، ئێمەش چووینە ژوورەوە. من و "ئەبدولکەدا" و "ئەبدولا" چووینە ژوورەکەی من لەسەر سەکۆ گڵینەکەی ژوورەوە لێی دانیشتین، "ئەبدولکەدا" لە نێوانی من و "ئەبدولا" دانیشت، "ئەبدولا" بە بێدەنگی و شەرمەوە سەری بەسەر زەویەکەدا شۆڕکردەوە، منیش هەر لە هەمان شوێن دانیشتم کە لە یەکەم ڕۆژی هاتنمەوە بۆ ئێرە ئەو شوێنەم هەڵبژارد بوو کە دەیڕوانی بە ڕووکاری دەرەوە و چیاکاندا، لە هەمان کاتدا فێنکترین جێگای ناو ژوورەکەش بوو، هەمیشە سروەیەکی فێنکایی بەسەرەوە بوو.

"ئەبدولکەدا" لە کاتی ئاخافتنی نێوان من و خۆیدا، زۆر لەسەرخۆ پێیی گوتم: "ئەوە مێردی تۆیە". سەیرێکی "ئەبدولکەدا"م کرد، نەمزانی پێبکەنم یان نا..؟ لە ڕاستیدا وامدەزانی شۆخی دەکات. بۆیە پرسیارم لێکرد: "چی...؟"

"ئەبدولکەدا" زریکانی بەسەرمدا و هاواری کرد: "ئەبدولا" مێردی تۆیە.

من هەوڵمدا کە بە باشی تێبگەم، وای بۆ چووم کە بە هەڵە لە وتەکانی گەیشتبم دڵم کەوتە پەلەپەل و خورپە و خێرا لێدان، هەناسەم سواربوو، دەمم گۆی نەدەکرد. ڕووم تێکرد و پێم گوت: "نە ئەوە مێردی منە و نە دەبێتە مێردیشم". لە کاتێکا کە ئەم ڕستەیەم دەربڕی، تا ئەو کاتەش هەروام دەزانی کە شۆخیم لە تەکدا دەکات، لە ڕاستیشدا نەمدەزانی کە مەبەستی چیە..!

کوڕەکەی تری لەوە دەچوو کە لە پشتی دەرگای ژوورەکـەوە خـۆی گرتبـێ و گوێـی لە وتووێژەکەمان بووبێ، لە پڕدا خۆی بە ژووردا کرد و سەیرێکی نـاو ژوورەکـەی کـرد و ڕاوەستا، منیش ڕووم تێکرد و پێم گوت: "ئـەوە بـاوکت چـی دەڵێـت...؟" "مهەمـەد" وەڵامی دامەوە گوتی: "زانا "ئەبدوڵا" مێردی تۆیە"

بـە بیسـتنی ئـەو وەڵامـە زانیـم کـە بەڕاسـتیانە..! هـەوڵمدا لـەوە بگـەم، کـە چـی ڕوویـداوە، کەوتمـە پرسـیار کـردن، "کـەی ئـەو کـوڕە مـێردی منـە..!؟... چیتـان بـە دەستەوەیە و دەتانەوێت چی بکەن...؟"

ئەوان بەم جۆرە وەڵامیان دامەوە و ڕوونیان کردەوە، "باوکت شـووکردنی تـۆی لـە "ئنگلاند" بڕاندۆتەوە. بە هـەمان شـێوە "نادیـا"ش شـوویکردووە بـە کـوڕی "جـەواد" ئـەوە راسـتیەکانە". "ئەبدولکـەدا" گوتـی: "ئێسـتا تێگەیشـتی کـە "ئـــەبدوڵا" مـێردی تۆیە..؟" بە ناچاری و سەرسوڕماوی لە بەردەمی پەنجەرەکەدا وشك بـووم، هـەر سـەری بێزاری و خۆ بە دەستەوە نەدان و سەرکێشیم بادەدا.

پێم دەگوتن: "چۆن شتی ئاوا دەبێت...!؟".

بە بێبڕاندنەوە لە مێشکمدا ئەم پرسیار و ئەم پیلانەم لێك دەدایەوە.

"ئەبدولکەدا" و دوو کوڕەکەی لە نێو خۆیاندا بە "ئارەب"ی دەستیان بە ئاخافتن کرد، هەروەکو من لەو ژوورەدا بوونیشـم نـەبێت، پـاش وچـانێك هەرسـێکیان بـە تـەنیا بـ ەجێیان هێشتم پێدەچوو کاتی نانخواردن بێت. پاش ئەوەی کە بە تەنیا مامەوە، دامە پڕمـەی گریـان، هیـوادار بـووم یـەکێك دەسـتبداتە پـەلم و ڕزگـارم بکـات و بـۆ ماڵـەوە بگەڕێمەوەو جارێکی تر بە دایکم شادبمەوە، ئەو ساتە هیچ کەسـێکم شـك نـەدەبرد کـە هانای بۆ بەرم، ناو ژوورەکە تەواو تاریکی کـرد، بەسەرسـامی و دڵتەنگیـەوە وەك شـێت بە ژوورەکەدا دەخولامەوە.

ماوەیـەکی بـرد، هێنـدەم زانـی لەبـەردەمی دەرگـای ژوورەکـە "ئـەبدوڵا" لەگـەڵ باوکیدا لە پڕ پەیدا بوونەوە، ئەوە تێگەیشتم کە شـەوە و "ئـەبدوڵا" دەیـەوێت لەگـەڵ مندا بخەوێت. ڕووم کردە "ئەبدولکەدا" و پێم گوت: "ناخوازم ئـەو کـوڕە لـەم ژوورەی لای من بخەوێت، دەمەوێت بە تەنیا بم".

"ئەبدولکەدا" وەڵامــی دامــەوە، "ئەمــە مــێردی تۆیــە، بێنــەو بــەرەی پێنــاوێ، پێویســتە لەگــەڵیدا پاڵکــەویت". پــاڵێکی بــە کوڕەکەیــەوە نــا بــۆ نــاو ژوورەکــە و هەردووکمانی لە ژو ورەکەدا پێکەوە جێهێشت، دەرگای ژوورەکەی دابەیەکدا و لـە دیـوی دەرەوە دەرگاکەی لـە سەرکڵۆم کردین.

بەر چاوم هێندە ڕەش ببوو "ئەبدوڵا"م نەدەبینی ئەویش بێدەنگ بوو هیچی نــە دەگوت، لـە ژوورەکـەدا هـەر هـاتوچۆی بـوو، نـەیدەزانی کـە چـی بکـات، ئــەویش هــەر هێندەی من ئاگادا ر بوو، وەك من تێدا مابوو. بە ناچاری چووە سـەر جێگاکـە و لەسـەر چرپاکـە پـەلی خـۆی لێراکێشــا، منیــش لەســەر ســەکۆکە لــە تەنیشــتی پەنجەرەکــەوە بەتانیەکم دا بەخۆمدا و راکشام، بڕیارمدا لەگەڵی نەخەوم و خۆم نەدەم بــە دەســتەوە، ئـەو شـەوە تــا ڕۆژ بــووەوە خــەو نــەچووە چــاوم، نــەمدەتوانی واز لــە بیرکردنــەوەو ئەندێشەی ئەو کارەساتە بهێنم کە بەسەرمدا هێنراوە، هەر تەپا و تلـم دەدا دەمویست لەوە تێبگەم، دەبێت ژیانم بەرەو کوێ بڕوات..؟، چارەنووسم بەرەو چ هەڵدێرێك ڕاپێچ دەکرێت...؟

تا بەیانی گوێم لە دەنگی گورگ و کەمتیار بوو لە ناو چیاکـان دەیـانلوراند، گوێـم لە دەنگ و زرمە و جوڵە جوڵی مەڕو ماڵاتی گەوڕەکەی ژێرەوەمان بوو، تریفەی مانگــە شەو، لە پەنجەرەکەوە ناو ژوورەوەی ڕووناککردبۆوە، شەوگەرەکانم دەبینـی هەڵمـەتیان بۆ مێش و مەگەزی سەردیوار و مێشوولە باڵدارەکان دەبرد.

بۆ بەیانی کە ڕۆ ژ بووەوە "ئەبدوڵا" بەسەرهاتەکەی شـەوێی بـۆ بـاوکی گـێڕابۆوە کــە مــن لەگــەڵیدا نەخــەوتوم."ئەبدولکــەدا" بــەم بیســتنە هــار ببــوو، گرمــاندی بەســەرمدا،"بۆچــی لەگــەڵیدا نەخــەوتوی...!؟" منیــش وەڵامــم دایــەوە:"لەگــەڵیدا ناخەوم."

هـەردەم کـە باسـی ئـەو خەوتنـەیان لا دەکـردم، هێنـدەی نـەدەما لـە پێسـتی خـۆم بچمە دەرەوە، بــە درێژایـی ئـەو ڕۆژە هـەر دەگریـام و بـەدوای "ئەبدولکـەدا" وە بـووم. بــەدەم گریانــەوە پێــم دەگوتــن:"راســتم پێبڵێــن، نیازتــان چیــە، دەتانــەوێت چیــم لێبکەن...؟" داوام لێکـرد و گـوتم:"تکاتـان لێدەکـەم ئـازادم کـەن و وازم لێبـهێنن بـا بـۆ

وڵاتی خۆم بگەڕێمەوە." ئەو لـە وەڵامـدا پێـی گـوتم:"تـۆ جـارێ بـۆت نیـە بـۆ ئنگلانـد بگەڕێیتــەوە."منیــش لەبــەری دەپاڕامــەوە و پێــم گــوت:"ئــەی کــەنگێ دەکــارم بگەڕێمەوە...؟" ئـەو وەڵامـی نەدامـەوە. ئـەز ئـەوە تێگەیشـتم تـەنیا کـارێك کـە ئێسـتا دەبێت بیکەم و سووربم، ئەوەیە کە هەردەم سەرکێشی بکەم و خۆم نەدەم بەدەسـتەوە. بەڵکو بەوە وازم لێبهێنن، مەرەخەسم کەن و کۆڵبدەن، ئەمە تاکە رێگا و چارەسەرە بـۆ ئەوەی بۆ وڵات بگەڕێمەوە و لە دەستیان دەربازم بێت.

بەدەموچاوی "ئەبدوڵا"دا دیار بوو، کە ئەویش وەکـو مـن تـرس گیـانی داگرتـووە، ئەو کوڕەش دەبێت ئەوەی زانیبێـت کـە مـن لـە "ئنگلانـد"ەوە هـاتووم و ئێسـتا بـەزۆر دەبێت ببمە ژنی، ئەویش دیار بوو لەم کارە سەرسام و بە دڵـی نـەبوو، ئـەو کـوڕە منـی نەدەناسی و نەیدەزانی کە من چۆنم و لە "ئنگلاند" چۆن بووم، ئێستاش ئـەوەتا چـۆن جلوبـەرگێکم پۆشـیوە...! جـودام لـەو ژنانـەی دەوروپشـتی، جـودام لـەو ژنانـەی کـە لـە تەمـەنیدا بینیونـی، مـن بـۆ "ئـەبدوڵا" کیژێکـی نابـەجێ و گـلاو بـووم. بۆیـە هەسـتم دەکرد کە زۆر لێم دەترسێ و دەسڵەمێتەوە، بەڵام چەند لە من دەترسا و دەسـڵەمیەوە، دووچەندانە لە باوکی دەترسا و فریشکی لێی کەوتبوو.

کەسێك نەبوو کە ها نای بۆ بەرم و بەهانامەوە بێت، وەك ماخۆلان لەو ماڵـەدا بـە وڕوگێژی دەهاتم و دەچووم. خـۆم کـرد بـە ژوورەکـەی "مهەمـەد" دا "بەکالـە" ی ژنـی نەخۆش بوو، لە ژوورەوە لە ناو جێگادا لێیکەوتبوو، رۆژێك لـەوەو پێـش چـەند دەنکە "حەبێك"م لە ژوورەکـەی ئـەودا بینـی بـوو، نـەمدەزانی کـە بۆچـی بـەکاردێن، لـە دڵـی خۆمدا گوتم بەڵکو ئەو "حەبانە" لەوێ مابن، تاکە رێگایە بۆ ئەوەی کـە دەربـازم کـەن لەم خەوە ترسـناکە، دەسـتمدایە "حەبـەکان" و هـەڵمگرتن و گەڕامـەوە بـۆ ژوورەکـەی خۆم، چنگێك لە حەبەکانم کردە ناو دەمم، لەو کاتەدا کە خەرێك بـووم قوتیـان بـدەم، "مهەمەد" بە پرتاو گەیشتە سەرم و گرتمی، بەزۆر دەمی پێکردمەوە و گـەرووی گـرتم خەریك بوو هەناسە بڕاوم بکات، حەبەکانی بەزۆر لەدەمم فڕێدایە دەرەوە.

"مهەمەد" کوڕێکی باش بوو، پێدەچوو کە بەزەیی پیامدا بێتەوە، بۆیــە هانـام بـۆ بــرد، داوای یارمــەتیم لێکــرد، پێــم گــوت:"یارمــەتیم بــدە،" ئــەویش تــەنیا بەشــان

هەڵتـەکاندنێك وەڵامـی دامـەوە و گوتـی:"نـاتوانم هیـچ یارمەتیـەکت بـدەم، دەبێـت گوێڕایـەڵی فـەرمانی بـاوکم بم." لەگـەڵ ئەوەشـدا کـە "مهەمـەد" خـاوەن خـێزان و ماڵومنداڵ بوو، بە هەمان شـێوە لـە بـاوکی دەترسـا، پیـاوانی "ئـارەب" هەمیشـە لـەژێر فەرمان و رکێفی باوکیاندان، ئەو کارانەی کە لەلای باوکەوە پێیان دەسپێرێت، پێویستە لەسەریان کە جێبەجێی بکەن. ئەگەر چی بەدڵیشـیان نـەبێت. "ئەبدولکـەدا" پیـاوێکی زۆردار بوو. کاتێکیش کە لە رێگاوبان یان لەناو گوند پێکـەوە دەبوویـن، ئـەو کەسـانەی کـە "ئەبدولکەدا"یان دەناسی رێزیان لێدەگرت و بە بینینی بەگەرمەوە شادمانی خۆیان دەردەبـڕی. ئـەویش وەکـو پیـاوێکی دنیـا دیـدە، بـەبێ بڕاندنـەوە بـۆ ئـەو دۆسـت و ناسیاوانەی دەپەیڤی، ئەوانیش بەرێزەوە گوێیان لێڕادەگرت.

ئـەو شـتەی کـە بـەڵێنم بـەخۆمدا و کردمـە بـەردەباز، ئـەوە بـوو کـە هـەردەم سەرکێشی بکەم و هاوکاری و گوێڕایەڵیان نەکەم، تا بەتەواوی بێزار و ماندوویان دەکەم و ناچار دەبن دەست لە یەخەم هەڵگرن و رەوانەی ماڵەوەم دەکەن.

کاتێك کە تاریکی کردەوە و بوو بەشەو "ئەبدولکەدا" هاتەوە ژوورەکەی لای من و پێـی گوتم:"پێویسـتە لەسـەرت کـە خـۆت بدەیـت بەدەسـتەوە و لەگـەڵ "ئـەبدولا" بخەویت." منیش وەڵامم دایەوە:"هەرگیز ئەو کارە ناکەم و بەو کارە هەڵناستم."

"ئەبدولکـەدا" بـە توورەییـەوە گوتـی:"دەبێـت خـۆت بدەیـت بەدەسـتەوە، دەنـا وا نەکـەیت ناچـارین کـە زۆرت لێبکـەین و چوارپـەلت بـە چرپـای نوسـتنەکەوە ببەستینەوە." لەو کاتەدا "مهەمـەد"یـش خۆیکـرد بـە ژووردا، هـەمان فـەرمانی بـاوکی دووبارە کردەوە، لە هەڵسوکەوتیاندا راستی ئەو کـارەم دەبینـی، دەمزانـی کـە بـەو کـارە هەڵدەستن و جێبەجێی دەکەن، هەرگیز بۆ ئـەم پیاوانـە هاسـان نـەبوو، کـە ئـەم شـەڕە بەرامبەریان بکرێت. هەرگیز لە ژیانیـاندا نـەیان بینیـوە کـە ژن سەرکێشـی فـەرمانیان بکـات و لـە روویـاندا هەڵگەڕێنـەوە، هـەرگیز چـاوەڕێی فـەرمان شـکاندنیان لـە ژن نەکردووە، بە تایبەتی کیژێکی تەمەن منداڵی وەکو منی بەندکراوی دوورە وڵات.

ئەم پیاوانە هەمیشە دەیان گوت و دەیـان گوتـەوە، هەڕەشـەی ئـەوەیان لێدەکـردم، کە دەبێت لەگەڵ "ئەبدوڵا" بخەویت و خۆت بدەی بەدەستەوە، دەنا مـەرجی زۆرکـردن بەسەرمدا دەسەپێنن، ئەوەی کە گوتیان بە ئەنجامی دەگەیەنن.

منیش هەرچەندە سەرم هێنا و سەرم برد، هیچ چارێکی ترم نـەما، پێـش ئـەوەی کـە ئەمانـە زۆرم لێبکـەن و بمبەسـتنەوە، ئـەو رێگایـەم هـەڵبژارد کـە پێویسـت بـە بەسـتنەوەم ناکـات. "ئـەبدوڵا" هاتـە ژوورەوە و ئـەوان لێیـاندا رۆیشـتن، منیـش ناچـار خۆمدا بەدەستەوە و جوڵەم بۆ نەکرد.

"ئەبدوڵا" ئەو کارەی کرد و بە ئەنجام گەیاند، کە باوکی رایسپارد بوو.

# بەشی پێنجەم

## بەندێتی

بۆ بەیانی کە من و "ئەبدولا" لە خەو هەستاین، بەرەو ژووری گەرماوەکە چووم و لایتێکی دەستیم لەگەڵ خۆمدا برد، لە سەتڵێکدا هەندێك ئاوم بردە ژوورەوە و خۆم پێشت، کاتێك کە تەواو بووم، هاتمە دەرەوە بەرەو ژوورەوە چووم، "وەردە"ی دایکی "ئەبدولا" لە ژوورەکەی ئێمە بوو، جێگای نووستنەکەی چاك دەکردین، خەریکی چەرچەفی سەر جێگاکەمان بوو، پیایدا هەڵدەڕوانی.

بە تووڕەیی و لالوتیەوە بە هێماکردن پرسیارم لە "ئەبدولا" کرد،"دایکت خەریکی چیە و چی دەکات لەم ژوورەدا..؟" من دەمزانی کە بە چەرچەفەکەدا هەڵدەڕوانێت تا بزانێت خوێناویە... یان نا..! بۆ ئەوەی لە کچ بوونم دڵنیابێت، بزانێت کە "ئەبدولا"ی کوڕی کونی کردووم... ! ئا لەو دەمە ساتەدا ئاواتخواز بووم کە لەوەوبەر کونکراو بوومایە، بۆ ئەوەی ئارامیان لەبەر هەڵگیرایە و دەستیان لە بەرۆك و لە یەخەم ببوایەتەوە. ئەز بەهەموو هێزێکمەوە کینم لە هەموویان بوو، نەمدەزانی چ وشەیەك بەرامبەریان بەکار بهێنم، هێندە بێزار و رووگرژ بووم دژایەتی هەموویانم دەکرد، هەموویانم بە پیاو کوژ دەهاتە پێش چاو، هەرگیز چاوم "مهەمەد" و "ئەبدولکەدا"ی نەدەبینی، ئەو دووانە تەنیا کەسانێك بوون کە دەیانتوانی لەتەکمدا بە "ئنگلیز"ی بدوێن و لێم تێبگەن، بەڵام ئەمان گوێیان بە هیچ نەدەدا، هەر بیریشیان لەوە نەدەکردەوە کە ئەز دەڵێم چی و چی دەخوازم، ئەمانە دەیانویست لە کولتوری خۆم دامبڕن و بمخەنە سەر ڕێگای راستی خۆیان. بەچاوی کۆیلە کڕینەوە

تێیان دەڕوانیم، گومانی تێدا نیە ئەم جۆرە تێبینی و هەڵوێستانە لە نەزانی و نازانستیەوە سەرچاوەیان گرتووە.

کاتێك کە "وەردە" ژوورەکەی جێهێشت، دانیشتم دەستم بە بیرکردنەوە کرد. شتێکی ئەو ڕۆژە کە لە یادم بێت، ئەو دوو کچە بچوکەیە "شیفا" و "تەمەنا" کە هاتنە لام و هەوڵی ئەوەیان دەدا بمدوێنن، لەڕاستیدا دوو کیژۆڵەی نازداری نەشمیلە بوون، ئەز نەمدەویست دڵیان بشکێنم. ئەم منداڵانە بێبەری بوون لەوەی کە روویدا بوو، لەوەش نەدەگەیشتن کە من چەند خەفەتبار بووم. ئەو ڕۆژە دەمویست بە تەنیا بم. هەر لە بیرکردنەوەی ئەوەدا بووم کە ئێستا، یان ساتێکی تربێت، دایکم بەسەرهاتەکە دەزانێ و لەم ژیانە کۆیلەمەرگیە رزگارم دەکات. بە درێژایی ئەو هەشت ساڵە هەر بیرم لەوە دەکردەوە، ئەم گوندە جێهێڵم، نامەوێ هەموو ژیانم لێرەدا بەرمەسەر، ئەوە پەیمانێك بوو، کە دەبێ بیبەمە سەر.

"ئەبدولکەدا" بۆ ماوەی چەند ڕۆژێك وازی لێهێنام، بە تەنیا لە ژوورەکەی خۆمدا ڕۆژم شەو دەکردەوە. "ئەبدولکەدا" لە ماوەی ئەو چەند ڕۆژەدا خواردنی "ئنگلیز"ی بۆ لێدەنام، وەکو مریشك و پەتاتە، چەتاڵ و چەقۆشی لەگەڵ خواردنەکەدا بۆ دەهێنام، بەڵام لەگەڵ ئەمانەشدا هیچم بۆ نەدەخورا،بەری دڵم گیرا بوو، بەتایبەتی مێش و مەگەز تاموچێژ و برسێتیان لەبیر بردبوومەوە. لە وڵاتی "یەمەن"دا مێش و مەگەز بە بێبڕانەوە بە هەر چوارلادا گیزەیان دێت، بەسەر هەموو خواردنێکەوە دەنیشنەوە، بەتایبەتی ئەو خواردنانەی کە لە دەرەوە دابنرێن.

بە شەو یش مێشوولە کالانەی چاو دەردێنن. بە درێژایی ئەو چەند ساڵەی ژیانم لە "یەمەن" دا هەرگیز نەمتوانی لەگەڵ مێش و مەگەزدا خۆم رابهێنم، مرۆڤ هیچ چارێکی تری نەبوو ئەوە نەبێت کە راوە مێشوولە بکات و هەڵیان بڕێت، مرۆڤ دەبێت کارێکی وا بکات کە جێگا گازی مێشوولەکانی شەوێ بە ڕۆژ نەخورێنێ و هەڵی نەکرێنێ. لە سەرەتاوە بەوە رانەهاتبووم جێگا گازی مێشوولەکانم دەخوراند تا خوێن لە جێگاکانیان دەهات، پاشان جێگاکان دەئاوسان، بەڵام ئەوەش چارەسەر نەبوو، نە خوراندنیشیان دان بە خۆداگرتنی دەویست.

لە سەرەتای رۆژەکانی یەکەمەوە نان و خواردنی ئەو خێزانـەم نـەدەخوارد، تـەنیا خۆشاوی گێلاسم دەخواردەوە،هەر بە نیـازی ئـەوەوە بـووم کـە گۆڕانکاریـەك رووبـدات. باری دەروونیم ئاسایی نەبوو، وەك تەرمۆمەتر لە بەرز و نزمیدا بوو. هەمیشە وا بیرم دەکردەوە ئەم کارەساتەی کە بەسەرم هێنراوە، ئـاوا درێـژە ناخایـەنێ و دەبێـت یـەکێك بەمـە بزانێـت و بـە هانامـەوە بێـت و دەربـازم کـات، جـاری واش هـەبوو بـیرم لـەوە دەکردەوە کە چ رێگایەکی دوور و درێژ لە نێوانی ئەم گونـدە و "بیرمینگهام" دا هەیـە لەو بڕوایەدا نـەبووم کـە دایکـم بمدۆزێتـەوە. هـەندێك سـاتیش دڵڕەشـی بەرامبـەر بـە دایکم دایدەگرتم، دەکەوتمە گومانەوە، کاتێك باوکم ئەم پیلانەی سازداوە دایکیشم لـەم بەسەرهاتەدا بەشداربێ و ئاگادار بووبێ، ئەگەر ئەو بۆچوونە وابـێ، ئـەوا کەسـێك نیـە لەم دنیایەدا کە جێگای بڕوام بێ و بڕوای پێبکەم، تەنیا "نادیا" نەبێ.

ئەز هەمیشە بە پەرۆشی "نادیا"وە بووم، زۆرم بـیر دەکـرد، بـیرم لـە چارەنووسـی ئـەویش دەکـردەوە کـە چۆن بـە هـەمان ئـازار و دەردی منـدا تێپـەڕ دەبێـت. خۆزگــەم دەخواست لە کونێکەوە دەنگم بیگاتێ و نەهێڵم تووشی ئەم کارەساتە بێت.

کاتی خۆی لە "ئنگلاند"ەوە دەستەیەك کاغەز و زەرفم لەگەڵ خۆمـدا هێنـا بـوو، دەسـتم بـە نامـە نووسـینکرد. نامەیـەکی دوور و درێــژی چـەند روپـەلم بـۆ دایکـم و "نادیـا"نووسـی، هـەموو کارەساتەکەم بـۆ گێڕانـەوە، ئـەو کـارەی کـە "ئەبدولکـەدا" و خێزانەکـەی بەسـەریان هێنـام و پێیـان کـردم، داوام لـە دایکـم کـرد بـە هانامــەوە بـێ، "نادیا"ش ئاگادار بکاتەوە لەو پیلانــە و لەگـەڵ "جـەواد"دا نەیـەت بـۆ ئـێرە. نامەکـەم خستە ناو زەرفێکەوە. "ئەبدولکەدا"ئەو کاتەی کە بەرەو شاری "تایز" بـۆ کـاری خـۆی بەڕێکەوت نامەکەم دایــە کـە بیخاتــە پۆسـتەوە، پاشـان پێـم گـوت:"ئـەوە نامەیەکـە بـۆ دایکـم نووسـیوە، تـەنیا ئاگـادارم کردۆتـەوە کـە لـەوە دڵنیابـێ و دڵـی هیـچ نـەکات، مــن تەندروستیم باشە و گەیشتوومەتە جێگا." ئەز وا خۆم نیشاندا کە نامەکە هیچ شتێکی تێدانیە، ئەویش پێی گوتم:"باشە بۆت پۆست دەکـەم." بـەڵام لـە رەوانـەکردنی دوودڵ بووم. ئایا ئەو نامەیە پۆست دەکات یان نا...؟ بەڵام دوای ئـەوەی کـە لـە شـاری "تـایز" گەڕایەوە پێی گوتم، نامەکەی رەوانە کردووە. بەڵام کاتێك نامەکە دەگاتە "ئنگلانـد" و

دەیخەنـە سـندوقی پۆسـتیماڵـەوە، بـاوکم یەکـەم کـەس دەبـێ دەگاتـە سـەر نامەکـە و نامەکە دەخوێنێتەوە و پاشان لە دایکم و "نادیا"ی دەشارێتەوە

ماوەی هەفتەیەکی برد لەو گوند و ماڵە هیچ شتێکم نەدەکرد، لەو ماوەیەدا تەنیا کارم دانیشتن بوو، لەو ماوەیەدا جارێك لەگەڵ "ئەبدولکـەدا" دا پێکـەوە بـۆ نـاو گونـد چووین. خـەڵکی بـە سـەرنجەوە تێیـان دەڕوانیـم و سـەیری جلوبەرگـەکانی بـەریان دەکردم، بەڵام من گوێم نەدەدانێ، دەمویست ئەوە بزانـن کـە مـن یـەکێك نیـم لـەوان و مرۆڤێکی جودام و کچێکی "ئنگلیز"م.

لە خانووەکەی ئێمەوە دوو ڕێگا بۆ ناو گوند دەچوو، ڕێگـای یەکـەمیان ئـەو ڕێگـا چاڵ و چۆڵە بوو، کـە لـەلای مـاڵی "ئـەبدولنور"وە دەسـتی پێدەکـرد، بـە پێپلیکـەی لـە بەرد تاشراودا دەچووە خوارێ بۆ سەر ئەو ڕێگایەی کە یەکەمجار لـە جێپەکـە دابـەزین و بەرەو ناو گوند هاتین. ڕێگای دووەمیان کەوتبووە پشـتی خانووەکەمانـەوە، بـە چیـاو دۆڵـدا بـۆ نـاو دێ سـەرەولێژ دەبـۆوە، ئـەم ڕێگایـەیان ڕێگـای ژنـان بـوو. لـە سـەرەتادا "ئەبدولکەدا" گوێی بە من نەدەدا، لەبەرئەوەی لەگەڵ خۆیدا هاتووچۆم دەکرد، تا ئەو کاتەی منیش بووم بە یەکێك لە ژنـانی نـاو گونـد دەسـتی نەهێنایـە ڕێگـام. دوای ئـەوە منیش ناچار کرام ڕێگای پشتەوە بگرم و لە ڕێگـای ژنانـەوە هـاتووچۆ بکـەم. ئـەوان لـە سەرەتاوە ئەوەیان چاك دەزانی کە نابێ زۆرم لێبکەن و فشارم بۆ بهێنن، بەزۆر شتەکان بەسەرمـدا بسەپێنن. ئەوان لەوە دڵنیا بوون و دەیـانزانی کـە لـە ئـەنجامدا چـۆنم مـاڵی دەکەن.

کاتێك چووینە ناو گوندەکە،"ئەبدولکەدا" چەند جۆرە میوەیەکی بۆ کڕیم، بەڵام ئەو میوانە بەتام نەبوون، لەگەڵ ئەوەشدا تەسکینیم پێیان دەهات لەبەر ئەوەی کە لە "بەریتانیا"یش ئەو جۆ رە میوانە هەبوون و بۆنی ئەوێیان لێدەهات.

لە کاتی گەڕانەوەماندا لاماندایە ماڵی "ئەبدولنور"ی برای، بـەڵام ئـەو لـە ماڵـەوە نەبوو، بەدوای کاردا ڕەهەندەی وڵاتان بوو، ژنەکەی و بوکەکەی لە ماڵ بـوون، بـەرێز و ڕووخۆشـیەوە بـەرەو پیرمـان هـاتن. ژنەکـەی نـاوی "ئامینـە" و بووکەکـەیان نـاوی"خەولـە" بـوو. خانووەکـەیان یـەك نـهۆمی و زۆر لـە خانووەکـەی "ئەبدولکـەدا"

بچوکتر بوو، ژوورەکان کەوتبوونە ناو ڕاڕەوێکەوە. خـێزانێکی بچوك بـوون، تـەنیا ئـەو بووکەیان هەبوو، هەموویان پێکەوە دەژیان. ئەو دیمەنانە فێریان کردم کە چۆن پیاوان ژنەکانیان لە ناو جیهانی گوند و لە کونی ژوورەوە جێدەهێڵن، خۆشـیان وەکو پیـاو بـە هەموو جیهاندا بەدوای کاردا وێڵن. "ئامینە و خەولە" بە دڵمدا چوون، دوو ژنی سەلار و سەرنج ڕاکێشەر بوون، کاتێك کە ئەو دوو ژنەم بینی هەستم بە توانایی خۆم دەکـرد "ئامینە" داوای ئەوەی لێکر دم، کە هەوڵ بدەم زمانەکەیان فێربم. بۆ ئەوەی لە یەکتری تێبگـەین. مـاڵی "ئامینـە" بـە بـەراورد لەگـەڵ مـاڵی "وەردە" و "جـەواد" ی خــەزوری "نادیـا" دا جیاوازیـەکی زۆری هـەبوو. پـاش ئـەوەی کـە لەگــەڵ "ئامینــە" کەوتینــە ئاخافتنـەوە، ئـەو ژنـە بـۆ بەدبــەختی و چـارە ڕەشـی مـن دەسـتی بـە گریـان کـرد، "ئەبدولکەدا" هەر زوو بەو ژنەدا هەڵشاخا، بـە "ئامینـە"ی گـوت:"پێویسـتە بـەهێزبی لەبـەردەم میوانەکـەتا." ئـەز تـەنیا ئـەوە تێگەیشـتم کـە بـە "ئامینــە" دا هەڵشـاخا. "ئەبدولکەدا" خۆی ئەوەی بۆ گێڕامەوە کە ئاوای بەو ژنە گوتوە.

"ئـەبدوڵا"ی بـەناو مـێردم، هەمیشـە بێدەنـگ بـوو، نـە ئـەو منـی بـەدڵ بـوو، نـە منیش ئەو. لەگەڵ ئەمانەشدا ناچار بووین لە ژوورێکدا پێکەوە بخـەوین، هـەر چـەندە هەوڵم زۆر دەدا ئەوەی لە توانامدا هەبوو دەمکرد بۆ ئەوەی لەگەڵیدا نەخـەوم. کـاتێك کە بەیانیان لە خەو هەڵدەستاین، باوکی پرسیاری لێدەکـرد ئایـا چـۆن شـەومان دەربـاز کردووە..؟ وا دەزانم کـە "ئـەبدوڵا" لـە ترسـا ڕاسـتی بـە بـاوکی دەگـوت،"زانـا نایـەوێت لەسەر جێگا لە تەکمدا بخەوێ." لەبەر ئەوە "ئەبدولکەدا" هەمیشـە بەرامبـەرم تـووڕە بوو.

شـەوێکیان "ئـەبدوڵا" ویسـتی هـەندێك هـەڵم گلۆفـێ و گـەرمم کـات، بــەڵام مــن ئـەوەندە شـێتگیر بـووم تـا لـە هـێزمدا بـوو شــەقێکم تێهــەڵدا، لەمبــەری ژوورەکــەوە لـەترێکیدا بـۆ ئـەو بـەری ژوورەکـە. ئـەوە تێگەیشـتم کـە باشـم تێهـەڵداوە، "ئــەبدوڵا" بـەپرتاو خـۆی دەربـاز کـرد و هانـای بـۆ بـاوکی بـرد، دەسـتیکرد بـە درۆکــردن. بـاوکی خۆیکــرد بــە ژووردا و کەوتــە پیــادا هەڵشــاخانم و لۆمــە کــردنم. ئــەز بـــە هـــەموو توانایەکمەوە دژایەتی ئەوەم دەکرد کە لەگەڵ "ئەبدوڵا" بخەوم، بەڵام ئەوەشم دەزانـی

له کۆتاییدا هەر دەبێت خۆم بدەم بەدەستەوە و "ئەبدولا" لەگەڵمدا بخەوێت، یاسا دەبێژێت، پێویستە لەسەر ژن پیاوەکەی لە بارەی سێکسەوە تێربکات.

ئەوان بڕیاریان دابوو کە بە زۆر ئەم کارەم پێبکەن و خۆم بدەم بەدەستەوە، "ئەبدولکەدا" گوتی،"چیت پێدەڵێم وا بکە و گوێڕایەڵی فەرمانم بە." "ئەبدولکەدا" لەو جۆرە پیاوانە نەبوو کە مرۆڤ بتوانێ هەمیشە بەربەرەکانی بکات و لێی یاخی بێ. لەبەر ئەوە "ئەبدولا"ی کوڕیشی ئەوەی چاك دەزانی کە تا سەر ناتوانێ لە باوکی یاخی بێ. "ئەبدولکەدا" پیاوێکی ستەمکاری دەروون ڕەش و پیس بوو، بەتایبەتی کە بیویستایە کارێك بسەپێنێ و بیکا، هەموو هەوڵێکی بۆ سەپاندنی دەسەڵات و ماڵی کردنی ئەندامەکانی خێزانەکەی بوو، کەس نەیدەتوانی لە بەرامبەریدا فزەبکا، لە فەرمانی دەرچێ، یان لە ڕوویدا هەڵگەڕێتەوە. لەم کۆمەڵگایانەدا یاسای باوکسالاریە، پیاو مافداری سەرەتا و بنەتایە، پیاوان هەمیشە کارەکانیان ڕاستە و ئازاد و سەرپشکن بۆ سەپاندنی.

ئەوەی کە من هەست و دەرکم پێکرد بوو ئەوە بوو، ئەوان دەیانویست کە زوو سکم پڕبێ، بەو مەبەستەی ئەگەر بێت و منداڵێکم ببێ، ئەو کاتە دادەمرکێمەوە و واز لە سەرکێشی دەهێنم، ئیتر ناتوانم "یەمەن" جێبهێڵم بەرەو "ئنگلاند" بگەڕێمەوە. "ئەبدولکەدا" هەمیشە ئەوەی دەدا بەگوێمدا و دەیگوت:"ئەگەر بێت و سکتپڕبێ، ئەو کاتە دەتوانی بگەڕێیتەوە و منداڵەکەت لەلای دایکت ببێت." ئەوەشی دەگوت:"چەند زووتر واز لە سەرکێشی بهێنیت و خۆت بە دەستەوە بدەی، ئەوەندە زووتر ڕێگای گەڕانەوەت نزیکە." ئەوان هەموو هەوڵێکیان بۆ ئەوە بوو، کە بە زووترین کات خۆم بدەم بەدەستەوە، بۆ ئەو چارەنووسە سەرنەوی بکەم. بەڵام ئەز هەمیشە لە هەوڵی خۆ ڕزگارکردندا بووم. لە دواییدا گەیشتمە ئەو ڕاستیەی کارێکی ژیرانە نیە هەمیشە واخۆم نیشان بدەم کە دژایەتیان دەکەم. لەبەر ئەوە ئەو ڕێگایەم گرتەبەر کە دڵنیایان بکەمەوە و دڵیان بەلای خۆمدا ڕاکێشم، تا باوەڕم پێبکەن و ڕێگای ئەوەم بدەن، بە ناوی سەردانی دایکمەوە بگەڕێمەوە، بەڵام ئەو کاتانەی کە لە تەکیاندا دادەنیشتم و

دەکەوتینــە ئاخـافتن، لـە دڵـەوە کینـم لێیـان بـوو، نــەمدەتوانی دان بــەخۆمدا بگــرم و هەستی دەروونم بشارمەوە. لەڕاستیدا چاوم بەرایی نەدەهات کە بیانبینم.

شەوێك پاش هەفتەی یەکەم کە پێیان گـوتم:""ئـەبدوڵا" مـێردی تۆیـە و تـۆ لـەو مـارەکراوی..!" پیـاوێك هـات بـە میوانـی مـاڵی "ئەبدولکـەدا"، منیـش وەکــو میوانێــك تێمڕوانـــی و بـــەخێرهاتنم کـــرد، پاشـــان پیاوەکـــە چـــووە ژوورەکـــەی "وەردە" و "ئەبدولکەدا"من تاکو ئەو دەمەش هەر هەمان پۆشاك و جلوبەرگم لەبەردا بوو، کە لە "ئنگلاند"ەوە لەگەڵ خۆم هێنا بووم. پاش ئەوەی کە پیاوەکە رۆیشت، منیش چووم بۆ ژوورەکەی "بەکالە" بۆ ئەوەی نەختێك ئاخافتن لەتەك "بەکالە" بکەم. "ئەبدولکەدا" بە پرتاو خۆی بە ژووردا کـرد، بـە سـەروچاوێکی گـرژەوە، هێنـدەم زانـی بووخچەیـەك جلوبـەرگی هـەڵدا بەسـەروچاومدا، بــە تووڕەییــەوە گوتــی: "ئــەو جلانــە لەبەرکـە." پرسیارم لێکرد:"ئەوە چیە و بۆچی...؟"

"ئەبدولکەدا" ئاگر لە دەموچاوی دەباری و بــە تووڕەییــەوە گوتـی:"ئەمـە بـۆ مـن شــوورەیی و شــەرمە چــۆن دەبــێ پیــاوی بیــانی ئــاوا بـــەو شـــێوە و جلوبەرگانـــەوە بتبینێ،چۆن دەبێ لە ماڵی مندا، ژن ئەم جۆرە جلوبەرگانە بپۆشێ."

ئەو جلوبەرگانەی کە فڕێیدا بــە سـەروچاومدا، بریتـی بـوون لـە کراسـێکی زەردی ناشـرینی پڵپڵـەداری بـە پولەکـە دادووراو، کراسـە کۆنـە و جلـە کۆنـەی "وەردە"ی ژنــی بوو.

منیــش وەکــو هــەموو جــارێکم کەوتمــە بەرهەڵســتی و بــەرگری لــە خۆکـــردن، "ئەبدولکەدا" ش هەوڵی ئەوەی دەدا کە چاوترسـێنم بکـات و بڕیـاری خـۆی بسـەپێنێ، لەهەمان کاتیشدا تێم بسرەوێنێ.

بـە هـەموو هـێزێکم بوخچەکـەم تورڕدایــە ســەر زەویەکـە، نــەڕاندم بەســەریدا و گـوتم:"شـتی وا لەبـەر ناکـەم." "ئەبدولکـەدا" بـە پرتـاو هەڵمـەتی بـۆ هێنـام و تـا لـە هێزیدا بوو زللەیەکی لێدام، ئازار گەیشتە تەپڵی سەرم، هـاوارم لێهەسـتا، هێنـدە تـووڕە بووم، چاوم هیچی نەدەبینی، پەلاماری بوخچەکەمدا و کێشـام بەسـەروچاویدا، ئـەویش جـارێکی تـر هێرشـی بـۆ هێنامـەوە و دەسـتی بـەرزکردەوە کـە جـارێکی تریـش زرمـــەم

لێهەستێنێ، منیش خۆمـلادا و پـەلاماری دەسـتیمدا، بـە هـەموو هـێزێکم گـازێکم لـە دەسـتی گـرت، بـەرم نـەدا تـاکو خوێنـم لێـهێنا، ئـەویش لـەتاو دەسـتی زللەیـەکی تـری تێسرەواندمەوە، پاش ئەوە دەستیم بەردا، لەم هاتوهاوار و کێشـمە و بێنـە و بردەیـەدا، "مەهمەد" بە پرتاو خۆی بە ژووردا کـرد، گوتـی: "بابـە ئـەوە چیـە، بـۆ وادەکـەن...؟" پاشان هەردووکمانی لێك جودا کردەوە و پەلی باوکی گرت و بردیە دەرەوە.

"بەکالـە" تـرس و لـەرز دایگـرت بـوو، "وەردە" بـە پرتـاو خـۆی کـرد بـە ژووردا، بەدەم بۆڵە بۆڵەوە، شڕو شیتاڵی بوخچەکەی کۆکـردەوە، بـەڵام تێنەدەگەیشـتم کـە چـی دەڵێت، هەر هێندە تێدەگەیشتم هێمای بۆ ئەوە دەکرد، کە ئەو جلانە لەبەر بکـەم. بـە دەموچـاوی "وەردە" وە دیـار بـوو، کـە "ئەبدولکـەدا" گـڕی گرتـووە و کەلـەیی بـووە، "وەردە" لەوە سەرسام مابوو کە چۆن توانیومـە ئـەو سەرکێشـی و شـەڕە بەرامبـەر بـە "ئەبدولکەدا" بەرپا بکەم...؟!

ئەو دوو ژنە زۆر لەگەڵم خەریك بوون، کە ئەو جلانە لەبەرکەم، یـان هیـچ نـەبێ پرۆڤـەیان بکـەم، منیـش داواکـەیانم پەسـەند کـرد و بەسـەر جلـەکانی خۆمـدا لەبـەرم کـردن، کراسـەکە هێنـدە ئەسـتور و زبـر بـوو، هـەموو گیـانم کەوتـە خـورو، بـەو جلوبەرگانەوە وەك شێت خۆم دەهاتە پێش چاو. "بەکالـە" دەسـتی کـردە ملـم و دڵـی دامەوە و زەنگـۆڵ زەنگـۆڵ فرمێسـك بـە چـاویدا دەهاتنـە خـوارێ. پـاش ئـەوە جلـەکانم لەبەر خۆ داماڵی، جارێکی تر فڕێمدانەوە سەر زەوی، داوای لێبوردنم لە "بەکالە" کرد، کە چی دی ناتوانم ئەو جلانە لەبەرکەم. بڕیاری ئەوەمدا کە بە گوێیان نەکـەم و خـۆم نەدەم بەدەستەوە و ئەوەی لە توانامدا بێت دژایەتیان بکەم.

"ئەبدولکەدا" وەکو پیاوێك تیادا مابوو، نەیدەزانی چی بکات بەرامبـەر بـە ژنێـك کە ئاوا بەرەنگاری دەبێتەوە و زۆر بە ئاسانی فەرمانەکانی دەداتە دواوە...! ئـەو گـازەی کـە لـە دەسـتیم گرتبـوو لـەبیری نـەدەچۆوە، بـەڵام ئەوەشـم دەزانـی کـە نـەك هـەر خێزانەکەی خۆی چاوترسێن کردووە، بەڵکو خەڵکیش لە ترساندا ڕێزی لێدەگرن. ئـەو مـەرایی و خۆنزیککردنـەوە و ڕێـزەی کـە لەسـەرەتاوە لـە منـی دەگـرت، دەرکـەوت کـە هەمووی درۆ و ساختەکاری بوو، تەنیا ئامانجی ئـەوە بـوو، کـە مەبەسـتی گڵاوی خـۆی

بشارێتەوە، بەڵام ئێستا بەم کـردار و هەڵسوکەوتانەی پـەردەی لەسـەر نیـازی چەپـەڵی هەڵماڵی و دەروونی رەشی خۆی ئاشکرا کرد.

رۆژ دەهـات و دەڕۆیشـت، ژنـەکان لـە ماڵـەوە هـەوڵی ئـەوەیان لەگـەڵما دەدا کـە بەشـداری کـاری رۆژانـەی نـاو ماڵیـان لـە تـەکدا بکـەم، بـەڵام لـە سـەرەتاوە زۆریـان لێنەدەکردم، ئەوانیش بە کایەی خۆیان دەیانویست ئەوەم پیشان بدەن کە شتێکی باشە کە ئەو شتانە بزانم کە چین و چۆن دەکرێن، ئـازادم لـەوە کـە بمـەوێ یارمـەتیان بـدەم یان نا. ئەز لە سەرەتاوە هەسـتم بـەوە دەکـرد کـە بـەزەییان پیـامدا دێتـەوە، ئـەوانیش ئەوەی ان دەزانی کە ئەوە کاتی گەرەکە تا لەگەڵ ئەو ژیانەی ئەواندا خۆم رادێنم.

ئەم ژنانە رۆژانە هەویریان بۆ دروستکردنی کولـێرە بەتـەنوور و کەلانـە دەشـێلا، بـۆ ئـــەم نانکردنـــە تـــەنووریان بـــە چیلکـــە و چـــەواڵ دادەخســـت. رۆژێکیـــان "وەردە" پرسیاری لێکردم و گوتی:"ئایا دەتوانم یارمەتی بدەم لە کردنەوەی کولـێرە بـە تـەنوور و کەلانـە برژاندنـدا..؟" "وەردە" گوتـی:"ئەگـەر دەخوازیـت بـا فـێرت بکـەم، کـە چـۆن کەلانە و کولێرە بە تەنوورەوە دەدرێ..؟"

ئەز کە سـەیری نـاو تەنوورەکـەم کـرد کـە چۆن ئـەو پشـکۆیانە لـە نـاوەوە سـوور ببوونەتەوە، کاتێك ئەو ژنانە دەس تی رووتیان دەکرد بە ناو ئەو تەنوورەدا و کولێرەیان پێوە دەدا و لێدەکـردەوە زیـڕەم لـەو دیمەنـە کـرد بـوو. جاروبـار هـەندێك چڵۆچێویـان دەخستە ناو تەنوورەکەوە، دەبوو بە چرە دووکـەڵ، لـە پرێکدا گـڕی دەگـرت و پڕیشـك بەو ناوەدا بڵاو دەبـۆوە، برژاندنـی کەلانـە و کولێرەکـان پێنـج خولـەکێکی دەویسـت تـا بەتـەواوی سـوور هەڵدەگـەڕان. ئەوسـا ژنـەکان دەسـتیان بـە نـاو تەنوورەکـەدا دەکـرد و کولێرەکانیان دەهێنایە دەرەوە. بۆ یەکەمجار کە ویستم بەو کـارە هەسـتم، هـەر کـە لـە تەنوورەکە نزیك بوومەوە گڕو هاڵاوی گەرمی ناو تەنوور شاڵاویان بۆ هێنام، بـە پرتـاو خـۆم کشـانە دواوە، کـە چـاوم بـە دەسـت و مەچـەکی ئـەو ژنانـە دەکـەوت، کـە چـۆن هـەڵقرچابوون و تلۆقیـان کردبـوو، هێنـدەی تـر تـرس دایدەگـرتم. مـرۆڤ دەیزانـی کـە دەستەکانی ئەو ژنانە هەستیان لێبڕاوە، بەڵام دەستەکانی من بەوە رانەهاتبوون، کـاتێك کە دەستم کرد بە ناو تەنوورەکەدا هەستم دەکـرد کـە ئەشـکەنجە دەدرێـم و لـە ئـاگری

دۆژەدا دەمسوتێنن. کاتێکی زۆری ویست تا بە ناچاری و بەزۆر فێری نان پێوەدانی تەنوور کرام، بێگومان من لە کردنەوەی کەلانە و کولێرەدا وەکو ئەوان کارامە نەبووم، هەمیشە ترسی ئەوەم لەبەردا بوو، کە دەستەکانم دەسووتێن، بەڵام نەمتوانی دەستەکانم لە سوتان رزگار بکەم، لە ئەنجامدا دەستەکانم سوتان و بڵقیان کرد. ئیتر "وەردە" کەوتە زۆر لێکردنم، بە بەردەوامی کەلانەی پێدروست دەکردم. تا دەستەکانم وایان لێهات، خۆشەی ئەو گڕوتاوی ئاگری تەنوورە بوون لە کۆتاییدا وا خۆشە بووم هەستم بە سووتانی دەستەکانم نەدەکرد.

کەلانە و کولێرە، خواردنی سەرەکی ئەو خەڵکە بوو، کوتکوتیان دەکرد، لەگەڵ شیر و کەرەدا تێکەڵاویان دەکرد و بەدەست دەیانخوارد. لەسەرەتاوە من سەرکێشیم دەکرد کە ئەم جۆرە کارانە و یارمەتی کاری ناو ماڵیشیان بدەم، هەر لە بیری ئەوەدا بووم کە لەو ژیانە خۆم رزگار کەم کە بەسەرم هێنراوە.

دوو جۆر کەلانە هەبوو"شابایز"بە تەنوور دەبرژێندرا، ئەوی تریان لە ناو رۆندا سوور دەکرایەوە."ناوساجی" ئاردی ناوساجیمان بە هاڕاوی لە دوکانەکانی ناو گوند دەکڕی، هێندەمان دەکڕی کە بەشی چەند مانگێك بکات، لە گەنجینەدا هەڵمان دەگرت. بۆ کڕینی ئارد، دەبوایە ژنان لە ناو گوندەوە، ئەو فەردە ئاردانەیان بدایە بە شانیاندا و بۆ ماڵەوە بیانهێنایەتەوە.

بەڵام بۆ دروستکردنی کەلانە و کولێرە بەرۆن، ئاردی گەنمەشامیمان بەکار دەهێنا، دەبوایە ژنان خۆیان بە "دەستهاڕ" گەنمەشامیەکەیان بهاڕیایە. ئەم کارە تا بڵێی بە ئەرك و گران بوو، هەمیشە بەم کارە سەغڵەت دەبووم و لەرزم لێدەهات.

بەیانیەکیان "ئەبدولکەدا" بۆ ناو گوند دابەزی،منیش لە ژوورەکەی لای خۆم دانیشتبووم، لە ناکاو وا هات بە بیرمدا کە بۆی دەرچم و راکەم، لە پەنجەرەی ژوورەکەوە ئەو رێگایەم لێدیار بوو کە بە پشتی خانووەکەماندا رەتدەبوو دەچووە ناو باخێکەوە، زۆرجار ژنان بەم رێگایەدا دەچوون ئاویان دەهێنا. واهات بە بیرمدا کە دەتوانم بەو رێگایەدا هەڵبێم، خۆم بگەیەنمە ناو چیاکان و خۆ دەربازکەم، بەو نیازەی خۆم بگەیەنمە دەرەوەی "یەمەن". بۆ دەرباز بوونم لەو رێگایەوە هیچ جۆرە پلانێکم

نەبوو، کە چی بکەم بۆ ئەوەی خۆ لە پیاوانی ناو گوند دەربازکەم و نەمبینن و بە شوێنما رانەکەن، یان جێگا پام هەڵنەگرن و لەناو ئەو دۆڵ و چیایانەدا بمگرن، یان بەو رۆژە خۆرەتاو و گەرمایە چۆن هەڵکەم و چی بخۆم و چی بخۆمەوە و لە کوێ بخەوم، هەروەها لە پەلاماری جرووجانەوەر چۆن خۆ بپارێزم.؟ تەنیا ئەوەندەم دەزانی کە دەبێت لە "ئەبدولکەدا"و خێزانەکەی خۆ دەربازکەم، بە خۆم دەگوت ئەو ئازاری رێگاوبانە هەرچۆنێك بێت چاکترە لە ئازار و ژیانی ئەم بەندیخانەیەی ئەمان کە تێی کەوتووم.

کاتم ئەوەندە نەبوو، کە دانیشم و بەوردی بیر لە رێگا بکەمەوە، ناچاری زۆری بۆ هێنا بووم، بە هەڵم زانی "ئەبدولکەدا" لە ماڵەوە نیە، بە پرتاو بە پێپلیکانەکاندا رامکردە خوارەوە، تاوم دایە خۆم بەرەو دەرگای دەرەوە. لەو کاتەدا باوکە پیرەکەی "ئەبدولکەدا" بەرێگەوە بوو، بەرەو سەکۆکەی بەردەرگا بچێ و لەوێ دانیشێ، پاڵێکم پێوەنا و رێگاکەم چۆڵکرد، رامکردە دەرەوە، رێگام گرتەبەر تا لە چیا سەرەو لێژ بوومەوە بۆ ناو دۆڵەکە، بەرد و خڕکە بەرد بە هەموو لایەکدا گلۆر دەبوونەوە، ئەژنۆکانم خەریك بوون دەردەچوون، هەستم دەکرد سیەکانم خەریکن دەتەقن، گەیشتمە ناو گۆڕستانێکی بچووك، بەردەوام رامدەکرد، خۆشم نەمدەزانی ئەو رێگایە بەرەو کوێ دەڕوا و بۆ کوێ دەچێ، نەستم هاتبووە سەر کونی لوتم، بیرم لە بەندەی "کونتا کێنتی" پاڵەوانی رۆمانی "رەگەکان" دەکردەوە، کە چۆن لە هەوڵی ئەوەدا بوو خۆی لەو ژیانە ئازاد و رزگاربکا کە کردبوویانە چارەنووسی. ئەوەم دەهاتەوە یاد کە چۆن دەستگیریان کرد و گەڕانیانەوە شوێنی خۆی و سزایاندا، بەدەم ئەو دیمەنانەوە زۆرم لە خۆم دەکرد و خێراتر تاوم دەدا و رامدەکرد.

کاتێکم زانی لە دوواوە گوێم لە هاوار هاواری "مەهمەد" و "وەردە"ی دایکی بوو، بە دوامدا رایاندەکرد. زوو زوو ئاوڕم بۆ دواوە دەدایەوە، بە خۆم دەگوت:"دەبێ ئەو پیرەمێردە کوێرە گاڵی کردبن و پێیگوتبن."

"مەهمەد" و "وەردە" تا دەهات لێم نزیك دەبوونەوە، بە هەموو هێزیان بانگیان دەکردم، ئەم دیمەنانەم وەکو خەوێکی ترسناك دەهاتە پێش چاو. بەتەواوی لە ئەژنۆ

کەوتم و ماندوو بووم، لاشەم لەگەڵ پێکانمدا نەدەهات، "مهەمەد" و "وەردە" لە من خێراتر بەناو ئەو دۆڵەدا رایان دەکرد. لە کۆتاییدا گەیشتنە سەرم، نەمدەزانی سەر بە چ کونێکدا بکەم، شوێنێك نەبوو خۆمی تێدا بشارمەوە، "مهەمەد" پەلاماری دام و گرتمی، کەوتە راوەشان و ئازاردانم، بەسەرما هاواری دەکرد."بۆ کوێ..؟ دەتەوێ بۆکوێ ڕاکەی...؟تۆ شێتی...؟ دەتەوێ بەم شێوەیە سەری خۆت هەڵگری...؟ وەرە بچینەوە... باوکم بەو زوانە لە ناو گوند دەگەڕێتەوە و چارت دەکا... کە ئاوا هەوڵی راکردنت داوە."

هیچ شتێکم بۆنەکرا، جگە لەوەی کە بە ناچاری ملی رێگای ماڵەوەیان لەگەڵدا بگرمەبەر... هەر کە گەیشتینە بەر دەرکی ماڵەوە "ئەبدولکەدا" چاوەڕوانی ئێمەی دەکرد، چاوەکانی گرپان لێدەباری. هەر کە چاوم پێیکەوت ئەژنۆم شکا، ترس دایگرتم، بەڵام من هیچ شتێکم نەبوو کە پێی بڵێم، پتر لەوەی کە دەمویست خۆم لەو ژیانە رزگارکەم.

پێش ئەوەی کە کۆتایی بە هەفتە بێ"نادیا" بگاتە "یەمەن"،"ئەبدولکەدا" ویستی لەگەڵ خۆیدا بۆ شاری "مەرایس"م ببات، بۆ ئەوەی سەردانی "لەیلا و ئەهمەد"ی برام بکەم. منیش لە دڵەوە ئارەزووم دەکرد کە ئەو سەردانە بکەم و چاوم بە خوشك و براکەم بکەوێ، بیریشم لەوە دەکردەوە بەڵکو "لەیلا و ئەهمەد" بتوانن یارمەتیەکم بدەن. "ئەبدولکەدا" ناچار بوو ئەو کارە بکا، لەبەر ئەوەی کە لە "ئنگلاند" پەیمانی بە باوکم دابوو، کە بچین سەردانی خوشك و براکەم بکەم، "ئەبدولکەدا" گوتی:"کاتێك کە گەیشتینە لای ئەوان دەتوانی ماوەیەك لای ئەوان بمێنیتەوە." ئەز بڕوام بە گفتی "ئەبدولکەدا" نەبوو کە پێی دەدام، پێشتر زۆر گفتی دامێ و هیچی نەبردەسەر و بەجێ نەهێنا، بەڵام ئەز وا بیرم دەکردەوە بە گەیشتنم بۆلای "لەیلا و ئەهمەد" چانسێکە بۆ خۆ دەرباز کردن.

ئێواری کەلوپەلم کۆکردەوە، بۆ بەیانی زوو لەخەو هەستاین، بۆ ئەوەی کە نەکەوینە گەرموتاوی نیوەڕۆژ، بەیانی زوو لە خەو هەستاین و سواری جێپێك بووین کە "ئەبدولکەدا" بە کرێی گرتبوو. لەگەڵ خۆماندا بۆ رێگا نەختێك میوەمان برد.

ماوەیەك رۆیشتین جێپەكە بە رێگایەكی كەند و كۆسپدا گەیشتە سەر زنجیرە چیایەك، كاتێك كە جێپەكە دەیوست لە لۆفەكان پێچ بكاتەوە، لە شووشەی پەنجەرەی تەنیشتەوە سەرم دەبردە دەرەوە، بۆنی لاستیكی سوتاو دەهات، جێپەكە هەڵدەخلیسكا لەسەر لێواری لۆ فەكان تەكانی دەدا، بەم دیمەنە ترس دایگرتم، دەستم بە هاوار هاوار كرد. داوام لێكردن كە جێپەكە راگرن و دادەبەزم. "ئەبدولكەدا" هێمنی كردمەوە."مەترسە، پێویست ناكات بترسی، هیچ نیە." شۆفێرەكە بەردەوام بوو لە لێخورین، گوێی بە هاواری من نەدا. تا دەهات رێگاكە بەرەو خراپتر دەچوو، لە هەموو پێچكردنەوەی لۆفەیەكدا چاوەرێی ئەوە بووم بەرەو خوار تلبینەوە و سەرنگون بین. لە ترساندا نیوەگیان ببووم، پاش ماوەیەك لێخورین، كابرای شۆفێر جێپەكەی لادایە كەنارێك و راوەستاین، بۆ ئەوەی نەختێك پشوو بدەین، كاتێك دابەزین كە سەیرێكی خوارەوەم كرد زراوم چوو، جێپەكەم بینی لە كەناری ئەو رێگایە وەستاوە. داوام لە "ئەبدولكەدا" كرد" وازم لێبێنە، من دەمەوێ بە پێ بڕۆم." "ئەبدولكەدا" بە مل بادانێكەوە وەڵامی دامەوە، پاشان گوتی:"رێگاكە دوورە." وچانێكمان گرت. "ئەبدولكەدا" بە دەست هێمایەكی بۆ كردم كە سواری جێپەكە ببمەوە. بەهەر دەردی سەریەك بوو بە هەفت كاژێر گەیشتینە "مەرایس"، تا ئەوێ فرمێسك لە چاوانم دەتكان، هێندە ترساو و ماندوو بووم، سەرەڕای ئەو گەرمی رێگاوبانە كە بە تەواوی تەنگیان پێهەڵچنی بووم، كاتێك لە جێپەكە هاتمە خوارەوە، ئەژنۆكانم دەلەرزین. خەڵكی گوند بەرەو رووومان هاتن، لە چواردەورمان كۆزیلكەیان بەست، بە سەرنجەوە تێیان دەڕوانیم، بە "ئارەب"ی سلاویان لێدەكردم، بە "ئەبدولكەدا"م گوت:"یارمەتیم بدە با وەڵامیان بدەمەوە." ئەم خەڵكانە هەموو پێكەوە زاری سلاویان دەكردەوە و دەپەیڤین. ناچار بە زەردەخەنە و سەر راوەشاندن وەڵامم دەدانەوە.

لەناو ئەو ئاپوورەیەدا پیاوێكی پیری گۆپاڵ بەدەستم بینی بەرەو رووی ئێمە دەهات، پیاوێكی بچكۆلانە لە پیریدا پشتی كۆمابۆوە، سەروریش سپی و چاویلكە لە چاو."ئەبدولكەدا" رووی تێكردم گوتی:"زانا ئەو پیاوە پیرە باپیرتە." خۆم بۆ رانەگیرا دامە پرمەی گریان، بە خۆشیەوە دەمویست لەتەك باپیرەمدا بپەیڤێم، داوای یارمەتی

لێبکەم، بەڵام نەمدەتوانی ئـەو کـارە بکـەم و بەسـەرهاتی خۆمـی بـۆ بگێڕمـەوە، لەبـەر ئـەوەی "ئەبدولکـەدا" وەرگـێڕی ئاخافتنەکـەمان بـوو، پرسـیاری براکـەمم لێکـرد،"کـوا "ئەهمەد"ی برام..؟" وەڵامی دامەوە،"بە ڕێگاوەیە، ئێستا دێ."

پاش وچانێکی کەم "ئەهمـەد" ی بـرام بـە هەڵـەداوان هـات، دزداشـەیەکی درێـژی "ئارەب" ی لەبەردا بوو، کراسێکی کردبوو بەسەردا، هەر کـە چـاوم پێکـەوت زانیـم کـە ئەو کوڕە هەمان خوێن و پشتی منە. بـەدەم گریانـەوە بـەرەو رووی جێپەکـە هـات، کـە گەیشتە لام پەلاماری یەکماندا و توند لە ئامێزم گرت و بە دەم گریانـەوە چووینـە نـاو جێپەکە و دانیشتین، لەبەر ئەوەی کە "ئەهمەد" نەیدەزانی بە "ئینگلیز"ی بپـەیڤێت، ناچار "ئەبدولکەدا" کەوتە نێوانمان و بوو بە وەرگێڕمان. "ئەهمەد" هەر لـە تەمـەنی "سێ" سـاڵانەوە بـاوکم لـە "ئنگلانـد"ەوە بـۆ ئـێرەی هێنـابوو بـەجێی هێشـتبوو، زۆر هەوڵمدا بەسەرهاتەکەی خۆمی بۆ بگێڕمەوە، بەڵام نەدەکرا، بە ناچاری پرسـیاری تـرم لێدەکرد، ژیانی چۆنە، "لـەیلا"ی خوشـکم لـە کوێیـە..؟."ئەهمـەد " گوتـی: "دەتوانـین هەر ئێستا بچین سەر لە "لەیلا"ی خوشکمان بدەیـن."بڕیارمـاندا و ڕێککـەوتین لەسـەر ئەوەی کە ڕێگای ئەوێ بگرینە بەر، سواری جێپەکە بووینەوە و ئەوێمان جێهێشت. بـە ڕێگایەکی گەلێك ناخۆش و دۆڵدا رووە و ئەو گوندەی کە "لەیلا" ی خوشکمی لێدەژیـا، ئەو گوندە کەوتبوو ە ناو دەشتاییەکی بەرکراوە و لە هەموو لایەکەوە شینایی و ئـاو لـە چواردەوری دەبینرا. کاتێك کە گەیشتینە ناو گوند. جێپەکەمان لەبـەردەم خانوویـەکی کۆنی بە بەرد دروستکراودا ڕاگرت، خەڵکی گوند لە هەموو لایەکەوە لێمان خڕبوونەوە و پێشوازیان لێکردین، خەڵکەکە پـتر بـۆ مەبەسـتی ئـەوە گوێیـان شـلکردبوو، تـا بزانـن هۆی هاتنمان چیە و بۆچی هاتووین، ئەوان پێیـان گوتـین:""لـەیلا" و پیاوەکـەی لـێرە نین و چوون بۆ سەردان بۆ گوندێکی تر، ئاگـاداری ئـەوەش نـەبوون کـە ئێـوە بـۆ ئـێرە دێـن." ئێمـەش بـە ناچـاری سـواری جێپەکـە بوویـن و گەڕاینـەوە بــۆ "مــەرایس" بـۆ گوندەکـەی "ئەهمـەد"ی بـرام. کـاتێك گەیشـتینە نـاو گونـد "ئەبدولکـەدا" پێـی گـوتم: "ماڵئاوایی لە "ئەهمەد" و باپیرەت بکە...!"

پێم گوت:"مەبەستت چیە..؟"

خورِ خورِ فرمێسك بە چاومدا دەهاتە خوارێ..."ئەی تۆ نەتگوت كە دەتوانم چەند دەخوازم لەلای خوشك و براكەم بمێنمەوە...؟"

"ئەبدولكەدا" زۆر بێ شەرمانە گوتی:"بۆت نیە بمێنیتەوە، بەیانی "نادیا"ی خوشكت لە "ئنگلاند"ەوە دەگاتە ئێرە، پێویستە بیبینی."

راستیەكەی پتر لە بینینی كەسێكی تر بە ئاواتەوە بووم كە "نادیا" ببینم و چاوم پێبكەوێ، لەبەر ئەوە لەسەری نەرۆیشتم بێدەنگیم لێكرد.

"ئەبدولكەدا" گوتی:"لێرە لای جێپەكە چاوەڕوان بكە تا ئەو دوكانە دەچم هەندێك خواردنەوە بۆ رێگا دەكرِم." كاتێك كە ئەو رۆیشت لەگەڵ دوكاندارەكە كەوتە ئاخافتن، لەو كاتەدا پیاوێك بەرەو رووی من هات، دەستێك چاكەت و پانتۆڵی لەبەردا بوو، بۆینباخێكی بەستبوو، گەیشتە لام و بە "ئینگلیز"ی لەگەڵمدا دەستی بە ئاخافتن كرد، پرسیاری كرد گوتی:"تۆ لێرە چی دەكەی، هاتووی كە "ئەهمەد و لەیلا" فریو بدەی؟..!"

لەم وتانەی ئەم پیاوە سەرم سوڕما، ئەو پیاوە لە پیاوێكی تووڕەوتڕۆ دەچوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەلامەوە خۆش بوو كە مرۆڤێك بە "ئینگلیز"ی دەدوێ، لەڕاستیدا ویستم داوای یارمەتی لێبكەم و هانای بۆ بەرم، بەڵام هەر چەندم كرد توانای دەربڕینی ئەو جۆرە وشانەم نەبوو، پاشان كابرا لێیدا رۆیی. "ئەبدولكەدا" گەڕایەوە بەخۆی و چەند شووشەیەك (پیپسی كۆلا) وە، كە چاوی بە سەرووچاوم كەوت تێكچووم پرسیاری لێكردم گوتی:"ئەوە چییتە بۆ ئاوا شڵەژاوی.؟"

منیش بەسەرهاتەكەم بۆ گێڕایەوە، "ئەبدولكەدا" بە چواردەوری خۆیدا كەوتە روانین، پرسیاری كرد:"كام پیاوە بوو...؟" بەڵام ئەو كاتە پیاوەكە دیار نەما و خۆی ونكرد بوو. "ئەبدولكەدا" بۆ وچانێك هەر نائارام بوو.

شۆفێرەكە خۆی هاویشتە ناو جێپەكەوە و منیش بەگەرمەوە "ئەهمەد"ی برام لە ئامێز گرت، بەگەرمەوە دەستی باپیرم گوشی، سواری جێپەكە بووین و بە جێمان هێشتن، لەكاتی رۆیشتنی جێپەكە رێگاكە بوو بە تەپوتۆز، "ئەهمەد" لەسەر رێگاكە وەكو بت راوەستابوو دەستی رادەوەشاند و دەگریا.

پاش ماوەی چەند مانگێك بـۆم دەركـەوت، كـە چـی بەسـەر "ئەهمـەد و لـەیلا" ی خوشكمدا هاتووە. ئەو كاتەی كە "ئەهمەد" منداڵ دەبـێ چ چەرمەسـەریەكی بەدەسـت باپیرمانـەوە بەسـەر هـاتووە. ئـەو پیـاوە پـیرە كـە دەیبینـی وا دەزانـی كـە فریشـتەیە. كارەسـاتەكە كـە بەسـەر "ئەهمـەد و لـەیلا" هـاتووە ئـاوا بـووە، كـاتی خـۆی باپـیرەم دووچاوی بە باوكمدا هەڵنایە، زۆر ركوكینی لە باوكم دەبێ. كـاتێك بـاوكم "ئەهمـەد و لەیلا" بۆ "یەمەن" دەهێنێ، لای باپیرەم جێیان دەهێڵـێ، باپـیرەم هـەرچی داخ و كینـی پێشـووی باوكمـە بـە "ئەهمـەد"ی دەڕێـژێ. باپـیرەم هەمیشـە لـە "ئەهمـەد" ی داوە، ئێسـتاش كـە "ئەهمـەد" گـەورە بـووە، باپـیرەم ڕێگـای ژنـهێنانی لێگرتـووە. ئەمـەش گەورەترین سزایە كە لە وڵاتی "یەمەن"دا بەرامبەر بە كوڕێك دەكـرێ، لـە كـاتێكدا لـە "یەمەن" كوڕ بۆی نیە بەهیچ جۆرێك توخنی كیژێك بكەوێ و بیجوڵێنێ، خـۆ ئەگـەر كارێكی وا بكات ئەوا هەتا ماوە بە داوێـن پیـس و پاشـەڵ پیـس نـاودێر دەكـرێ تـا ئـەو ڕۆژەی دەمرێ.

ماوەیەك پێش ئەوەی كە "ئەهمەد و لەیلا" بۆ "یەمەن" بهێنرێن، نـەنكمان واتـا دایكی باوكمان دەمرێ، پاش ئەوەی كە باوكم "ئەهمەد و لەیلا" بۆ "یەمەن" دەهێنـێ، لا ی باپیرەم جێیان دەهێڵێ، ماوەیەكی كورتی پێدەچێ باپیرەم ژن دەهێنێتەوە، واتـا زڕ نەنكمان. پاش ئەوە باپیرەم بۆ كاركردن بۆ "كوێت" دەچـێ، ئـەم منالانـە لای ئـەو ژنـە تازەیەی جێدەهێڵێ. ئەم ژنە چارەی "ئەهمەد و لەیلا"ی ناوێ و زۆر نامرۆڤانە لەتەك ئەو دوو منداڵەدا هەڵسوكەوت دەكـات. "ئەهمـەد و لـەیلا" لـەو وڵاتـە گەرمـەدا بەهـەر دەردی سەریەك دەبێ، ژیانی خۆیان دابین دەكەن. بەڵام هیچ شتێك نە لە بـارەی ئێمـە و نە لە بارەی دایك و باوكیانەوە نازانن. ئەم دوو منالـە هەمیشـە خواردنـی بـەرماوە و كۆن دەخۆن، بە پێی پەتی دەكرێنە د ەرەوە بۆ چیلكەوچەواڵ كۆكردنـەوە و ئاوكێشـان. زۆرجـاریش بـە پـای پـەتی و بـە تـاوی گـەرما چـەندان كیلۆمـەتر دەبـرن بـۆ هێنـانی چیلكەوچەواڵ بۆ سوتاندن.

ئەم دوو منداڵە تووشی چەندان نەخۆشی گران دەبن، كەس مشـووریان نـاخوات و لایـان لێناكەنـەوە، ئـازارێكی زۆر بەدەسـت نەخۆشـی و دەردەوە دەچێـژن. ئـەوەی كـە

نەختێك ئەو دوو منداڵەی ئارام کردۆتەوە، مشووری یەکتریان خواردووە و یارمەتی یەکتریان داوە.

کاتێك کە "ئەهمەد" تەمەنی دەگاتە سیازدە ساڵان لەلایەن رژێمەوە دەگیرێ و دەبرێ بۆ سەربازی. دەوڵەتی "یەمەن" لەبەر پەشێوی و نائارامی پێویستی بە گەنجان و لاوان دەبێ بۆ سەربازییان راپێچ بکات، دەوڵەت لە زۆر لاوە نائارام و لە جەنگدا بووە. لەبەر ئەوەی کە ژیانی سەربازی ژیانێکی کۆیلایەتی و مەرگە، تا بڵێی سەخت و دژوارە، لەبەر ئەم هۆیانە خەڵکی کوڕەکانی خۆیان لە سەربازی دەدزنەوە، گەنجەکان نا یانەوێ سەربازی بکەن، ناچار رژێم دەستی کردووە بە گرتنی لاوان و راکردوان لە سەربازی و رەشبگیری کردنیان. پۆلیس و سەربازی بە شێوەیەکی بەر فراوان بە هەموو لایەکی "یەمەن"دا بڵاو کردۆتەوە، بۆ ئەم مەبەستە پۆلیس بە ئارەزووی خۆیان کام لاوەیان بە دڵ بووبێت فرێیان داوەتە پشتی ئۆتۆمۆبیلەکانیانەوە، بەبێ ئەوەی کە کەسوکار و دایك و باوکی ئەم گەنجانە ئاگادار کرابنەوە، یان بەبێ ئەوەی کە ئەو لاوانە کاتی سەربازیان هاتبێ.

کاتێك کە پۆلیس دەچنە گوندی "مەرایس" دەست ناهێننە رێگای "ئەهمەد"، لەبەر ئەوەی "ئەهمەد" تەندروستی باش نەبووە و نەخۆش و لاواز بووە. پۆلیسەکان دەزانن کە ئەو کوڕە کەڵکی ئەوەی پێوە نیە. بەڵام زڕ نەنکەکەمان گاڵی پۆلیسی لێدەکا و داوایان لێدەکات بەڵکو لەگەڵ خۆیان بیبەن و لەکۆڵی کەنەوە. "ئەهمەد" بەو داخوازی زڕنەنکە بەجارێك ئەژنۆی دەشکێ زۆر لە پۆلیسەکان دەپاڕێتەوە کە دەستی لێهەڵگرن، بەڵام تکا و پاڕاندنەوە داد نادا و فڕێی دەدەنە پشتی ئۆتۆمۆبیلەکەیانەوە و دەیبەن. ئەو کاتەی کە "ئەهمەد"م بینی تا ئەو کاتەش هەر سەرباز بوو، ئەو رۆژەی کە بینم بە رێکەوت مەرەخەس کرابوو، بۆ "مەرایس" گەڕابۆوە. دەشێ بەختم هەبووبێ کە "ئەهمەد"م بینی. "ئەهمەد" بە دەردی سەریی و بە ناچاریی خۆی لەگەڵ ئەو ژیانە کۆیلەمەرگیەدا رادێنێ. جاروباریش دێتەوە سەر لە باپیرەم دەدا و هەندێك پێویستی لەگەڵ خۆیدا بۆ دێنێ.

بەدەم ڕێگاوە لە ناو جێپەکەدا بیرم لەوە دەکردەوە کە دەبێ جێپەکەمان بەرەو چیا بەرزەکە هەڵزنێ، ئەو چیایەی کە لەوەوبەر پیایدا هاتین، ترسی ئەو ڕێگایە هەموو گیان و هۆشمی داگرتبوو، لە ترساندا دەگریام، لەبەر خۆمەوە بۆڵە بۆڵم دەکرد، لەوە دەترسام بەم تاریکیە لۆفەیەك جێپەکەمان لولدا و سەرمان تیابچێ. پرسیارم لە پیاوەکان کرد "ئایا ڕێگایەکی تر نیە جگە لەم ڕێگایە، تا لەکۆڵ ئەم ڕێگای مەرگە ببینەوە.؟" پیاوەکان گوتیان: "نا... بەس گلەیی و گازەندە بکە."

لێخوڕینی ئۆتۆمۆبیل بەو شەوە بەسەر ئەو چیایەدا، کارێکی گران و ترسناکە. هەرچەندە من ڕێگاکەم نەدەبینی، بەڵام دەمزانی ئەو کێوە لە پێشماندایە. تا گەیشتینە شارۆچکەی "ئەب" تووشی هستریا بووم.

کاتێك گەیشتینە ئەو شارۆچکەیە، "ئەبدولکەدا" گوتی:"ئەمشەو لێرە دەمێنینەوە." دەستی بۆ خانوویەکی کۆنی سێ نهۆمی ڕاکێشا، لە جێپەکە دابەزین، جانتاکەم هەڵگرت، بەرەو خانووەکە ڕۆیشتین. پیاوێکی پیر دەرگای لێکردینەوە، ئەم پیاوە ژووری بەو کەسانە بەکرێدەدا کە بەشەو ڕێگایان دەکەوێتە ئەم شارۆچکەیە. ئەو شەوە لە ژوورێکی تەنیادا شەوم بەسەربرد، پاش ئەو هەموو ترس و ماندوو بوون و دڵەخورپەی ڕێگایە، تا بەیانی لەسەر زەوی یەکتەختە لێی خەوتم.

ئەو پیاوانەی وەکو "ئەبدولکەدا" و "جەواد" کە هەمیشە پێیەکیان لە وڵات و پێیەکیان لە دەرەوەی وڵات بوو، پێویستیان بەوە بوو، لە هەموو شوێنێکدا خەڵکی بناسن. لەبەر ئەوەی کە ماوەیەکی زۆر لە دەرەوەی وڵات دەمێننەوە بە ئاسانی دەست و دەنگیان ناگاتە خێزان و گوندەکەیان، هەر بۆ ئەمەش کۆمەڵێك پەیوەندی و هاوکاری جۆراوجۆریان بە خەڵکانەوە هەیە، لە کاتێکدا کە دراو، یان نامە، یان هەر ڕاسپاردەیەکی تریان هەبێ بۆ خێزانەکانیان لە ڕێگای ئەم دۆست و ناسیاوانەیانەوە دەیگەیەنن.

"ئەبدولکەدا" و "جەواد" ناسیاوێکیان هەبوو لە شاری "تایز" ناوی "ناسر" بوو. ئەم پیاوە لە شارۆچکەی "ئەب" خانوویەکی گەورەی هەبوو. "ناسر" ئەو خانووەی بە "جەواد" و "ئەبدولکەدا"دا سپارد بوو، بۆ ئەوەی ئەو ڕۆژەی کە "نادیا" گەیشتە جێ

لەوێ دابەزن و پشوو بدەن، هەر لەو خـانووەش چاومـان بەیـەك بكـەوێت. خانوویـەكی گـەورەی پاكوخـاوێن بـوو، بـە پێپلیكـەی لـە چیمـەنتۆ دروسـتكراو سـەركەوتین بـۆ نـاو خانووەكە و چووینە ژوورێكی گەورەوە، ژوورەكە پڕبوو لە پیاو لە ناو پیاوەكاندا چاوم بە "ئەبدوڵا"ی بەناو مێردم كەوت، پاشان چاوم بە "جەواد" كەوت لەناو ئەو پیاوانەدا چاوم بە "نادیا" كەوت بـەبێ دەنگی دانیشـتبوو، "نادیـا" مـاندوو دیـار بـوو هـەر وەك چۆن دوو هەفتە لەوەوبەر ئەوەم بە خۆمەوە بینی بوو، ئەو فڕۆكەیـەی كـە "نادیـا" و "جـەواد" ی پێـهاتبوون لـە كـاتی خۆیـدا بـەبێ دواكـەوتن بـاڵی گرتبـوو. كـە چـاوم بــە "نادیا" كـەوت زانیـم ئـەو نامەیـەی كـە بـۆ دایكـم و "نادیـا"م نووسـیبوو نەگەیشـتۆتە دەستیان و بەردەستی دایكم نەكەوتووە.

بە بینینی "نادیا" گەلێك دڵشاد بووم، بەڵام گـەلێك بـەوە دڵتـەنگ بـووم كـە ئـەو پیاوانـە كارەكـەیان بـۆ چۆتـە سـەر و بەرامبـەر "نادیـا"ش پیلانەكـەیان سـەری گـرت و توانیان "نادیا" لە "ئنگلاند" دەرپەڕێنن.

ئێستا بواری ئـەوە نـەماوە كـە "نادیـا" لـەو چارەنووسـە بـەد فـەرە ڕزگـار بـێ كـە چاوەڕێی دەكات. تاكە ڕێگا لەبەر دەممانـدا ئەوەیە كە هـەردووكمان بـە جووتـە هـەوڵی خۆ دەرباز كردن بدەین و خۆمان لە "یەمەن" ڕزگـار كـەین. ئێسـتا بـە هـاتنی "نادیـا" خۆم لـە بـیر چـووەوە، پـتر پەرۆشـی ئـەوم وەك لـە خـۆم، مـن دەتـوانم بـەرەنگاری ئـەم رەوشە ببمەوە، "نادیا" هەڵسوكەوتی زۆر لە مـن منداڵانـەتر بـوو، ئەوەشـی پێـوە دیـار بوو.

"ئەبدولكەدا" گوتی: ئـەوە "نادیـا"ی خوشـكتە، بـڕۆ بـۆ لای، بـۆی ڕوونكـەرەوە و تێیگەیەنە، كە ئەو ئێستا بە مێردەو شووی كردووە. منیش چرپاندم بـە گوێیـدا، "مـن ناتوانم ئەوەی پێبڵێم"... "بڕۆ پێی بڵێ... باشتر وایە كە لە دەمی تۆوە بیبیستێ".

پێشنیازەكەی "ئەبدولكەدا"م پەسەند كرد، بــەرەو ڕووی "نادیـا" چـووم. "نادیـا" هەستایە سەرپێ و بە سەرنجەوە ماوەیەكی كورت لە یەكتری ڕامایین هەستم بـە دڵـپڕی خۆم كرد، بەڵام دانم بە خۆمدا گرت كە نەگریم، پــەلاماری یـەكترماندا و یـەكترمان لـە

ئامێز گرت. گریـان یەخـەی بەرنـەدام و دامـە پرمـەی گریـان. "نادیـا" پرسـیاری کـرد، "ئەوە بۆ دەگری..؟"

ئەو ئازاری دوو هەفتەیەی کە بەدەست "ئەبدولکەدا" و خێزانەکـەیی و ڕێگاوبـان و ماندوێتیەوە چێشتبووم، نەمتوانی وا بە ئاسانی بۆ "نادیا"ی دەربڕم، یان ئەو هەست و ئازارەی بەرامبەر بـە "ئەهمـەد"ی بـرام کـە بـۆ یەکـەمجار بینیـم، لەبـەر ئـەوەی کـە "نادیا" ئازار نەدەم، بە ناچاری بە گریان دەرم بڕین.

لەڕاسـتیدا دەمویسـت بـۆ "نادیـا"ی بگێڕمـــەوە و لێـی نەشـارمەوە، بـەڵام تـەنیا وشەیەکیشـم بـۆ نـەدەهات و دەرنـەدەبڕا، نـەمدەزانی چـۆن و لـە کوێـوە دەسـتپێبکەم، "نادیـا" داینیشـاندم و تۆزێـك ئـاوم خـواردەوە، پاشـان دەسـتم بـە گێڕانـەوەی بەسـەر هاتەکە کرد.

"نادیـا"... ئـا ئـەو کـوڕە دەبینـی...؟ بـە دەسـت هێمـام بـۆ "مهەمـەد"ی کـوڕی "جەواد" کرد، ... ئەوە کوڕی "جەواد"ە و... مێردی تۆیە...

"نادیا" کوڕەکەی بینی و پرسیاری کـرد: "ئـێ چـی".. وا دەزانم "نادیـا" بـاش لـە وتەکەم تێنەگەیشت کە چیم گوت.!

"نادیا" دەزانـی کـە بـاوکم ئێمـەی بـە 1300 پـاوەند بـە کوڕەکـانی "ئەبدولکـەدا و جەواد" بە شووداوە و فرۆشتووە..؟!

ئێمە ماوەمان نەبوو، نەمانتوانی لەو شوێنەدا لە ناو ئەو هەموو پیاوانـەدا درێـژە بـە هەڤپـەیڤین بدەیـن، لەبـەر ئـەوە "ئەبدولکـەدا" بردینیـە ژوورێکـی بچوکـی تـرەوە، لەوێ درێژەمان بـە ئاخـافتنی خۆمـاندا، دەسـتم کـرد بـە گێڕانـەوەی بەسـەرهاتەکە لـە سەرەتاوە تا بنەتا.

پرسـیارم لـە "نادیـا" کـرد: "ئـەو نامەیـەی کـە بـۆم ڕەوانـە کـردن بـە دەسـتان گەیشـت..؟" "نادیـا" بەسـەر بـادانێك وەڵامـی دامـەوە. "کـام نامەیـە..؟ نـا نامـەمان بـە دەست نەگەیشتووە."

"نادیا" بڕوای بەو شتانە نەدەکرد کـە بـۆم گێڕایـەوە، ئـەوەندە ئاسـان نـەبوو کـە تێیان بگات، من تێدەگەیشتم ئەو بەسەرهاتەی کە بەسەرمان هێنراوە چەند گران و بە

ئازارە، مرۆڤ بە بیستنی ئەم ڕووداوە وا دەزانێ بەسەرهاتێکی هەزار و یەك شەوە بێ! بەڵام ئەوە ڕاستیەکە و لە ئێمەی ڕوداوە.

"نادیا" پرسیاری کرد، "ئێستا چی بکەین؟".

بە "نادیا"م گوت: "پێویستە بە بەردەوامی نامە بۆ دایکم بنووسین و ڕەوانە بکەین، تا کو یەکێك لەو نامانە دەگاتە دەستی دایکم، ئەمە تەنیا شتێکە کە بتوانین و لە دەستمان بێ... دان بە خۆتا بگرە، ئێستا ئێمە دوانین، ئەگەر بێت و دایکم پێی بزانێ، کە چیمان بەسەر هاتووە، خۆی دەگەیەنێتە دامودەزگای دەوڵەت و دەربازمان دەکات، دایکم هەرگیز لەوە کۆڵنادا و دەستبەردارمان نابێ، کە ئەمانە ئاوا بە دەستبەسەری بمانهێڵنەوە".

"نادیا" گوتی: "لەوانەیە دایکیشم بەم پیلانەی زانیبێ." من تۆزێك بێدەنگ بووم، لەبەر ئەوەی جاروبار ئەو بۆچوونەش بە مێشکی مندا دەهات. بە توندی وەڵامی "نادیا"م دایەوە "نا بڕوا ناکەم، ئەز دڵنیام کە دایکیشم هەر ئەوەندەی ئێمە ئاگاداری ئەم پیلانەیە، دایکیشم وەك ئێمە بڕوای بەو پیاوانە هەبووە، کە تەنیا بۆ گەشتێك ئێمەیان بۆ ئێرە هێناوە."

پاش ئەوە "نادیا" هاتە سەر ئەو ڕایەی کە دایکشم هەر هێندەی ئێمە ئاگاداری ئەم پیلانە چەپەڵەیە. لەڕاستیدا نە من نە "نادیا" هیچمان تەواو دڵنیا نەبووین لەو بڕوایەدا بووین کە هەموویان یارمەتیدەر و جێبەجێکاری ئەم پیلانە بوون، بەڵام ئەو بڕوایەشمان هەبوو کە دەبێ یەکێك هەبێ و لەم ژیانە دۆژە ئاسایە دەرمان بهێنێ، لەمە پتر هیچ ئاواتێکی ترمان نەبوو. پاش تەواوبوونی گفتوگۆ، گەڕاینەوە بۆ ئەو ژوورەی کە پیاوەکانی لێدانیشت بوون، پیاوەکان خەریکی ئاخافتن و وتوویژ بوون.

"ئەبدولکەدا" پرسیاری لێکردم بە "نادیا"ت ڕاگەیاند...؟ ڕوویکردە "نادیا" و پێیگوت ئێستا تێگەیشتی..؟ نادیا وەڵامی نەدایەوە، بێدەنگ و ڕەنگپەڕیو ڕەنگی زەرد هەڵگەڕا بوو، وەك ئاشی ئاوکەوتوو، بۆ ماوەی چەند خولەکێك تەواو بێدەنگ و سەرسام بوو، ڕەنگی وەك ڕەنگی مردووی لێهاتبوو، چاوەکانی خەمیان لێدەباری.

"مهەمـەد"ی بـە نـاو مـێردی "نادیـا"، کوڕێکـی سـیازدە سـاڵان بــوو، تەمــەنی لــە "نادیا" بچوکتر بوو، بەڵام گەلێك لە "ئەبدوڵا"ی بە ناو مێردی من بە خۆتر بوو.

پاش نیوەڕۆژی ئەو ڕۆژە جارێکی تر مــن و "نادیـا" و "ئەبدولکـەدا" و "جـەواد" کوڕەکانیان خۆمانکرد بە ناو جێپەکەدا بەرەو گوند بووینەوە. ئەز ئەوەم نەدەزانی کـە ئـەم سـوار بوونـی ئۆتۆمۆبیلـە لەگـەڵ "نادیـا"دا دوا سـەفەرمان دەبـێ. چــەند سـاڵێکی خایاند تا جارێکی تر پێکەوە سواری ئۆتۆمۆبیل بووینەوە.

# بەشی شەشەم

# بووین بە هاوسێ

ئـەو گونـدەی کـە "جـەواد" و خێزانەکـەی لێدەژیـان نـاوی "ئاسـهوبی" بـوو. ئـەم گوندە لە "هۆکایل" گچکەتر بوو، لە بـەردەرکی مـاڵی ئێمـەوە بـە ڕێگایـەکی نـاخۆش و کەند و کۆسپدا، نیو کاژێر لێمانەوە دوور بوو.

خانووەکـانی گونـدی "هۆکـایل" پـەرش و بـڵاو بـوون، هەریەکـەی کـەوتبووە لایەکـەوە. بـەڵام خانووەکانی گونـدی "ئاسـهوبی" چـوو بـوون بـە نێـو یـەکدا و نزیکـی یەکتر بوون. پەیوەندیش ئاساییتر بوو.

کاتێك کە یەکـەمجار لـە "تـایز"ەوە هـاتین، لاماندایـە "ئاسـهوبی" جێپەکـە لـەوێ ڕاوەستا، "ئەبدولکەدا" بانگی لە "نادیا" کرد، کـە دەبـێ لەگـەڵ "جـەواد و مهەمـەد"ی کوڕیدا دابەزێت. ئەز پرسیارم کرد، "بۆ کوێ دابەزێ..؟"

"ئەبدولکـەدا" وەڵامـی دامـەوە "نادیـا" بـۆ مـاڵی "جـەواد" دەچـێ. بـەڵام ئێمـە بەیانی دەتوانین بێین سەریان لێبدەین. لە ناکاو تاسەیەك دایگرتم، پاش ئـەو ماوەیـەی کە لێك دابڕا بووین ئەوا دیسان دەبێ جارێکی دی لێك جودا بینەوە. دەستم بە هاوار و زریکە لێدان کرد. داوام لێکردن کە وازمان لێبێنن با پێکەوە بـین. "نادیـا" بـە ناچـاری لە جێپەکە دابەزی، لە سووچی ڕێگەکەوە بە بێدەنگی ڕاوەسـتا و دەگریـا. ئـەز هەسـتم

بەوە کرد کە "نادیا"م دڵتەنگ کردووە، لەبەر ئەوە بێدەنگ بووم. دەرگای جێپەکەیان لێداخستم، ئەوان لەگەڵ "نادیا" بەرەو ناو گوند بۆ ماڵی "جەواد" بەڕێکەوتن.

ئەو کاتە دڵم بەرایی نەدەهات سەیری "نادیا" بکەم، لەبەر ئەوەی کە دەمزانی ئەمشەو چارەنووسی "نادیا" بەچی دەگات. بە ناچاری دەستم گرت بە دەم و چاومەوە و دەگریام. پاش ئەوە جێپەکە دەستی هاژووت بەرەو گوندی "هۆکایل". لە ناو جێپەکەدا بەو ڕێگایەوە لوشکە لوشك بەسەر "ئەبدولکەدا"دا دەگریام و دەمزریکاند، پێم گوت: "تۆ کابرایەکی گلاراو و شێتی، هەرگیزاو هەرگیز ئەم پیلانەت بۆ ناچێتە سەر، ڕۆژێك دێت من و "نادیا" بۆ وڵاتی خۆمان بگەڕێینەوە". هەرچی ناخۆش بوو لە ناو جێپەکەدا لەبەر چاوی سەرنشینەکان پێمکرد. "ئەبدولکەدا" بە تەواوی پەستبوو. هەرچەندە ئەوەم چاك دەزانی کە ئەو هاتوو هاواره دادم نادات، بەڵام هەندێك تەسکینیم دەهات.

بەیانی زوو لە پێش هەموو خێزانەکەوە لە خەو هەستام و خۆم ئامادە کرد، هەر وەکو منداڵ بە دوای "ئەبدولکەدا"وە بووم، پرسیارم لێدەکرد: "کەی بڕۆین سەر لە "نادیا" بدەین...؟" پاش ئەو هەموو هەوڵدانەم چووە ژێر بارەوە و پەیمانیدا کە دەچین، پاش ئەوە چووینە خوارەوە، هەر لەو ڕێگایەوە کە پێش چەند ڕۆژ لەوەو بەر ویستم خۆمی لێوە دەربازکەم، ڕێگایەکی باریك بە وشکە کەڵەك هەڵچنرا بوو، بە ناو دارستانێکی مات و تاریکدا ڕەتدەبوو، تا گەیشتینە ماڵی "جەواد" نیو کاژێرمان پێچوو. زۆربەی خەڵکی هاتبوون بۆ سەردانی ئەو کچە گەشتکارە کە لە "ئنگلستان"ەوە هاتووە. پیاوان لە ژوورێك بە جیاو، ژنانیش لە ژوورێکی تر دانیشتبوون، لە ژووری ژنان پێیان گوتم، "نادیا" لە ژوورەکەی خۆیەتی، ژوورەکەی "نادیا" یان نیشاندام، منیش بە هەڵە داوان بۆ لای "نادیا" چووم.

"نادیا" لەسەر تەختی نووستنەکەی راکشابوو، کە چاومان بە یەك کەوت پڕمان کرد بە یەکدا، بە جووتە دەستمان کرد بە گریان، "نادیا" بەدەم گریانەوە ئەوەی بۆ گێڕامەوە کەچی بەسەر هێنراوە. کە چۆن شەوێ "جەواد" بە کوڕەکەی خۆی و بە "نادیا"ی گوتبوو، ئەمشەو دەبێ پێکەوە بخەون، بەڵام نە "نادیا" و نە کوڕەکەی

"جەواد"یش بەو کـارە هەڵنەسـتابوون. "مەهمـەد" وەکـو "ئـەبدوڵا"ی بـە نـاو مـێردم، لاواز و نەخۆش نەبوو، تەمەنیشی تەنیا سیازدە ساڵان بـوو، بـەڵام "مەهمـەد"یـش بـە هەمان شێوەی "ئەبدوڵا" لە باوکی دەترسا.

"نادیا" گێڕایەوە و گوتی: "جەواد" بردمی بۆ ژوورەوە، دەرگای لەسـەر داخسـتم، لە ژوورەوە گوێم لێبوو کە چۆن "جـەواد" بەسـەر "مەهمـەد"ی کوڕیـدا دەیبۆڵانـد، وا دەزانم کـە "مەهمـەد" نەیدەویست بێتـە ژوورەوە و لەگـەڵمدا بخـەوێ، ئەوەشـم گـوێ لێبـوو، "جـەواد" لـە "مەهمـەد"ی سـرەواند. "مەهمـەد" هـاواری دەکـرد و لـە بـاوکی دەپاڕایەوە، چەند شتێکی سەیر بوو.

"نادیـا" کـە ئـەوەی بـۆ گێڕامـەوە، پاشـان بـۆ چـەند خولـەکێك بێدەنـگ بـوو، بـۆ ئەوەی ئارام بێتەوە، پاشان دەستی بە گێڕانەوەی باسەکەی کرد و گوتی: "هێندەم زانـی دەر گای ژوورەکەم کرایەوە، "جەواد، مەهمەد"ی کوڕی بە پاڵ کردە ژوورەوە، هـەر وەك ئـەوە دەچـوو، کـە مامەڵـە لەگـەڵ ئـاژەڵدا بکـات، "جـەواد" دەرگاکـەی لـە دیـوی دەرەوە لەسەر کڵۆم کردین و لێیدا ڕۆیشت."

"نادیا" هەناسەیەکی هەڵکێشا و گوتی: "هەرگیز دوێنێ شەوم لە یاد ناچێ."

چـەند ڕۆژێـك دوای ئـەوە لـە "ئەبدولکـەدا"م پرسـی: "بۆچـی "جـەواد" لـە "مەهمەد"ی کوڕی داوە..؟" "ئەبدولکـەدا" وەڵامـی دامـەوە، گوتـی: مەهمـەد سەرکێشی کردووە و نەیویستووە لەگەڵ "نادیا" بخەوێ، لەبـەر ئـەوەی کـە "نادیـا" جلـی بوکێنـی باوی لەبەردا نەبووە و نەڕازاوەتەوە و سەرپۆشی بەسەرەوە نەبووە. مەهمەد بـە بـاوکی گوتـوە مـن هـەرگیز داوای کچێکی بیـانیم نـەکردووە، کـە ببێتـە بوکـی یەکشـەوەم، مـن نـاخوازم ئـەو کچـە ژنم بـێ.. ئـا لەبـەر ئـەو سەرکێشـییە "جـەواد" لـە "مەهمـەد"ی سرەواندووە.

مەهمەد و ئەبدوڵا لە تەمەنی خۆیاندا ئەو ژنانەی کە پێش مـن و "نادیـا" بینـی بوویانن، تەنیا دایك و ژنە خزمەکانی خۆیان بوون.

ئەوەی کە ئەو مێرد منداڵانە بەرگوێیان کـەوتبوو و فـێری ببـوون، ئـەوە بـوو کـە ژنان و کچانی بیانی هەموویان بێ رۆمەتن، پاشان پیاوانیش ئەوەیان پـێ گوتبـوون کـە دوو کەسی ترسناك ژنتانن.

ژنەکەی جەواد ناوی سەلامە بوو، سەلامە وا پێدەچوو کـە پـتر لـە هەسـت و دڵـی "نادیا" بگات، نەك وەك ئەوەی کە وەردە بەرامبەر بە مـن دەیکـرد و دەری دەبـڕی. لـە ڕووخساری سـەلامە دا ئـەوە دیـار بـوو کـە بـەزەیی بـە "نادیـا" دێتـەوە، زۆر جـار دڵـی "نادیا"ی دەدایەوە و وەك کچی خۆی لە ئامێزی دەگرت و مـاچی دەکـرد. "سـەلامە"ش وەك هەموو ژنەکانی هاوشانی لەسەری پێویست بـوو کـە گوێڕایـەڵی مێردەکـەی بـێ، وا پێدەچوو کە مێردەکەی خۆی خۆش بوێ و ڕێزیشی لێبگرێ.

"نادیا" بە وێنەی من سەرکێش و بەگژ خێزانەکەیدا نـەدەچوو، لەگـەڵ ئەوەشـدا هەندێك سەرپێچی دەکردن. "نادیا" هەمیشە پرسیارێکی دەکرد و دەیگوت: "جەواد بۆ بەم کارە هەستا و ئەم پیلانەی بەرامبەر کردم...؟" هەروەك چۆن من بە ئەبدولکـەدام دەگـوت: "وازم لێبێنـێ مەرەخەسـم کـات و بـۆ وڵاتـی خـۆم بگەڕێمـەوە." کـاتێك کـە "نادیا"ش ئەمەی بە "جەواد" دەگوت: جەواد پێکـەنینی بـە داواکـەی "نادیـا" دەهـات. بە بیستنی ئەو داوایە لە ژوورەکەی "نادیا" دەچووە دەرێ. پاش ئەوە سەلامە دەچـووە لای "نادیا" و دەیهێنایەوە سەر خۆی و دڵی دەدایەوە. جەواد پیاوێکی باڵا بـەرزی تێـك سمڕاوی سەر ڕووتاوەی دەموچاو توکن بـوو، بـەڵام ئەگـەر بـەراووردت بکردایـە لەگـەڵ ساڵانی پێشـوودا، ئـەوا لـەم دوایانـەدا گـەلێك لاواز ببـوو، جـەواد تـا بڵێـی پیـاوێکی ئێسکگرانی ناشرین بوو.

خانووەکـەی جـەواد هـەر بـە وێنـەی خانووەکـەی "ئەبدولکـەدا" دەچـوو، بـەڵام ژوورەکانی بچوکتر و ناخۆشتر بوون، "جەواد" و "سـەلامە"ی ژنـی و دوو کوڕەکـەیان و "نادیا" لەو خانووەدا دەژیـان. کـوڕە گچکەکـەی "سـەلامە" نـاوی "شـەهاب" و تەمـەنی پێنـج ساڵان بوو، کاتێك کە "نادیا" کرایە بووکی ئـەو ماڵـە، ماوەیـەکی کـەمی بـرد کـە "سەلامە" کچێکی بوو.

ژوورەکەی "نادیا" هەر بە وێنەی ژوورەکەی من بوو، بەڵام تۆزێك گەورەتر و هەمان شێوە مۆبێلەشی تیا بوو، بەڵام پەنجەرەکانی ژوورەکە هەندێك گچکەتر بوون، لەبەر ئەوە ژوورەکە تاریك و دڵتەنگ بوو، بەڵام هۆڵی دانیشتنەکەیان گەورە و فێنك و ڕووناکتر و پەنجەرەیەکی گەورەشی تێدا بوو، لە گەرماوەکەشیاندا پەنجەرەیەکی تێدا بوو، کە پیاو دەچووە ژووری چاوی دەبینی و پێویستی بە لایتی دەستی نەبوو، بنمیچی ژووری گەرماوەکە بەرز بوو، مرۆڤ دەیتوانی بە ڕێکوپێکی لە ناو ژووری گەرماوەکەدا بەپێوە ڕاوەستێ بەبێ ئەوەی کە خۆی بنوشتێنێتەوە یان سەری بەر بنمیچی گەرماوەکە بکەوێ. لە دەرەوەش سەر تەنوورێك و کەلەگیەکیان هەبوو، خواردنی وشکەیان تیا دانابوو، هەر لەوێش "زەوەر"ی زستانیان لێدادەنا، هەر لەو سەرتەنوورە ئاگریان بۆ چێشت لێنان دەکردەوە، بۆ ئەوەی دووکەڵ خۆی نەکات بە کونی ژووری دانیشتن و خەوتندا. ئەم شێوەیە شێوەیەکی باویە، وەکو ماڵی "ئەبدولکەدا" ئاگردانێکی لە قوڕ دروستکرا ویان هەبوو ئاویان لەسەر گەرم دەکرد.

"جەواد" بە هەمان شێوەی "ئەبدولکەدا"، کە چۆن خواردنی "ئنگلیز"ی بۆ لێدەنام، ئاوا ئەویش خواردنی بۆ "نادیا" چێدەکرد، ئەو شتانەشی بۆ "نادیا" دەکڕی کە دەیزانی پێویستی پێیەتی، هەفتەی یەکەم دەستیان نەهێنایە نە ڕێگای من نە "نادیا" کە هاتووچۆ و سەردانی یەکتری بکەین. ڕۆژێك "نادیا" و "جەواد" و خێزانەکەی هەموویان هاتن و سەردانی ماڵی "ئەبدولکەدا" یان کرد. بۆ ڕۆژی دوایی ئێمە سەردانی ماڵی "نادیا" و جەوادمان کرد. هەموو ڕۆژێك من و "نادیا" هەر چاوەڕێی ئەوە بووین کە هەواڵێکمان لە دایکمانەوە پێبگات، بەڵام نە نامەیەك هات و نە هیچ دیار بوو. من و "نادیا" بە بەردەوامی لەبەر دەرکی ماڵەوە لێی دادەنیشتین و بە جووتە سەیری ئاسمانمان دەکرد و دەمان گوت: "ئێستا هێلیکۆپتەرێك لە پشتی ئەو چیایەوە دەرکەوێ، بێ لەلای ئێمە بنیشێتەوە و هەردووکمانی تێفڕێدا و پاشان باڵ بگرێ و ڕزگارمان بکات."

بۆ ئێمە شتێکی ئاسایی بوو کە تا ماوەیەکیش وەکو دوو کچی ئنگلیزی هەڵسوکەوت بکەین، دەچووینە سەربان و لەوێندەرێ خۆمان دەخستە بەر هەتاو، پێش

ئەوەی کە بێین بۆ ئێرە هەرگیز ئاوا گەنم ڕەنگ نە بووین. بەڵام دوای ئەوە سـەرتاپای لـەشمان لـە کەڵەمستی پێمانـەوە تـا تـەپڵی سـەرمان بـە جلوبـەرگی ژنانـەی ئـارەبی شاردرایەوە، ئیتر پێستی لەشمان جـارێکی دی روونـاکی خـۆری نـەدی. تینـی خۆرەتـاوی ئـەو ناوچەیـە هێنـدە بـە تینوتـاو بـوو، تەنانـەت پێسـتی مرۆڤـی لـە ژێـر جلوبەرگـەوە تاوەسوت دەکرد. ئەو بەشانەی لـەش کـە خۆرەتاویـان بەردەکـەوت تـەواو تاوگـاز بـوون، کاتێکیش کە دەستمان بە کاری ناو ماڵ و هەرەوەزی و کشتوکاڵ کـرد، ئیـتر تـەواو ڕەش هەڵگەڕاین.

چەند ڕۆژێك بەر لە هاتنی "نادیـا" تـەنیا هـەواڵێك کـە لـە بـارەی "ئنگلانـد"ەوە پێم گەیشت، ئەو پۆستکارتانە بوو لە هاوڕێکانمـەوە لەگـەڵ نامەیـەکی دایکمـدا. کـاتێك کـە نامەکـەم خوێنـدەوە هـەموو لایـەك تەندروسـت بـاش و سـلاویان هـەبوو، لـە کـاتی خوێندنەوەی نامە و کارتەکاندا، هێندەی نەمابوو دڵم بپچڕێ، تـا ئـەو دەمـەش، ئـەوان وایان دەزانی کە من لە گەشتێکی خۆش و دنیای ئارامدام.

دایکم لە پاشاندا بـۆی گێڕامـەوە، کـە ئـەو کاتـە چـەند دڵخـۆش و کامـەران بـووە، لەبەر ئەوەی کـە وای زانیـوە، مـن خـەریکی دانـس و گۆرانـی گوتـن و ئاهـەنگ گـێڕانم، لەگەڵ هاوڕێ نوێکانمدا..! ئەو کاتـە بـووە کـە پۆسـت کارتەکـەم بـۆ دایکـم ڕەوانـە کـرد تیایدا نووسی بووم، کە چـەند دڵـم شـاد و گەشـتێکی خۆشـم کـردووە. هـەروەها دایکـم گوتی شانازیم بەوەوە دەکرد، کە چۆن کچەکـەم هـەلێکی وای بـۆ هەڵکـەوتووە، وڵاتێکـی تر و ژیـانێکی تریـش لـەوێندەرێ ببینـێ، بـەڵام دایکـم نـەیدەزانی کـە کچەکـەی چـەند دیلێکی بێدەسەڵاتە.

ئەو نامە و کارتانە لە بار ەی ماڵەوە و "ئنگلاند"ەوە دوا هەواڵ و ئاگـاداری بـوون. ئەم خێزانانە نەیاندەهێشت نامەی دایکم بگاتـە دەسـتمان. ئـەز هەسـتم دەکـرد کـە لـە شـاری "تـایز" کەسـێکیان راسـپارد بـوو، ئـەو نامانـە بگەیەنێتـە دەسـتی "جـەواد" و "ئەبدولکەدا" ئەوانیش نامەکانیان لەلای خۆیان هەڵدەگرت و بە ئێمەیان نەدەدا.

"ئەبدولکەدا" زۆری ئەوەی لێکردم، کاتێ کە دەچم بۆ شت کڕین، یان بۆ ناو گوند دادەبەزم، دەبێ لەمەو دووا ئەو ڕێگایەی پشتەوە بگرم، بە ڕێگای ژناندا بڕۆم.

ئەو ڕێگایە تا بڵێی ڕێگایەکی ناخۆش و بەناو دارستانێکی تاریك و پڕ لە مار و دووپشکدا ڕەت دەبوو، ئەوەشم دەزانی کە ئەو ناوە پڕ لە گورگ و کەمتیار و بیابان بوو. زۆر جار لە پەنجەرەی ژوورەکەمەوە لە ناو دەشتەکەدا ئەم ئاژەڵانەم دەبینی. پیاوێك لە ناو گوند بە خۆمی گوت: "ئەبدولکەدا پیاوێکی دڵپیسە، نایەوێت بە هیچ جۆرێك پیاوانی بیانی ژنێکی ناو خێزانەکەی ببینێ". لە ڕاستیدا ئەبدولکەدا بەرامبەرم زۆر توند و تیژ بوو. ئەو دەیزانی من دەمەوێت سەری خۆم هەڵگرم و ڕاکەم، "ئەبدولکەدا" بە هیچ جۆرێك بڕوای پێم نەبوو. دەیزانی هەر بۆم بلوێ خۆم دەرباز دەکەم. ئەو پیاوە لەو بۆ چوونەدا ڕاستی دەکرد.

لەناو گوندا بەهەر پیاوێك بگەیشتمایە کە "ئینگلیزی" بزانیایە، داوای یارمەتیم لێدەکرد، یان هەر کاتێك بۆ سەردانی "ئەبدولکەدا" بهاتنایە، کردبووم بە پیشە هەر هەلم بۆ هەڵکەوتایە، داوای یارمەتیم لێدەکردن. بەڵام ئەم پیاوانە هیچ کاتێك بە تەنگ داواکەی منەوە نەبوون و پشتگوێیان دەخست. ئەو پیاوانە گەلێك پەیوەندیان لەگەڵ "ئەبدولکەدا"دا بەهێز بوو، یان هاو خوێن یان لە ڕێگای ژن و ژن خوازیەوە یان لە ڕێگای بەرژەوەندی و دراوەوە پشتی یەك بوون. ئەم پیاوانە پێیان دەگوتم: "وا چاکە لێرە بمێنیتەوە، ئەو هەست و بیرەش نەخەمە سەری ژنەکانیانەوە. با ئەوانیش نیشانەی پرسیار بەرامبەر بە توانای پیاوەکانیان دروست نەکەن."

ئەم هەوڵ و کۆششەم ئاسان نەبوو کە بتوانم لەتەك ئەو پیاوانەدا بپەیڤم. بە چەند هەفتەیەك دوای هاتنم بۆ ئەو گوند و ماڵە، کاتێك میوانی پیاومان دەهات، دەستبەجێ "ئەبدولکەدا" گازی دەکردم. کە بچمە ژوورەکەم، خۆم نیشانی پیاوان نەدەم. لە سەرەتاوە ئەو هەڵسوکەوتەی لە تەکمدا نەدەکرد و ڕێگای دەدام، لە تەك میوانە پیاوەکاندا بپەیڤم، هەر چۆن لە "ئینگلاند" بە ئاسایی و بە سەربەستی ئەوەم دەکرد. بەڵام سات دوای سات بەرامبەرم توندوتیژ دەبوو. منیش لە چاوەکانیدا ببوومە ژنێکی "ئارەب". پیاوە گوندیەکانیش هەموویان لە "ئەبدولکەدا" دەسڵەمینەوە و دەترسان، لەگەڵ ئەوەشدا هەندێکیان بەزەییان بە مندا دەهاتەوە، ئەمانە پێیان دەگوتم خۆت سەغڵەت مەکە. ڕۆژێك دێ بە ئاواتی خۆت دەگەی و دڵشاد دەبی. پێیان دەگوتم:

ئەو ساتەش دێ کە دایك و بابت لە یاد دەکەی ئێستا تۆ شووت کردووە. هەمیشە بە هیوای ئەوەوە بووم کە یەکێك لەم پیاوانە بکەوێتە ژێر بارەوە و نامەیەکم بۆ بەرێ بۆ شاری "تایز" و بیخاتە پۆستەوە و ڕەوانەی بکات. بەلاّم کەسیان بەم کارە هەڵنەدەستان. لە ڕاستیدا لە هەمانکاتدا دەترسام کە نامە بەم پیاوانە بدەم بۆم ڕەوانە بکەن، لەبەر ئەوەی کە بڕوام پێنەدەکردن، دەمزانی کە ئەو نامەیە بەردەستی "ئەبدولکەدا" دەکەوێ.

"ئەبدولکەدا" دەیزانی کە دایکم دڵی لامانە و هەواڵمان دەپرسێت، لەبەر ئەوە پێی گوتین: "پێویستە دەنگی خۆمان تۆمار بکەینە سەر کاسێتێك و بۆ دایکمانی ڕەوانە بکەین." منیش بیرم لەوە کردەوە کە ئەمە هەلێکی باشە بۆ ئەوەی دایکم لە کارەساتەکە ئاگادار بکەین، بەلاّم ئەوەم دەزانی کە "ئەبدولکەدا" لەو بارەیەوە زۆرزانە، ئەو بوو ناچاری کردم کە بەشی ئاخاوتنەکەی خۆم لە ژوورێکی پڕ لە پیاواندا تۆمار بکەم. ئەوەشیان پێگوتم کە دەبێ چی بڵێم. لە سەرم پێویست بوو ئەوە بێژم: "وڵاتی "یەمەن" بەهەشت ئاسایە و مەرێکیشیان بۆ بەزەویدا داوین و ئاهەنگیان بۆ گێڕاوین، مەپرسە کە چەند شادمان و بەختەوەرین...!" پاش ئەوە کە بیرم دەکردەوە بە تەواوی پەستی و نائارامی دایگرتم کە چۆن ئێستا دایکم بڕوا بە هەموو ئەو شتانە دەکات کە بۆم تۆمار کردووە، ئیتر هەوڵی ئەوەشی بۆ نادرێت، لێرە دەربازمان بکات.

چەند ساڵێك پاش ئەمە دایکم بۆی گێڕامەوە، کە باوکم ئەو کاسێتەی بەردەست دەکەوێ، لە دایک می دەشارێتەوە، نەبا دایکم لە دەنگەکان و شێوەی دەربڕینماندا هەست بە شتێك بکات، بەلاّم باوکم بە گەیشتنی کاسێتەکە بە هەموو هاوڕێکانی خۆی گوت بوو، کاتێك کە "مۆ"ی برام بەوە دەزانێ کاسێتەکە لە گیرفانی باوکم دەردەهێنێ دەیبا، بۆ دایکم گوێی لێدەگرێ، کاتێك کە دایکم گوێی لە دەنگی ئێمە دەبێت، هەست بە نائارامیەك دەکات لە ئاخافتن و دەنگماندا، دایکم بە باوکم دەڵێ: ""زانا و نادیا" خراونەتە ژێر فشار و زۆرەوە." دایکم کەوتبووە گومانەوە و ویستویەتی لەوە بگات.

ئەم پیاوە "یەمەن" یانە کاتێك لە دەرەوەی وڵاتەوە بۆ "یەمەن" دەگەڕانەوە، بۆ ماوەی شەش مانگ یان ساڵێك دەمانەوە، ئەویش دەکەوتە سەر ئەوەی کە ئایا چەند

دراویان پەیدا کردووە. کاتێك کە بۆ "یەمەن" دەگەڕانەوە، هیچ کارێکیان نەبوو بیکەن، تەنیا کاریان دانیشتن و "گات" جووین بوو.

"گات" شتێکە وەك هەشیشە وایە، لە "یەمەن" دا هەموو کەسێك بە سەربەستی دەیجوێ. ئەو رووەکە لە دەشتی بەرفراوان و بەپیتدا دەڕوێ، هەر وەکو بنچکە "بەلەك" وایە. خەڵکی گوندەکان دەیکڕن یان لەو پیاوانەی دەکڕن کە بەسەر پشتی گوێدرێژەوە دەیفرۆشن. گوندیە دەوڵەمەندەکان ئەم رووەکە لە زەویە بەپیتەکاندا دەیڕوێنن، هەموو رۆژێك باشترین جۆری "گات" لە وڵاتی "ئەتیوپیا" وە بۆ "یەمەن" دەهێنرا. ئەو "گات" ەی کە لە زەوی دێمدا دەیڕوێنن گەلێك چاکترە، بەڵام هێندە بەتام نیە.

جارجارەش ژنان لە شوڵکەکەی دەکەنەوە و دەیکەن بە بابۆڵەیەك و دەیجوون و لە دەمیاندا خڕی دەکەن، پاشان دەیخەنە لایەکی گوپیانەوە، پاش ئەوەش تفی دەکەنەوە. بەو جۆرە لە هەموو شوێنێك لەسەر زەوی ئەم مەرهەمە سەوزە دەبینی کە تفیان کردۆتەوە. پاش جووینی ئەم رووەکە، ئەو کەسانە لەسەرخۆ و دەم بە پێکەنین و لە جیهانی خۆیاندا دەژین. هەروەها ئارەزووی خواردن و برسێتی کەم دەکاتەوە، خەڵکی لە کاتی مانگی رەمەزاندا بە ئێواران "گات"دەجوون، خەڵکەکە دەڵێن:"گات" خەو رەوێنە، بۆ شەوان دانیشن و بە رۆژیش، بە رۆژو دەبن و دەخەون. ئەم خەڵکانە پارەیەکی زۆر دەدەن بە کڕینی "گات" بە تایبەتی بۆ کاتی ئاهەنگ و رۆژی لەدایك بوون.

منیش ماوەیەك ئەم بەزمەم دەستدایە، بەڵام ئارەزووم لەو تامە تاڵە نەبوو، بە پێچەوانەوە خەوی لێدەخستم وەك لەوەی کە خەو رەوێن بێ. ماوەیەك وەك دەرمانی خەو بەکارم هێنا، پاشان وازم لێهانی. زۆربەی پیاوەکانیان جگەرە کێشن، وەڵێ ژنیان بە دەگمەن جگەرە دەکێشن، بەڵام زۆربەی ژنەکان دەیانتوانی جۆرە رووەکێك بەهۆی نێرگەلەوە بکێشن، ئەو رووەکە ناوی "توتنە" لە بازاڕ دەیانکڕی و پارچە پارچەیان دەکرد و دەیانخستە ناو جامولکەیەك و خەڵوزیان دەگەشاندەوە بەسەریا، ئەو کاتە توتنەکەی ژێرەوە دەسوتا، بەهۆی سۆندەیەکەوە کە لە ژێرەوە بە شووشەیەکی درێژ

کۆلە چەسپکراوە، ئاو دەکەنە ئەو شووشەیەوە، ئەو شووشەیە لەسەر سێپایەك دادەنرێ. بەهۆی سۆندەیەکەوە مژیان لێدەدا و نێرگەلەیان فت دەکرد.

چەند هەفتەیەك رابوورد "من و نادیا" دەستمان بە فێر بوونی زمانی "ئارەب"ی کرد. کاتێك لە چواردەوری پیاو مرۆڤەکان هەموویان بە زمانێك دەپەیڤن، ئەو دەمە ساناتر و زووتر فێری ئەو زمانە دەبی. ئەو دوو کچە بچووکە "شیفا و تەمەنا" یارمەتیدەرێکی باش بوون بۆ ئەم کارە، هێمایان بۆ شتەکان دەکرد و پاشان دەشیان گوت کە چی پێدەڵێن. ماوەی شەش مانگی برد تا گەیشتمە ئەوەی شتێ لە زمانەکە تێبگەم، ماوەی ساڵێکی برد تا توانیم تێبگەم و پێشی بدوێم. خۆشم خۆم فێری نووسین و خوێندنەوە کرد. "نادیا" زووتر لە من فێر بوو، لەبەر ئەوەی کە "نادیا" لە من ئازادتر بوو، دەیتوانی هەموو کاتێك بچێتە ناو گوند و تێکەڵاوی ژنان و خەڵکانی تر ببێت و لە تەکیاندا بپەیڤێت. بەڵام بۆ من بڤە بوو. زۆربەی کاتەکانم لە ماڵەوە بە تەنیا و لەگەڵ "وەردە" بووم ئەویش هێندە نە دەدوا. ئەو بێدەنگیەی "وەردە" وەڕسی نەدەکردم، بەدەست خۆم نەبوو کینم لەو ژنە دەبۆوە هەر وەك چۆن رکوکینم لە مێر دەکەی و کوڕەکانیشی دەبۆوە. بەڵام دەبێت بڵێم کە، ئەو رکوکینەم بەرامبەر ئەوان لە کاتی خۆیدا نەبوو، نەشمدەتوانی کە دەستبەرداری بم، ئەوانیش هەموویان دەیانزانی کە بۆچی وایە.

دەستوورێکی ساڵانە هەیە لە ژیانی ئەو ناوچەیەدا، هەموو ساڵێك جارێك وەرزی نەیجە (قامیش) بڕینە، ئەو نەیجانەی کە بە پڕی دەڕوێن و گەورە دەبن دەبێت بیانبڕنەوە، بۆ ئەوەی ئەوانەی کە دەمێننەوە بەهێز و خۆڕاگر بن، ئەگەر پیاوانی ئەو ناوچانە لەم وەرزەدا لە وڵات و گوندەکانی خۆیان بن، ئەوا ئەو کاتە نەیجە بڕین، دەکەوێتە ئەستۆی پیاوان، خۆ ئەگەر پیاوان لەوێ نەبوون، ئەوا پێویستە لەسەر ژنان بەم کارە هەستن، کاتێکیش ئەو لکە نەیجە سەوزانە دەبڕێن و دەستە دەکرێن، دەبێت لەبەر هەتاودا هەڵخرێن تا ئەو کاتەی بە باشی وشك دەبنەوە، پاش ئەوە ژنان ئەو نەیجانە گورزە دەکەن، واتا بە چەپکی گەورە گەورە و دەیانبەستن.

ژنان، ئەم گورزە نەیجانە دەخەنە سەر تەپڵی سەریان و بۆ ماڵەوە دەیانهێننەوە، هەندێك لەو نەیجە وشكانە بەكار دەهێنرێن بۆ دروستكردنی تەیمان بۆ پەچەی ئاژەڵ و بەربەست و هەڵاشی خانوو، هەندێكی تریشی دەخەنە ژێرخان و سەرتەنوورەوە، لەكاتی كەمبوونی دار و چڵوچێودا بەكاری دەهێنن بۆ ئاگر كردنەوە، خۆ ئەگەر ماڵێك نەیبوو یان لێیبڕا، ئەو كاتە دەبێ لە ماڵە دراوسێكانی بكڕێتەوە.

مارەكانی ئەم ناوچەیە زۆربەیان ژەهراوین، لە گەورەوە تا بچوك لە هەموو جێگایەك دەبینرێن، لە ناو گیاوگۆڵ و هەموو لك و پۆپی سەردارێكدا. كاتێك كە بیر لە مار دەكەمەوە ترس دامدەگرێت. رۆژێكیان لە گوندەوە لە پڕ هاوار هەستا، ژنێك بۆ ماڵی ئێمە هات، بە "وەردە"ی گوت: كاتێك كە براكەی لە شاری "تایز" گەڕاوەتەوە، لە رێگا لە ئۆتۆمۆبیل دابەزیوە بەرەو گوند بێتەوە، لە رێگا مارێك داویەتی بە پایەوە. ئێمەش هەموومان چووینە سەردانی ئەو كوڕە، خەڵكانێكی زۆر لەوێ بوون، كوڕەكە لەسەر جێگا كەوتبوو بە دەم ئازارەوە دەیناڵاند. لێرە دكتۆر و نەخۆشخانە نیە، بەڵام ژنان خۆیان جۆرە هەتوانێك دروستدەكەن، چەند رۆژێك پاش بەكارهێنانی ئەو مەرهەمە كوڕەكە چاك بووەوە. پاش ئەم كارەساتە ئەز هێندەی تر لە مار دەترسام. كاتی پاش نیوەڕۆژان كە دەچوومە بەر دەرگای ماڵەوە و خۆم لەبەر هەتاو هەڵدەخست، لە ترساندا چاوێكم دەكردە چوار چاو.

ژنان لێرە لە هەموو كارێكی پاكردنی گەنم و گەنمەشامی و بژار و بەباكردن و لە بێژنگداندا بەشدارن و دەبێ ئەو كارە بكەن. بێگومان بە هەویر شێلان و "چاپاتیس" دروستكردنیشەوە. "جۆرە كولێرەیەكە" ئەوە ئەركی ژنانە و دەبێت پێی هەستن. ئەم كارانە كارێكی گەلێك گرانن، بەڵام هەندێك جار پیاوانی ناو گوند مەكینەی هەویر شێلان بەكرێ دەگرن، بۆ ئەوەی ژنەكانیان نەكەونە بەر ئەو ئەركە گرانەوە. "ئەبدولكەدا" و "وەردە" هەرگیز مەكینەیان بەكرێ نەدەگرت، ئەم دوانە لە ناوچەكەدا بە پیسكەیی بەناوبانگ بوون.

كاتێك كە خێزانێكی "یەمەن"ی لەم گوندانە كیژێك دەدەن بە شوو، دەبێ ئەو بووكە بەو ئەركە گرانانە هەستێ، كە ژنە بە تەمەنەكان ناتوانن بیكەن، ئەو بووكە

دەبێت ببێتە کابانی کارکردن. هەر لەبەر ئەمەیە پیاوان بە دوای کیژۆڵەیەکی تەندروست باش و بەخۆدا دەگەڕێن، تاکو بیکرن و لە کوڕیانی مارەکەن. کیژان هەر کە کەوتنە سەرپا، هێدی، هێدی دەخرێنە ژێر باری کارکردنی ئاو کێشان، خواردن دروستکردن، گەسکدان و ئاژەڵ بەخێوکردنەوە. ئەم ژنانە هەرگیز نابێ لەمە پتر شتێکی تر بزانن، پێویستە لەسەریان کە خۆیان فێری گوێڕایەڵی و سەرنەوێتی پیاوان بکەن، یان بەلایەنی کەمەوە بەهەر شێوەیەك بێ لە پیاوەکانیان بترسن.

ئەو خێزانانەی کە تووشی من و "نادیا" بوون. لە سەرەتادا نەیانخستینە ژێر باری کارکردنەوە. ئەوان لە سەرەتاوە هەوڵیاندا هێدی، هێدی ئازادیمان لێ تاڵ و زەوت بکەن. هەر وەك چۆن ئاژەڵێك پێشان دەیکوژن، پاشان پێستەکەی بە تەواوی دەگوروون.

"جەواد" ئەوەی لە "نادیا" دەخواست، کە پۆشاکی "ئارەب" ی بپۆشێ، هەر وەك چۆن "ئەبدولکەدا" ئەوەی لە من دەخواست. بەڵام ئەو بەو جۆرەی "ئەبدولکەدا" زۆری نەدەکرد، وەك چۆن زۆر لە من کرا. "جەواد" دەیویست لەسەرخۆ ئەم کارە بکات، ئەو دەیزانی کە "نادیا" ڕێگای خۆی نازانێ، لە کۆتاییدا ئەو شتانەی کە د ەیخواست هەمووی بەسەر "نادیا" دا سەپاند و جێبەجێکرد. لەوانەیە ئەوان ئەوەیان زانیبێ کە "نادیا" وەك من وانیە و بێدەنگە، ناوێرێت بەرپەچیان بداتەوە، بەڵام "جەواد" هەر پاش ماوەیەك، زۆری لە "نادیا" کرد کە بە سەرشان ئاو بکێشێ. بەڵام ئەمانەی لای من ماوەیەکی بـرد تا کاری ئاوکێشانیان پێکردم.

ژنان لەسەر بیر بە سەتڵ و گۆزەی گەورە ئاو دەهێنن. ئەم سەتڵانە گەورە و بچوکیان هەیە. ئەمە کارێکی زۆر گرانە، تەنانەت ڕۆژی وا هەیە، دەبێت بە دەیان جار تەنەکە ئاو بکێشی. ئەم ژنانە لەگەڵ ئاوکێشاندا خۆشە بوون، هەر جارەی چواردە پازدە لیتر ئاو دەکەنە ناو گۆزەکانیانەوە و دەیخەنە سەر سەریان بە بێ ئەوەی کە دەست بە سەتڵ و گۆزەکانیانەوە بگرن. لەسەر بیرەکە سەتڵێکی لێیە بە گوریسێکەوە بەستراوە، ئەو سەتڵە بە گوریسەکەوە شۆڕ دەکرێتەوە بۆ ناو بیرەکە، کاتێك پڕدەبێت لە ئاو پاشان گوریسەکە هەڵدەکێشرێتەوە بۆ سەرەوە، ئاوی ناو سەتڵەکە دەکرێتە ناو

گۆزە و سەتڵەکانی ترەوە. من بەم شێوەیەم دەکرد، کاتێك کە گۆزەکەم لە ئاو پڕ دەکرد ئەوسا گۆزەکەم دەخستە سەر هەردوو ئەژنۆم، پاشان بەرزم دەکردەوە و دەمخستە سەر سەرم. ئەو ژنانەی تر پێویست یان بەوە نەبوو، کە باڵینە، یان شتێك بخەنە سەر سەریان بۆ ئەوەی کە گۆزەکانیان ڕاوەستێ و لە کاتی ڕۆیشتندا گۆزەکە نەلەرزێ و ئاوەکە نەڕژێ. لەگەڵ ئەوەشدا پێویستی بەوەش نەدەکرد کە دەست بە گۆزەکانی سەر سەریانەوە بگرن، بەڵام من باڵینەیەکم دەخستە سەر سەرم بۆ ئەوەی ئازاری سەرم نەگات. ئەم ژنانە هێندە راهێنانیان کردووە هەر لە تەمەنی گچکەییەوە دەنێرێن بۆ سەر بیر و ئاو کێشان.

"تەمەنا" تەمەنی تەنیا پێنج ساڵان بوو، بەڵام لەسەری پێویست بوو لە تەك ئێمەدا بە گۆزەیەکی منداڵانەوە ئاو بکێشێ.

لە سەرەتاوە بۆ من گران بوو، هەر بۆڵەم دەهات و ئاوەکە دەڕژا. "وەردە"ش کەللەیی و تووڕە دەبوو. بە "ئەبدولکەدا"ی مێردی دەگوت: "پێویستە خۆی فێر کات و ئاو نەڕژێنێت". ئێمە ئاومان لە بیری ماڵە هاوسێکانەوە دەهێنا، بۆ ئێمە هاسانتر بوو. بەڵام ئەو کاتەی کە باران بە کەمی دەباری، یان کاتی باران بڕان، کە ئاوی ناو ئەم بیرانە وشکی دەکرد، بیرێکی تر هەبوو نزیکەی بیست خولەکێك لە ئێمەوە دوور بوو، ئەو کاتە لەو بیرەوە دەستمان بە ئاوکێشان کرد. ئەم بیرە چوار دەوری بە چیمەنتۆ گیرا بوو، کاتێك کە دەچووینە سەر بیرەکە دەبایە پێڵاوەکانمان داکەندایە. یەکەمجار چوومە سەر بیری هاوسێکەمان لە سەرەتاوە زۆر سەرسام بووم لە بۆق و مێشوولە و جانەوەری تر کە لە دەوری ڕژاوی ئەو ناوە خڕببوونەوە، زۆر جار دوورمان دەخستنەوە بۆ ئەوەی بتوانین ئاو لە بیرەکە دەربێنین. لە سەرەتاوە من نەمدەوێرا و دەترسام، بیرم لەوە دەکردەوە کە پیاو ئەم ئاوە بخواتەوە دەبێ تووشی چ جۆرە نەخۆشییەك ببێ؟ بەڵام کە پیاو تینوی بوو، ناچارە ئەو ئاوە بخواتەوە. من بۆ یەکەمجار ئەو ئاوەم خواردەوە تەندروستیم تێك چوو، پاشان لەگەڵ خواردنەوە و تامەکەشی راهاتم. یەکەم کاروانەی ئاوکێشانم پێنجی بەیانی دەست پێدەکرد، ئەو کاتانەی کە ژنان لە خەو هەڵدەستن بەرچایی بەیانی ئامادە دەکەن و دەست بە

ماڵەکەدا دێنن، کە بەیانیان دەچی بۆ ئـاو هێنـان ئـەو کاتـە هێشـتا خـۆر هەڵنـەهاتووە، ئـاوی بـیر تـاکو ئـەو دەمـە هـەر سـارد و فێنکـە، پـاش ئـەوەی کـە خـۆر هەڵـهات ئـاوی بیرەکەش گەرم دەبێت، لەبەر ئەوە بە درێژایی ڕۆژ سـەر بـیر چۆڵـە کەسـی لێنیـە. زۆر جار تانکی ئاوەکانی ماڵەوەمان چۆڕ بـڕ دەبـوو، لەبـەر ئـەوە ناچـار دەبووین کـە پـاش نیـوەڕۆژان چـەند کاروانەیـەکی تریـش بکـەین. بـەڵام ئێـواران کـاتێك فێنکـی دەکـرد، جـارێکی دی دەسـتمان بـە ئاوکێشـان دەکـردەوە. ڕۆژ هـەبوو فریـای دوازدە کاروانـە ئـاو دەکەوتین.

زۆربەی کات جووت، جـووت دەچوویـن بـۆ ئـاو هێنـان، بـۆ ئـەوەی تـەنیا نـەبین و هاودەنگ بین، جار جار لەگەڵ یەکێك لە کیژە بچکۆلـەکاندا دەچـووم. جارێکیـان مـن و "خەوله"ی ژنی "مهەمەد" پێکڤـە بـۆ ئـاو هێنـان بـۆ سـەر بـیرە دوورەکـە چوویـن. لـە ناکاودا چاومان بە جانەوەرێك کەوت هەر بە "دایناسۆر"ێکی بچووك دەچـوو، نزیکـەی مەترێك درێژ و نیو مەتر بەرز بوو، بـەرەو ڕووی ئێمـە دەهـات، دەمـی کردبـۆوە، دانـە تیژەکانی دیار بوون، لە هەمان کاتدا دەی فیشکان. ئەز فـزەم لـە خـۆم بـڕی، بـەرەو دوا پاشەکشەمان کرد.

"خەولـە" پێـی گـوتم: "مەترسـە، ئـەو جانـەوەرە نـاتوانێت هێنـدەی ئێمـە خـێرا ڕاکات و شوێنمان کەوێ، بەڵام لێینزیك مەبەرەوە، ئەگـەر بێـت و شـتێك بگـەزن بـەری نـادەن تـاکو نـەیکوژن". ئـەو کاتـەی کـە ئێمـە راوەسـتابووین و سـەیریمان دەکـرد، ئــەو جانەوەرە ڕەنگی خۆی گۆڕی، هـەر لـەو کاتـەدا کچێکـی تـر لـە نـاو گونـدەوە بـەرەو لای ئێمە دەهات، لەو جانەوەرە چووە پێشـەوە و دەسـتی لێدایـە بـەردێك ویسـتی بیکوژێ، کاتێك کە بەردەکەی پێیدا کێشا، ئەم جانەوەرە پێسـتی هێنـدە ئەسـتور بـوو، بـە خـۆی نەزانی، بە فیشکە فیشك و دەمکر دنەوە شاڵاوی بۆ کچەکە دەهانی. مـاوەی نیـو کـاژێری برد تا ئەو جانەوەرەی کوشت، کاتێك کە گیانی دەرچوو کلکی کلافـە کـرد، ئـەو بایـەی کە لە خۆی کردبوو فش بۆوە. کچەکەش بە دارێك کلکەکەی بەرز کـردەوە، پاشـان ئـەو جانەوەرەی هەڵواسی. پرسیارم لە کچەکە کرد، "ئەوە چی لێدەکەی..؟" وەڵامی دایـەوە گوتی: "لەگەڵ خـۆم بـۆ ماڵـەوە دەیبەمـەوە و دەیخـۆم". ئـەو کچـە بـە بـێز لێهاتنـەوەو

موچوورکەی لەشی من پێدەکەنی. تاکو ماوەیەکیش بە سەرەو خواری بەرامبەر بە مـن رایگرت، بۆ ئەوەی تووڕەم بکات. پاشان لەسەر ڕێگاکە فڕێیدا.

ئەو چەند ساڵەی کە لە "یەمەن" بووم، بارانێکی ئەوتۆ نەباری، دوو سـاڵی خشت بە تەواوی باران بڕان بوو، بە تایبەتی لە مانگەکانی دوایی ئەم دوو ساڵەدا، بـە تـەواوی ئـاو لـە زۆربـەی ناوچـەکان بـڕاو وشـکی کـرد. خـەڵکی بـە دوای ئـاو هێنـاندا چـەندان کیلۆمـەتریان لـە دەورو پشـتی گوندەکـان تـەی دەکـرد، بـە هیـوای ئـەوەی کـە شـوێنێك بدۆزنەوە و ئاوی تێدا مابێ. لە ناو گوندیشدا زۆر بیری ئاو هەبوون، بەڵام زۆربەی ئەم بیرانەش وشـکی کـرد، ئـەو کاتـە خـەڵکی ناچـار بـوون بچـن لـە بـیری دراوسـێکانیان بـە دزییەوە ئاو بێنن، کە هێشتا ئاویلکە بوون و چۆڕ بڕ نەببوون...! لەڕاسـتیدا نـە دەبـوو ئەو کارە بکـەن، بـەڵام ئـەوە تـەنیا چارەیـەك بـوو کـە بتوانـن بژیـن. ئـەو کاتانـەی کـە خراپترین ڕۆژانی بێئاوی بوو، ئەو ئاوە لیخاوەمان لە بیرەکـان دەهێنـا و دەمـان پـاڵاوت، کـاتێك لیتەکـە دەنیشـت ئاوەکـەمان دەخـواردەوە. کانیـاوێك هـەبوو لـە نزیکـی دارسـتانەکەوە، کـەوتبووە نزیکـی گۆڕسـتانی گوندەکـەوە، کـەس ئـاوی خواردنـەوەی لەوێندەرێ نەدەهێنا. مرۆڤێك ئەو کانیاوەی بە چیمـەنتۆ چـاك کردبـوو، نـاوی خۆشـی لەسـەر چیمەنتۆکـە نووسـی بـوو، ژوورێکـی بـۆ دروسـتکردبوو، لەبەرئـەوەی ئـاوی خواردنەوە نەبوو، ئەوا جلمان تێدا دەشت. ئەگەر نەختێك جلی چڵکنـم هەبووایـە لـە ماڵەوە بە ئاوی تەنکی دەمشتن، بەڵام "وەردە" شاتەشـاتی بەسـەرما دەکـرد و دەیگـوت: "نابـێ ئـاوی خواردنـەوە بـەکارهێنی بـۆ جـل شـتن". ناچـار دەبووایـە بچمـە سـەرکانی گۆڕستان بۆ جلك شتن. چونکە کەسی تر ئەو ئاوەی بەکار نەدەهێنا هەمیشە سێڵاوەکە پڕ لە ئاو بوو.

ئاوی ئەو کانیە پاش نیوەڕۆژان گەرم دەبوو، بۆ جـل شـتن دەسـتی دەدا، بـە تـایت جلەکانم دەشت، پاشان جلە شۆراوەکانم بەسەر کەڵەکە بـەردی کانیەکـەدا هەڵدەخست، یان بۆ ماڵەوە دەمهێنانەوە، لە سەربان هەڵم دەخستن تا وشـك ببنـەوە. بـەڵام زۆربـەی جار بە تەنیا دەچوومە سەر کانی بۆ جل شتن، بـەو نیـازە کـە تۆزێـك لـە ماڵـەوە دوور کەومەوە.

من و "وەردە" پەیوەندیمان لەگەڵ یەکدا کۆك نەبوو، هەرگیز ڕێـك نەدەکـەوتین. هەموو هەوڵێکم دەدا، کـە خـۆم لـە "وەردە" لادەم، بـەڵام پـەیوەندی مـن و "بەکالـە"ی ژنی "مەهمەد" باش بوو، ڕێکدەکەوتین. کچەکانی "بەکاله" شم خۆشدەویست. زۆربەی جار لەگەڵ یەکێك لە کچەکان دەچووم بۆ سەرکانی، ڕۆژێکیـان مـن و "شـیفا" بـۆ سـەر کـانی گۆڕسـتانەکە بـۆ جـل شـتن چووین. ئـەو جـارە بڕیـارمدا کـە خــۆم لــە سـێڵاوی کانیاوەکە هەڵکێشم و تۆزێك مەلە بکەم. بە "شیفا"م گوت کـە بێدەنـگ بـێ و سـەیری چواردەور بکات. ئەو دەمە نەمدەتوانی بە "ئارەب"ی بپـەیڤم بـەڵام هـەر چۆنێـك بـوو تێمگـەیاند. بـە پێپلیکـەکاندا چوومـە خـوارەوە هـەر بـە جلەکانـەوە خـۆم کـرد بـە نـاو ئاوەکەدا و خۆم نقوم کرد، ناو ئاوەکە تاریك و نوتەك بوو، ماوەیەکی زۆر تا توانیم لـە ژێر ئاوەکە مامەوە و خۆم ڕاگرت، لەناو ئەو ئاوە فێنــك و تاریکـەدا وا خـۆم نقـوم کـرد هـەرگیز نەمدەویسـت بێمـەوە سـەرەوە. لـە کۆتــاییدا هەناســەم ناچـاری کـردم، خـۆم گەیاندەوە سەر ئاوەکە و بـە پێپلیکـەکاندا هاتمـە دەرەوە. کـاتێك کـە لـە ئاوەکـە سـەرم دەرهێنا دەبینم کە "شیفا" ترس دایگرتووە و لە خەمی مندایە. ئەو وایدەزانی کـە لـە نـاو ئاوەکـەدا ڕۆچـووم، پاشـان بـەرەو مـاڵ چووینـەوە، بـەڵام تـا ماڵـەوەش هـەر ئـاو لـە جلـەکانم دەچـۆڕا. "وەردە" دەیویسـت بزانـێ چـی ڕوویـداوە، "شـیفا" ڕووداوەکـەی بـۆ "وەردە" گێڕایەوە کە مەلەم کردووە. لە وڵاتی "یەمەن"دا ژنان بۆیان نیە مەلە بکـەن، ئـەوەیان کـرد بـە بیـانوو پێیـان گوتم: "نابـێ مەلـە بکـەی، لەبــەر ئــەوەی لــەناو ئــەو کانیاوەدا ماری ژەهراوی تێدایە".

لە پەنجەرەی ژوورەکەمەوە جاروبـار چـاوم بـە مەیمونـەکان دەکـەوت، کـە بـۆ نـاو دەشتەکەی پشت خانۆکـەمان دەهـاتن، لـەوێ گەنمـە شـامیان دەدزی، بـەڵام هـەر کـاتێك گ وندیەکان بیانزانیایە بە تفەنگ تەقەیان لێدەکردن و دەیانترساندن. ئەو ماوەیەی کـە باران نەدەباری و وشك بـوو، مەیمونـەکان شـپرزە و کێـوی ببـوون بـە ناچـاری دەهاتنـە سەر کانیەکە و ئاویان دەخـواردەوە. بـەڵام کـاتێك کـە مـرۆڤ دەهـات بـۆ سـەر کانیەکـە لێیان دەدا و ڕایان دەکرد.

جارێکیان من و "تەمەنا" بەرەو ناو گوند بەڕێوە بووین، بە دەشتەکەی پشت ماڵەوەماندا ڕەت بووین، مەیموونەکان بە هەموو لایەکدا بڵاو ببوونەوە، لەوەوبەر لە خەڵکیم بیستبوو، ئەم مەیمونانە جاروبار هێرش بۆ ژنان دێنن، ئەو کاتە ئەوەم هاتەوە بەبیردا و نەختێك ترس دایگرتم، بەڵام "تەمەنا" لەوە نەدەچوو کە بترسێ. لەبەر ئەوە بەردەوام بووین و ڕۆیشتین، کاتێك کە خەریك بووین مەیمونەکان بەجێبهێڵین "تەمەنا" بە توێکڵە مۆزێك دەستی کرد بە لاسایی کردنەوەیان و هاواری دەکرد، "مەیمونی گزگل مەیمونی گزگل".. منیش بە "تەمەنا" پێدەکەنیم، بەڵام مەیمونەکان تووڕە بوون، یەکێك لەوان رایکرد بە دوامانداو دانەکانی لێجیڕ دەکردینەوە، ئێمەش بە هاوار هاوار بە سەرەو لێژگاییەکدا بەرەو ناو گوند ڕامانکرد، پاشان مەیمونەکە گەڕایەوە و دەستی بە خواردنی گەنمەشامی کردەوە. هەندێك لەو مەیمونانە هێندە گەورە و بەخۆ بوون هێندەی گۆریلایەك دەبوون، بەڵام ئەم مەیمونانە زۆربەیان بچوك بوون، هەر هێندەی شیتەیەك دەبوون. جارێکیان بە ڕێگاوە بووم لەسەر کانی بەرەو ماڵەوە دەگەڕامەوە، لووتم بوو بە لووتی یەکێك لە مەیمونە گەورەکانەوە، ئەو مەیمونە چیچکەی کردبوو خەریکی گیا خواردن بوو، سەیری منی دەکرد، بەڵام من زۆر لەسەرخۆ بەلایدا تێپەڕیم و نەمویست وا خۆم نیشاندەم کە دەترسم.

هاوسێکانمان ئەوانەی لە خانووەکانی خۆیاندا خاوەنی بیری ئاوی خواردنەوە بوون، ئەم خێزانانە خێزانی بچوك بوون لەچاو خێزانی "ئەبدولکەدا"دا. کاتێك کە من هاتم بۆ ئەم گوندە تەنیا ژنەکانیان لە ماڵەوە مابوونەوە، ئەم ژنە دراوسێیانە هاوڕێی "وەردە" بوون، یەکێك لە ژنەکان کچێکی هەبوو لەگەڵ خۆیدا دەژیا و کوڕێکی چوارده ساڵانیشی هەبوو، لە "ئارەبی سئودی" کارێکی دۆزیبۆوە ئەوە بۆ یەکەمجار بوو ئەو کوڕە لە دەرەوەی وڵاتەکەی کاری دەسکەوێ، باوکیشیان لە "ئنگلاند" کاری دەکرد، بەڵام من هێندە ئەو خێزانەم نە دەبینی، سەردانم نەدەکردن.

ئەم ژنانە لەو ژیانەدا ماوەیەکی زۆر بە تەنیا بە جێدەهێڵران. پیاوەکانیشیان هەریەکەیان لە وڵاتێکی دیکە بوو، لەناو ئەم خێزانانەدا کچێکی تریان تێدا بوو ناوی

"هینـد" بـوو ئــەم کچــە ســەردانی منــی دەکــرد، جارێکیــان بــۆی گێڕامــەوە کــە زۆر نابەختەوەرەو دەیەوێت سەری خۆی هەلگرێ، رووەو شار خۆی دەربازکا، ئەو دەیویسـت لە ژیانێکی مۆدێرندا بژی. ئەم کچە تەمەنی بیست سـالآن بـوو، خـاوەنی شـەش منـداڵ بـوو، رۆژێکیـان "ئەبدولکـەدا" ئـەم کچـەی لای مـن بینــی، پاشــان پێــی گــوتم: "نابــێ پەیوەندیت بەو کچەوە هەبێ و لەگەڵیدا بدوێی، لەبـەر ئـەوەی ئـەو کچـە لـە نـاو دێـدا ناوبانگی باش نیە و ناوی زڕاوە".

ئەو ئافرەتە ئافرەتێکی کراوە و ڕووخۆش بوو، بەڵام زۆریان لە من کرد، کـە هیـچ جـۆرە پەیوەندیـەك و هاتوچۆیـەکم لەگـەڵ "هینـد"دا نـەبێ، پیـاوانی ئـەو گونــدە لــە پەیوەندی کچێکی وەکو ئەو و یەکێکی وەکو مـن دەترسـان. پیـاوان پـەیوەندی ئێمـەیان بە ترسێکی گەورە لەسەر خۆیان دەبینێ. لەوە دەترسان کە کاریگەریمان هـەبێ بەسـەر ژنەکانیانـەوە و گرفتـەکانیان بخەینـە پێـش چـاو و بـە ئاگایـان بهێنینــەوە، ئــەو بـیرە بخەینە ناو مێشکی ژنەکانیانــەوە، ئـەو جـۆرە پرسـیارانە لـەلای ئـەو ژنانـە دروسـتبن و بەرامبـەر بـە پیاوەکانیــان بیکــەن، کــە بۆچــی پیــاوان یاســاکانیان بــە زۆری زۆرداری بەسەریاندا سەپاندووە...؟

لەو گوندانەدا خەڵکەکان هەموو یەکتریان دەناسی، یـان زۆربـەیان خزمـی یـەکتری بوون، یان لە خوێنـەوە پشـتی یـەکتری بـوون، یـان بـە هـۆی ژن و ژنخوازییـەوە. یاسـای "قورئـان" ئـەو ڕێگایـەی پێـداون کـە خزمـان دەتوانـن لـە نێـو خۆیـاندا ژن و ژنخـوازی بکەن. زۆربەی ژنەکان لە گوندی "هۆکـایل" شـوویان کـرد بـوو بـە ئامۆزاکـانی خۆیـان. "خەولە"ی خوشــکەزای ئەبدولکـەدا، یـەکێك لـەو ژنـە بـاش و سـەلارانە بـوو کـە لـەوێ ناسـیم، ئـەو ژنـە بـە ئـامۆزای خـۆی شـووی کردبـوو. مـن لـەوە نەدەگەیشـتم ڕۆژێکیـان پرسیارم لە "ئەبدولکەدا" کرد، "ئەوە چۆن دەبێ ئەو خوشکەزایەی دراوە بـە ئـامۆزای خۆی؟" "ئەبدولکەدا" و ەڵامی دامەوە گوتی "ئێمە وا دەمانەوێ" پاشان گوتی: "ئەگـەر "ئەبدولا"ی کوڕم کچێکی ئامۆزای خۆی هەبوایە ئەو کاتە ئامۆزاکەی خۆیم بۆ دەهێنا، لە بری ئەوەی کە تۆی بۆ بهێنم".

من گومانم لەوە بوو، کچێك هەبووایە، کە بە خواستی خۆی شوو بە "ئەبدولا" بکات. ئەگەر "ئەبد ولکەدا" کچێکی لە بری من بۆ "ئەبدولا"ی کوڕی بهێنایە، ئەو کاتە دڵنیابووم کە دەبوایە بۆ مارە بڕینی ئەو بووکە دراوێکی زۆری بدایە، لەبەر ئەوەی باوکی کچەکە ئەوەی باش دەزانی، کە کچەکەی دەدا بە کوڕێك کە نەخۆشە و تەندروست باش نیە.

هیچ ژنێك لە ناو ئەو گوندانەدا بەشێوەی "من و نادیا" ئاوا زۆری لێنەکرا بوو، بەبێ هیچ ئاگاداریەکی خۆیان مارە ببڕێن و بدرێن بە شوو، ئەو کچانەی کە دەدرێن بە شوو لەو گوندانەدا تا ڕادەیەك دەتوانن سەرکێشی بکەن. هەر لەبەر ئەوەش بوو کە کارێکی زۆر نابەجێ و هەڵە بوو، کە ئاوا بەو شێوەیە زۆریان لە من و "نادیا" کرد و ئەو بە شوودانەیان بەسەردا سەپاندین. ئەم کارەی ئەوان دژی خواستی من و "نادیا" بوو، لە هەمانکاتدا دژی یاسای ئاینەکەشیان بوو، لەبەر ئەوەی لە "قورئان"دا سێ جار پرسیار لە کچەکە دەکەن لە کاتی ئاهەنگی مارەبڕیندا، لە کچەکە دەپرسن: "ئایا ئەو کوڕەت بە دڵە، دەتەوێ ببێتە هاوسەری ژیان...؟" بەڵام من و "نادیا" تەنانەت ئاهەنگێکیشیان بۆ نەکردین! ئەو کچانەی کە دەدرێن بە شوو داخوازیان هەیە، لە لایەن ماڵە باوك و ماڵە مێردەوە، باشترین پۆیلانەیان بۆ دەکرێ. لەگەڵ ئەوەشدا شتێکی سەیر نیە و ئاساییە لەناو ئەم گوندانەدا کە ژن و مێرد نە گونجان و گرفتیان هەبوو، پاش ماوەیەك بە هەر گێرمە و کێشەیەك بێ لە یەکتری جودا دەبنەوە. بەڵام من و "نادیا" ئەو دەمە هیچ شتێکمان لە بارەی ئەو شتانەی سەرەوە نەدەزانی. تەنیا ئەوە نەبێ کە ئێمە باوەڕمان بەو وتانە هەبوو کە پێیان دەوتین. کە گوایا "ئێمە مارە بڕاوی ئەو کوڕانەین و ژنی ئەو کوڕانەین...!"

بەبێ ئەوەی لەوە گەیشتبین و ئاگادار بین، کە ئەم کارە چۆن کراوە و بەم شێوەیە چۆن بە شوو دراوین...! چوار هەفتە دوای ئەوەی کە "نادیا" بۆ "یەمەن" هات، "ئەبدولکەدا" پێی گوتبوو: "لە شارۆچکەی"کەمپایس" "ریستۆرانت"ێکی کڕیوە، بەم زوانە دەیکاتەوە، بۆ ئەوەی نەختێك دراوی دەستکەوێ. لەبەر ئەوە دەبێ "وەردە"ی ژنی و "ئەبدولا"ی کوڕی لەگەڵ خۆیدا بەرێ، کە یارمەتی بدەن و لەوێ کاربکەن".

پاش ئەوەی کە چێشتخانەکەیان کردەوە، منیشیان بە زۆر ڕاپێچی ئەوێ کرد، بەڵام من سەرکێشیم لەو چوونە دەکرد، نەمدەویست لە "نادیا" دوور بکەومەوە، بە "ئەبدولکەدا"م گوت: "من نامەوێ لە تەکتاندا بێم، دەمەوێ لە نزیک "نادیا"ی خوشکمەوە بم." ئەوەم بۆ "نادیا" گێڕایەوە، "نادیا"ش زۆر تکای لەو پیاوە کرد کە دەستبەردارم ببێ و نەمبات، وەڵامی ئەو بۆ "نادیا" و من ئەوە بوو، "ئێمە دەتوانین زوو زوو یەکتری ببینین". ئەو سەرکێشی و داوایە دادی نەداین و بە زۆر لەگەڵ خۆیاندا ڕاپێچیان کردم. بەڵام ئێمە ئەوەمان چاك دەزانی کە چەند لە یەکتری دوور دەکەوینەوە، ئەوانیش ئەو کارە ناکەن هەموو جارێك ئۆتۆمۆبیل بگرن و سەردانی یەکتری بکەین. هەرواش دەرچوو، لە ماوەی شەش مانگی دوورکەوتنەوەماندا تەنیا جارێك من و "نادیا" یەکترمان بینی.

# بەشی هەفتەم
# جارێکی تریش تەنیایی

بۆ بەیانی زوو پیاوێکی خزمی "ئەبدولکەدا" بــە جێپێکـی "لاندرۆڤـێر"ەوە هـات، کە بمانگەیەنێتە شارۆچکەی "کەمپایس"، کاتێك کە سواری جێپەکە بوویــن و ڕێگامـان گرتە بەر، دڵتەنگی دایگرتم، بە تایبەتی کە بیرم لەو ناوچە و ڕێگاوبانــە وشـکوبرنگ و وەڕسکارانەدا دەکردەوە.

ئەو شارۆچکەیە دەکەوتە سەر ڕێگای سەرەکی شـاری "سـەنئا"ی پایتەختـەوە. لـە زەریا و بەندەرەکانەوە کەلوپەل دەهێنران و لەم ڕێگایەوە بۆ پایتـەخت بەڕێدەکـەوتن. خانووەکانی ئەم شارۆچکەیە و تەنانەت ئەو "ریستۆرانت"ەش، تازە دروسـتکراو بـوون. ئـەو خـانووەی کـە دەبـوو، تیـایدا بژیـن، هـەر لەگـەڵ "ریسـتۆرانت"ەکـەدا بـوو. ژووری کارکردنەکەمان کەوتبووە بەشی پشتەوە. ئەو ژوورانەی کە خۆمان تیـایدا دەژیـاین، لـە خانووەکەی "ئەبدولکەدا" کە لە گوندی "هۆکایل" هەیبوو، پاکژ تـر و کراوەتـر بـوون. "ریسـتۆرانت"ەکــەش شــوێنێکی گــەورە و بــەرفراوان بــوو، کــەوتبووە نــاو جەرگــەی کۆمەڵێك کۆمپانیا و سەرەڕێگای سەرەکیەوە، بەڵام ئەمانە شتێك نەبوون، کــە دڵـی مـن خۆش بکەن. ئەوەی کە تەنیا داخوازی و ئارەزووی من بوو، جارێکی تر بۆ لای "نادیـا" بگەڕێمەوە.

ئەم ناوچەیە تێکەڵاو بوو لە ژیانێکی مۆدێرن، و ترادیسیۆن. لۆریە گـەورەکان بـە خۆیـان و بارەکانیانــەوە لـێرە لایـان دەدا، پاشـان بـەرەو شــارەکانی وڵات بەڕێدەکــەوتن. لەگەڵ ئەوەشدا لەم وڵاتە تاکو ئێستا بۆ کەلوپەل گواستنەوە هوشتر بەکار دەهێنن.

لەسەر "ریستۆرانت"ەکەوە سێ ژووری نووستنمان هەبوو ئەم ژوورانە لە ژوورەکانی ماڵەکەی "ئەبدولکەدا" گەورەتر بوون. لێرە ئاوی پاکی خواردنەوە و ئەلەتریکمان هەبوو. پیاو لە گونددا دەبێ پاش کاژێری شەشی ئێوارێ لایتی دەستی بەکاربێنێ. ئەوە جگە لە بۆنی چڕە دووکەڵی ناو خانووەکان لە کاتی ئاگر کردنەوەدا. لەم خانووەدا دوشێکی خۆشتنی تێدا بوو، بەڵام ئاودەستەکەی ئێرەش وەکو ئەوی ماڵەوە بێکەڵك بوو. ئەم "ریستۆرانت"ە باخچەیەکی گەورەی لە بەشی پشتەوە هەبوو، بە دیوارێکی بەرز دەورە درابوو، "ئەبدولکەدا" لەم باخچەیەدا سەوزە و پەتاتە و تەماتەی دەڕواند. ئەم سەوزانە لەو گڕەوگەرمیەدا پێویستیان بە ئاودانێکی زۆر هەبوو. جاروبار بە تەنیا دەچوومە ناو ئەو باخچەیە و لێی دادەنیشتم.

گەرمای ئێرە بێ ئەندازە بوو، هەروەها مێرووله سوورکە و مێش و مێشووله بە هەموو لایەکدا فڕکە فڕکیان بوو. تەنیا چارەیەك بۆ خۆپاراستن لە مێرووله سوورە ئەوە بوو. کە بە چوار مێزیلکە لەسەر کورسی لێی دانیشی، گەرما و مێشووله و مێشومەگەز وایان لێکردم هەر لە تەپڵی سەرمەوە تا کەڵەموستی پێم لەناو ئەو جلوبەرگە "ئارەب"یانەی بەرمدا بشارمەوە. بە ناچاری سەرپۆش ببەستم و کراسی درێژ بەسەر پانتۆڵدا لەبەرکەم. بەزۆر کردیانم بە خانمێکی "یەمەن"ی.

من و "وەردە" بە درێژایی ڕۆژەکان لە ژووری چێشتلێنان لە پشتی "ریس تۆرانت"ەکە پێکەوە خەریکی کارکردن بووین، بەڵام "ئەبدولکەدا" و "ئەبدولا"ی کوڕی خەریکی بەردەستی کردنی ئەو میوانانە بوون کە بۆ نانخواردن دەهاتن. بە ڕۆژ ناو ئەو ژوورەی کە کارمان تێدا دەکرد، دەبوو بە تەنووری داخراو، لەگەڵ ئەوەشدا دەرگای ژووری کارکردنمان کەو تبووە سەر باخچەکە و بەدرێژایی ڕۆژەکان لەسەر گازی پشت بوو.

من و "وەردە" نێوانمان کۆك نەبوو، لەگەڵ یەکتری نەدەدواین، چارەی یەکتریمان نەدەویست. ڕۆژێکیان مریشکێکی بەستوی هاویشتە بەردەستم، پێی گوتم: "ئەو مریشکە لەتکە و پاشان سووری کەرەوە". منیش نەرِاندم بەسەریدا، "نایکەم".. فڕێمدایەوە بەردەستی. زۆربەی جار یەکتریمان پشتگوێ دەخست و کەسمان گوێی لەوی

ترمان نەدەگرت. بەو جۆرە بە تـەنیا مامـەوە و کەسـێك نـەبوو بیدوێنـم، لەبـەر ئـەوە کەوتمـە کەڵکەڵـەی ئـەوەوە، کـە خـۆم فـێری خوێنـدن و نووسـینی "ئـارەب"ی بکـەم. "ئەبدولکـەدا" ئـەلف و بێـی "ئـارەب"ی بـۆ هێنـام، لـە پێشـدا لـە پـەرتوکی منداڵانـەوە دەستم پێکرد، پێش ئەوەی کە بتـوانم بـە "ئـارەب"ی بپـەیڤم، بـەو جـۆرە خـۆم فـێری خوێندنـەوە و نووسـین کـرد. لەڕاسـتیدا لـە بـارەی خـۆ فێرکردنـەوە هـەوڵێکی بـاشمدا، کاتێك کە داوای ئەو شتانەم لـە "ئەبدولکـەدا" دەکـرد، هـەموو ئـەو شـتانەی بـۆ پـەیدا دەکردم، ئەمەش شتێکی نائاسایی بوو لە ناو ئەو کۆمەڵگایەدا.

ژنـەکانی نـاو ئـەو گوندانـە کەسـیان نـەیاندەزانی بنووسـن و بخوێنـەوە، سـەرجەم نەخوێندەوار بوون، پیاوان هەرگیز ڕێگای ئەوەیان پێنەدەدان، نەیاندەویست ژنـان بـەو کارە هەستن و خۆ ڕووناکبیرکەن، پیاوان ئاوایان دەبینی ئەگەر ژنان خوێندەوار بن، لـە بارەی ژیانەوە دەکەونە پرسیار و گفتوگۆوە.! ئەو کاتە پیاوان ناچـار دەبـن کـە گوێیـان لێبگرن. ئەمەش پڕ مەترسـی و ترسـناکە. فێرگـە سـەرەتاییەکانی نـاو گونـد تـەنیا بـۆ کوڕان بوو، ئەو کوڕە منداڵانـە هـەر زوو دەچوونـە فێرگـە و دەبوونـە شـاگرد، هـەر بـە هەمان شێوەی "ئنگلانـد" بـوو. ئەگـەر ژنـان و کچـانی ئـەم گوندانـە بچوونایـە بـۆ نـاو شارەکان یـان بـۆ وڵاتێکـی دەرەوە، دەبوایـە پیاوێکیـان لەتـەکدا بوایـە، بۆیـان نـەبوو بـە تـەنیا بچـن. ئـەو ژنانـە سـەریان لـە هیـچ دەرنـــەدەکرد بـــەڵام پیـــاوێکیش بـــیری لـــەوە نەدەکردەوە کە ژنان لەگەڵ خۆیاندا بۆ شوێنان بەرن.

کارە ئاسایی و ڕۆتینیەکان، هەموو ڕۆژێك دووبـارە دەبوونـەوە، "وەردە" بـەیانیان مەنجەڵێکی گەورەی چا دەکوڵاند، بۆ ئەو میوانانەی کە دەهاتن بەرچایی بخـۆن، منیـش خەریکی پاککردنەوە دەبووم. "ئەبدولکەدا"ش، هێلکەو نۆکـی زۆری دەکوڵانـد. خـەڵکی لە شوێنانی ترەوە دەهاتن دەیانکڕی و لەگەڵ خۆیـان دەیانـبرد. کوڕێکـی تریـش هـەبوو بەیانیان دەهات لە دەرەوەی "ڕیستۆرانت"ەکە ناوساجی لە ناو تـاوەدا سـوور دەکـردەوە، ئەو خەڵکانەی کە ناوساجیان دەکڕی پارەکەیان یەکسەری بـە کوڕەکـە دەدا، پاشـان ئـەو کوڕە هەموو پارەکەی بە خایەو مایەوە دەکردە دەسـتی "ئەبدولکـەدا"وە، ئـەو کـوڕەش کۆتایی هەفتەکان مووچەی خۆی وەردەگرت.

بۆ کاتی نانخواردنی نیوەڕوانیش پەتاتە و برنج و گۆشتمان لێدەنا، بۆ ئێوارانیش ژەمێکی تر خواردنی سڤك ئامادە دەکرا. لە شەشی ئێوارێوە تا یازدەی شەو "ڕیستۆرانت"ەکەمان خواردنی هەبوو. ئێواران تەنیا پیاوان بۆ نانخواردن دەهاتن، چاو قاوەشیان بەسەردا دەکرد، دوای ئەوە دەستیان بە یاری کاغەز دەکرد، یان "ئەبدولکەدا" لەگەڵیاندا دەکەوتە گفتوگۆوە. لەسەر هەموومان پێویست بوو، کە یارمەتی یەکتری بدەین لە کاتی چێشتلێنان و خواردن ئامادە کردندا. "ئەبدولکەدا" شەوانە جاروجار دەچووە بەر دەرگای "ریستورانت"ەکە، لەگەڵ پیاواندا دەستی بە ئاخافتن دەکرد. منو"وەردە"ی لە پشتەوە جێدەهێشت، ئێمەش هەر خەریکی ئامادەکردنی خواردن بووین.

کردبووم بە پیشە پێش ئەوەی کە"ریستۆرانت"ەکە داخەین، شەوانە زووتر دەستم لە کار هەڵدەگرتو دەچوومە ژوورەکەی خۆمو دەخەوتم، لەبەر ئەوەی کە هیچ کارێك نەدەما بیکەم.

ژیان بۆ ژنان لەم جۆرە ولأتانەی وەکو"یەمەن"دا ژیانێکی نائاسودەیی و پڕخەمو ژانو بێکۆتاییە. کاتێك ژنان هیچ کارێك نابێ کە بیکەن، ئەو دەمە کار دەبێتە دانیشتنو هەناسە ساردیو بیرکردنەوە. ژنان کە هیچ جۆرە پشتگیری و هاندانو کۆمەکیان ناکرێ، بێگومان لەو ژیانەدا هیچ ڕوونادا و ژیان لە شوێنی خۆیدا لەرزۆك دەبێ. تەنیا یەك پەیوەندی هەیە ئەویش ئەوەیە، ئەو ژنانەی کە هەمان چارەنووسیان هەیە، دەردی دڵ و ژیانی پڕ چەرمەسەری خۆیان بۆ یەکتری دەگێڕنەوە. ئەمە تەنیا شانۆ نامەی مێژوویی ژنانە لە ولأتی"یەمەن"دا بۆ ئەوانەش کە هەمان ئاستەنگو دەردی سەریان هەیە. ئەم ژنانە گەلێك تینوو چاوەڕێی دەنگوباسن، لە هەمانکاتدا ساو یلکەنو بە وتەی درۆ زوو فریو دەخۆنو باوەڕ دەکەن.

لە پەنجەرەی ژووری نووستنەکەمەوە تەنیا دیوارێکی بەرد دیار بوو، کە باخچەکەی لە"ریستۆرانت"ەکە جودا دەکردەوە، بێگومان لە دیوی دەریشەوە کەس ژوورەکەی ئێمەی نەدەبینی. لەبەر ئەوە ئەو ژوورە هەر لە بەندیخانە دەچوو.

پیاوان لەم کۆمەڵگایەدا ئـازادن کـەی بچنـە دەرەوەو تێکـەڵاوی یـەکتری بـبن، هـەر کاتێکیش بخوازن بە ئۆتۆمۆبێل دەگەڕێن‌و بای باڵی خۆیان دەدەن، ئـەوە دەرەوەی وڵات لەو لاوە بوەستێ. بە کورتی خۆیان سەر پشکن. بەڵام پێش بـە ژنـان و مێینـە گـیراوەو ماڵەوەیان بۆ کر اوەتە زیندان، ژنان بواری ئەوەیان نیە بۆ هیچ شوێنێك بچن. ڕۆژەکـان بێ کۆتایی‌و وەڕسکارن. تەنیا شتێك کەخۆم پێوە خەریك دەکرد ئەو "تەیپ"ە(مسجل) بچکۆلانەیـە بـوو کـە کـاتی خـۆی لەگـەڵ چـەند کاسـێتێکی گۆرانیـدا لــە"ئنگلانــد"ەوە هێنابوومن.

لەڕاستیدا تەنها لەمەیاندا بەخت یارم بوو، کە "ئەبدولکەدا" وازی لێهێنا بووم کە ئەو "تەیپ" و کاسێتی گۆرانیانەی لێزەوت نەکردم. ئەو هەمیشە پێـی دەگـوتم: "نابـێ ئەو شتانە لات بمێنێتەوە، کە بۆن و یادگاری "ئنگلاند"یان پێوەیە". ئەو لەو بڕوایـەدا بوو، ئەگەر بێت و ئەو شتانەم لـێ زەوت بکات کە یادگـاری و بۆنـی ژیـانی "ئنگلانـد"ی پێوەیە، ئەوا ئەو کاتە زووتر ماڵی و دەستەمۆ و گوێڕایەڵی ئەو ژیانەی ئەوان دەبم کـە بەسەرمدا سەپاندوویانە. ئیتر دەستبەرداری هەموو هەوڵ و کۆششێکی خۆ دەربازکردن دەبم.

ڕۆژێکیـان "ئەبدولکــەدا" خــۆی کــرد بــە ژوورەکــەمدا و دەســتی بــە پشــکنینی جانتاکەم کرد.

ئەز پرسیارم لێکرد. "چی دەکەی..؟ بە دوای چیدا دەگەڕێی؟"

بە تووڕەییەوە گوتی: "ئا ئەمانە."... ئەو پۆسکارت و وێنانەی هێنایە دەرەوە کـە وێنـەی دایکـم، خوشــك و براکــان و هاوڕێکــانم بــوون، کــە کــاتی خــۆی لەگــەڵ خــۆم هێنابوومن. هەر کاتێك کە بە تەنیا دەبووم ئەو وێنە و پۆستکارتانەم دەهێنانە دەرەوە و سەیرم دەکردن و ئاهێك بە دەروونمدا دەهات.

بە "ئەبدولکەدا"م گـوت: "تکـات لێدەکـەم ئەوانـە هـی خۆمـن و وازیـان لێبێنـە و بمدەرەوە."

گوتی: "نا" بۆ ئەوەی دەستم نەیانگاتێ، دەستی بە بەرزی ڕاگرت، گوتی: "ئەمانــە زیانت پێدەگەیەنن و دڵخۆشت ناکەن، تۆ نابێ شتێکت لابـێ کـە یادگـاری ژیـانی کۆنتـی تیادایە، ئێستا خێزانی تۆ ئێمەین و ژیانی تۆ لێرەیە."

ئەز خۆم ڕاوەشاند و پەلاماری دەستیم دا، بۆ ئەوەی دەســتم بگاتــە وێنــەکان و لـە دەستی وەرگرم، بەڵام ئەو وێنەکانی لە دەسـتیدا گرمۆڵـە کـرد و پاشـان دڕانـدنـی، دوای ئــەوە وێنــەکانی بــە دڕاوی دایــەوە دەســتم. "هــا فڕێیــاندەرە نــاو ئــەو ئــاگرەوە و بیانسوتێنە."

پێم گوت: "زۆرم بـۆ مەهێنـە"... بـە توورەییـەوە گوتـی: "دەڵێـم فڕێیـانـدە"... و زرمـەی لێهەســتاندم، بــە پڕتــاو خــۆم گــەیانده چێشــتخانەکە، وێنــە پارچــە پارچــە کراوەکانم فڕێدایە ناو ئاگردانی ئاگرەکەوە. هـەموو ڕۆژێـك چـاوەڕوانی ئـەوە بـووم هـا ئێســتا نــا، تۆزێکــی تــر، "ئەبدولکــەدا" دێ و "تــەیپ" و کاســێتەکانم لێدەســتێنێ و دەیانشکێنێ، بەڵام هەرگیز ئەو کارەی نەکرد.

پاش ئەوەی کە مرۆڤەکان نانیان دەخـوارد و بـە تـەواوی "ریسـتۆرانت"ەکـە چـۆڵ دەبوو، من و "وەردە" خەریکی پاککردنەوەی "ڕیستۆرانت"ەکە دەبووین، یـان خـەریکی شتنی کەلوپەلە چەور و پیسەکان دەبوویـن. کـاتێك کـە "ریسـتۆرانت"ەکـە کـراوە بـوو، پیاوان لەوێ نانیان دەخوارد، ئێمە بۆمان نەبوو بچینە ناو "ریستۆرانت"ەکەوە. کـاتێك "ئەبدولکـەدا" بـۆ شـتێك یـان پێویسـتیەك بـۆ لای ئێمـە دەهـات، بەسـەر پێیـەوە، ئــەو شتانەی بۆ دەگێڕاینەوە کـە چـی ڕوویـانداوە کـێ هـاتووە و چـۆن کـراوەو چـۆن چـووە. دەیگـوت: "لەوانەیـە ئـەوەیان گەشـتیارێکی "ئـامریکی" یـان "ئاڵمـانی" بووبێـت،" بـەم جۆرە هەواڵەکانی دەرەوەمان دەبیست. بەڵام ئێمـەی ژن خزێـنراوی کونـی ژوورەوە، لـە ناو ئەو مێش و مەگەز و گەرمایەدا دەستەمۆ کرابووین.

ڕۆژێکیان "ئەبدولکەدا" پرسیاری لێکردم، "زانا دەمەوێت ڕۆژێك پشوو وەرگری و بۆ ســەر زەریـا بچـین..!؟" مـن بـڕوام نـەدەکرد، وامدەزانـی گاڵتـەم پێدەکـات، گـوتم: ... "نا." چاوەڕێی ئەوە بووم لە وەڵامەکەم تووڕەبێ و لێمبدا، کــەچی وا نــەبوو، پرسـیاری

له "وەردە"ی ژنیشی کـرد، "دەتـەوێت لـە تـەکماندا بێـی..؟" "وەردە" وەڵامـی دایـەوە. "نا." بەڵام "ئەبدولکەدا" زۆری لێکرد.

لەبەر ئـەوەی کـە لـە "کامپـایس" نیـوەڕۆژان پلـەی گـەرما دەگەیشـتە 50 پلـە، بـۆ ڕۆژی دوایـی بـەیانی زوو سـواری ئۆتۆمۆبیـل بوویـن. ئـەو ڕۆژە "ریسـتۆرانت"ەکـەمان داخست، بەرەو زەریای سـوور سـوار بوویـن. "ئـەبدولا"ی بـە نـاو مێردیشـم لەگـەڵماندا هات. ماوەی ڕێگاکە بۆ سەر ڕۆخانـەی زەریـا، تـەنیا 20 خولـەك بـوو. بـە درێژایـی ئـەم ڕێگایە بێ ابانێکی لماوی چۆڵوهۆڵ بوو، بە درێژایی ڕێگاکە ستونی تەلەفۆن چـەقێنراو و بـەرەو ڕۆخانـەی زەریاکـە ڕێگاکـە ئەسـفلت کـراو بـوو، ئـەم ڕێگایـە لـە لایـەن وڵاتـانی بیانیەوە دروستکرا بوو، بەڵام نیوەی ڕێگاکـە چـاڵوچۆڵ و نـاخۆش بـوو. ئـەم ناوچەیـە "تەلهـەما"یـان پێدەگـوت، تـا چـاو بڕکـات بـە درێژایـی چـەندان کیلۆمـەتر ناوچەیـەکی تەخت و بیابان بوو.

لـەم ناوچەیـەدا ژیـان بـەرچاو نەدەکـەوت، بـــەڵام کـاتێك کـە بـــە ئۆتۆمۆبیلەکـە تێدەپەڕین چاومان بە چەند خانوویـەکی لەبـەرد دروسـتکراوی داتـەپیو کـەوت، کـەس لـەو خانووانـەدا نـە دەژیـان و چۆڵکـرا بـوون، ئـەو ڕۆخانـەی زەریایـە، کـە ئێمـە بـۆی چووین، کوتومت ئەو بەهەشتە بوو، پێش ئەوەی کە بۆ "یەمـەن"مـان بێنـن، بـاوکم و هاوڕێکـانی بـۆ مـن و "نادیـا"یـان پەسـنکرد. ئـەو ڕۆخانـەی زەریایـە بـوو کـە بـە داری خورما و سەوزایی رازابۆوە، ئەم گەشتەم یەکەم گەشت بوو، بە درێژایی ئەو ساڵانە، کە لە وڵاتی "یەمەن" کردم.

ئەم شوێنە بەوە دەچوو کە کەس پێش ئێمە پەییان پێنەبردبێ، جگە لە هەندێك پیاوی پیر بە خۆیان و بەلەمە بچوکەکانیانەوە خەریکی راوەماسـی بـوون، ئـەم پیاوانـە بـەوە دەچـوون، کـە هـەر لـە سـەرەتای پێکهاتنی ئـەم ڕۆخانـە و بیابانـەوە لـێرە پـەیدا بووبـن. کـاتێك کـە گەیشـتین لـە ئۆتۆمۆبیلەکـە دابـەزین، سـەیرانەکەمان بـە تـەواوی سـەیرانی ماڵـە "ئـارەب"ێـك بـوو. ئـەو لـە وردە جوانـە، زوو زوو بـە بـاوە دەچـووە چاومانەوە.

"ئەبدولکەدا" پرسیاری لێکردم: "مەلە دەکەی..؟" منیش بە زەردەخەنەیەکەوە سەیرێکم کرد، لە سەرەتادا نەمویرا بڵێم "ئا" وامدەزانی کە دەیەوێت دڵم بخوێنێتەوە، هەر کە گوتم "ئا".. پام ببێ بە تەڵەوە و زرمەم لێهەستێنێ، لەبەر ئەوەی کە پۆشاکی ژنە "ئارەب"یم لەبەردا بوو، کراسێکی ئاودامانی درێژ، پانتۆڵ لە ژێرەوە، سەرپۆشێك، سەروو بسکم داپۆشرابوو، "ئەبدولکەدا" گوتی: "ئەگەر ئێستا دەخوازی دەتوانی بە جلەکانتەوە خۆ بخەیتە ناو ئەو ئاوەوە و مەلە بکەی، خەمناکا کەسی بیانی لێنیە." پێویستی بەوە نەدەکرد کە "ئەبدولکەدا" ئەو پرسیارە دووبارە بکاتەوە، خێرا سۆلەکانم لە پام داکەند و بەرەو ئاوەکە چووم، خۆم هەڵدایە ناوەوە، بە مەلە هێندە دوور کەوتمەوە خۆم گەیاندە قوڵایی، ئەو جلە "ئارەب"یانە لە بەرمدا بوون بە پەڕەشووت دەچوون. بۆ ئەوەی بتوانم مەلە بکەم خۆم گەیاندە ناوەڕاستی ئاوەکە، سەرپۆشەکەی سەرم لە ناو ئەو ئاوە خوێیاوکەدا لە پشتەوە خشە و گڤەی دەهات. کاتێك کە لە "ئنگلاند" بووم مەلەم باش دەزانی، لە کێبەرکێیەکدا مەدالیای برۆنزم وەرگرت، هەروەها لە کێبەرکێی فێرگەکاندا مەدالیایەکی زێڕم وەرگرت، ئەو دەمە زۆر ئارەزووم لە مەلەکردن هەبوو. بەرەو ئەو تیشکە دەستم بە مەلە کردن کرد کە بە ئاسۆیی لەسەر پانتایی زەریا بریسکەی دەهات، وزە و ئارەزوویەکی باشم هەبوو دەمتوانی دەریاکە بە مەلە تەیکەم و نەوەستم، تاکو دەگەمە سنووری ئەفریکا. "ئەبدولکەدا" گلاراوی پێکەوتبوو، نەیدەزانی چی بکات، هەر لە سووسەی ئەوەدا بوو کە چی دەکەم، لە ناکاوێکدا هاواری لێهەستا،" بگەڕێرەوە، دوور مەکەوە. "پێدەچوو دڵمی خوێندبێتەوە، جارێکی تر هاواری کردەوە. "بگەڕێرەوە ئەو ناوە نەهەنگی تیادایە."

من لە "ئنگلاند" فلیمی نەهەنگم بینی بوو، ئەو ترسە بەس بوو بۆ ئەوەی نەوێرم لەوە پتر بە مەلەکردن دوورکەومەوە، ناچار بەرەو ڕۆخانەی زەریاکە گەڕامەوە، لە ئاوەکە هاتمەدەرێ لەسەر لمەکە لەبەر ئەو خۆرەتاو و گڕەو گەرما بەتینەدا دانیشتم، جلەکانی بەرم لە ماوەی چەند خولەکێکدا وشك بۆوە، لەسەر لمەکە یەك تەختە بە جلەکانەوە خۆمدا بەسەر زەویەکەدا، لەو کاتەدا کە پاڵکەوت بووم

هەستم کرد کە شتێك بە گرمۆڵەیی لە ژێرمایە، کە لەکەم هەڵدایەوە، چەند شووشـەی بـەتاڵی بـیرە بـوون، پێدەچوو کـە چـەند پیـاوێك لـە کـاتی تـاریکی ئێـوارەدا خۆیـان گەیاندبێتە ئەم ڕۆخانەی زەریایە و بە دزیەوە دەستیان کردبێ بە بیرە خواردنەوە. لـە "یەمەن"دا خواردنەوەی کهول یاساخە.

بـە هاتنمـان بـۆ سـەر ڕۆخانـەی زەریاکـە، کـابرای شـۆفێر بـەجێی هێشـتین، پـاش ئـەوەی کـە لـە مەلـەکردن بوومـەوە، نیـو کـاژێرێك لەسـەر ئـەو لـە خۆمـدا بـە زەویـدا، ئۆتۆمۆبیلەکە گەڕایەوە، بە ناچاری خۆمان تێفرێدا و بەرەو "ریستۆرانت" گەڕاینـەوە. ئەمەش یەکەمجار و دوواجارم بوو لە وڵاتی "یەمەن"دا کە بۆ سەر زەریا بچم.

بەیانیەکیان هەر کـە لـە خـەو بێـدار بوومـەوە، تایـەکی بـەهێز دایگـرتم، سـنگ و مەمکیشم دەیەشان، هەرچەند توانام دایە خۆم هەستم، بەڵام چـاوم ڕێشـکە و پێشـکەی دەکرد و سەرم گێژ و توانام نەبوو، خۆم دایەوە بەسەر جێگەکەمدا، بە "ئەبدولکەدا"م ڕاگەیاند کە زۆر نەخۆشم، ئـەو گوێـی نـەدامێ گوتـی: "هیـچ نیـە ئـەو گەرمایـە گێـژی کردووی". ئەو ڕۆژە هێندە بێتوانـا بـووم نـەمدەتوانی لەسـەر جێگەکـەم راسـت بمـەوە، دوو ڕۆژ پـاش ئـەوە، زۆر ڕشـامەوە. "ئەبدولکـەدا" ئەمـەی بەڕاسـت وەرگـرت و خـەمی لێهات، ئەمەندە بێتوانا بووم ، تەنانەت دڵم هیچی نەدەبرد و نەمدەتوانی هیچ بخۆم، وا هەستم دەکرد کە مردنم نزیکە، کـە بـیرم لـە مـردن دەکـردەوە گـەلێك دڵشـاد دەبـووم، تەنیا ڕێگایەك بوو کە لـە دۆزەخـی "یەمـەن" ڕزگـارم کـات. لەڕاسـتیدا لـە ژیـان بـێزار بووم، ئاواتم بە مردن دەخواست.

وا بـزانم "ئەبدولکـەدا" زۆر لـەوە ترسـابوو کـە بمـرم، لەبـەر ئـەوە، پێـی گـوتم: "ناردوومـە بـە دوای دکتـۆردا." لـە وڵاتـی "یەمـەن"دا دکتـۆر زۆر کەمـە، بـەڵام لـە "کامپایس" دکتۆرێکی "سۆدان"ی هەبوو دەیتوانی بە "ئنگلیز"ی بپەیڤێ. ئەو دکتۆرە هات و سەیری کـردم، گوتـی: "زانـا تووشـی مـەلاریا بـووی." پاشـان دەرزیـەکی لێـدام و دەرمانی دامێ. بۆ ماوەی سێ ڕۆژ، ئەو دکتـۆرە، ڕۆژی دوو جـار دەهـات دەرزی لێـدەدام، بەو جۆرە وردە وردە هاتمەوە سەرخۆم و چاك بوومەوە.

جارێکی تر دەستم بە کاری گەسکدان و خواردن دروستکردن کردەوە. بەڵام باری تەندروستیم لەو گەرمی و گڕەی شارۆچکەی "کامپایس"دا هەر تەواو نەبوو. جارێکی تریش تووشی مەلاریا بوومەوە. ئەم جارەیان دکتۆر نەبوو، سەیرم بکات، یان دەرمانم بداتێ و دەرزیم لێبدات، لەبەر ئەوە پێویست بوو لە سەرم، ئارام و خۆ ڕاگرمەوە. ئەمجارە ژنان شیری "هوشتر" یان دامێ کە بیخۆمەوە. ئەو ژنانە بڕوایان وابوو، تەنیا دەرمانێك شیری هوشترە و زوو چاك دەبمەوە. شیری هوشتر بە ئاسانی دەست نەدەکەوت، بەڵام تا بڵێی تامێکی خۆشی هەیە.

"مهەمەد"ی کوڕی "ئەبدولکەدا" جاروبار لە گوندی "هۆکایل"ەوە دەهات، سەردانی دایك و بابی دەکرد، بۆ ماوەیەك گفتوگۆی لەگەڵ مندا دەکرد. لەڕاستیدا ئەو کاتانەی کە ئەو یان یەکێکی تر بۆ لامان دەهات، کاتێکی خۆش بوو، هەر چەند ماوەی سەردانەکەشیان کورت بوایە. من هەمیشە بە "مهەمەد"م دەگوت: "بەڵکو کارێکی وا بکەیت بەرەو گوندم بەریتەوە، بۆ ئەوەی نزیکی "نادیا"ی خوشکم بم." بەڵام ئەو بە شان هەڵتەکاندن وەڵامی دەدامەوە و دەیگوت: "من ناتوانم هیچ بکەم، باوکم بڕیار دەدا."

ڕۆژێکی دوا نیوەڕۆژ لەسەر کورسیەك لە پشتی "ریستۆرانت"ەکەوە دانیشتبووم، وەك هەموو جارێك کەوتبوومە زەریای بیرکردنەوەوە، لە ناکاو "ئەبدولکەدا" بانگی کردم، گوتی: ""زانا"، "نادیا" هاتووە." لە سەرەتادا بڕوام بە وتەکەی نەکرد، بەڵام گوێم لە تەپەی پێیەك بوو، بە خێرایی و هەڵەداوان دەهات،" "کچێ ئەوە لەگەڵ تۆم نیە..؟ "نادیا"ی خوشکت هاتووە." "نادیا" هاتە ژوورەوە دەستێك جلوبەرگی باوی ژنە "ئارەب"ی لەبەردا بوو، ئەوە یەکەمجار بوو، کە "نادیا" بەو جلوبەرگانەوە ببینم، دیمەنێکی سەیری لەبەرچاوم هەبوو، بەڵام دەبێ دیمەنی منیش بە هەمان شێوە لەبەر چاوی "نادیا". سەیر بوو بێ، بە بینینی "نادیا" گەلێك دڵشاد و گەشامەوە.

هەردووکمان چووینە ژوورەکەی خۆم دانیشتین، بۆ ئەوەی لەوە بدوێین کە چیمان بەسەرهاتووە، نە من نە "نادیا"ش لە لایەن دایکمەوە نامەیەکمان بە دەست

نەگەیشت بوو. بۆ "نادیا"م گێڕایەوە کە چۆن "ئەبدولکەدا" وێنەکانی لێسەندووم و دڕاندونی: "نادیا" گوتی: "گوێ مەدەرێ من لەماڵەوە وێنەم هەیە دەتدەمێ."

پاش هەندێك وتووێژ و سکاڵا و گریان "نادیا" گێڕایەوە کە "جەواد" زۆری لێکردووە دەبێ دەستکات بە ئاوکێشان، لە هەمانکاتدا "چاپاتیس" و کولێرە بە تەنوور دروستبکات. "نادیا" دەستەکانی نیشاندام کە چۆن سووتا بوون، جێگای سووتاویەکان بە دەستەکانیەوە دیاربوون. هەروەها جێگای گەزینی ئەو مێشوولانەی نیشاندام، کە لە تاو خورانەدن بە چڕنوك برینداری کردبوون، تاکو ماوەی چەند ساڵێك ئەو جێگا سووتاویانە بە دەستەکانیەوە هەر دیاربوون. ئەوەشی بۆ گێڕامەوە کە چۆن "جەواد" بە شەق لێیداوە، لەسەر ئەوەی کە "نادیا" سەرکێشی ئەوەی کردووە کە لەگەڵ "مهەمەد" لەسەر جێگا پێکەوە بخەون، بەڵام "سەلامە"ی ژنی "جەواد" بە هانای "نادیا"وە هاتووە و دڵی داوەتەوە. من بە "نادیا"م گوت: "چار نیە دەبێ خۆ ڕاگریی، ڕۆژێك دێ، لەم مەرگەساتە ڕزگارمان دەبێ."

لەڕاستیدا من و "نادیا" لە سەرەتاوە وای بۆ چووین، کە ئەو هاتووە بۆ ماوەی چەند ڕۆژێك لێرە لەلای من بمێنێتەوە، بەڵام لای ئێواری "جەواد" فەرمانی بە "نادیا"دا، کە خۆی ئامادە بکا بەرەو ماڵ دەبنەوە. "نادیا" هەر چەند تکای لە "جەواد" کرد، کە ڕێگای پێبدا بۆ ماوەی چەند ڕۆژێك لەلای من بمێنێتەوە. بەڵام "ئەبدولکەدا" بە تووڕەییەوە پێی گوتم: "سەیری "نادیا"ی خوشکت بکە چەند بەختەوەرە." منیش پێم گوت: "تۆ چی لەبارەی "نادیا"وە دەزانی، چۆن دەزانی کە بەختەوەرە، تۆ دەزانی کە "نادیا" چۆن بیردەکاتەوە..؟" "ئەبدولکەدا" شانێکی هەڵتەکاند و گوتی: "دەزانم."

منیش بە تووڕەییەوە گوتم: "نا "نادیا" بەختەوەر نیە، ئەویش وەك من ڕکوکینی لە هەمووتانە."

ئەم پیاوە زۆردارانە بە هیچ جۆرێك بواری ئەوەیان نەدەداین کە من و "نادیا" پێکەوە بین، ئەوان وا هەستیان دەکرد، من کاریگەری لەسەر "نادیا" دادەنێم. ئەم سەردانەی "نادیا" بۆ "کامپایس" یەکەمجار و دوا جاریش بوو.

چەند ڕۆژ ێك پاش سەردانەكەی "نادیا" پیاوێكی خزمی "وەردە" هات و سەردانی كردین، بە "وەردە" و "ئەبدولكەدا"ی ڕاگەیاند، ژنە دراوسێكەیان كە هاوڕێیەكی نزیكی "وەردە" بوو، لەناو گوند هەورە بروسكە لێیداوە و مردووە. "ئەبدولكەدا" ئەو هەواڵەی بە منیش ڕاگەیاند و گوتی: "پێویستە هەر ئێستا خۆتان ئامادە بكەن، دەبێ بۆ ناو گوند بگەڕێینەوە، فریای ناشتن و پرسەی ئەو ژنە بكەوین." منیش دەستبەجێ خۆم ئامادە كرد. ئەمە بۆ یەكەمجار بوو پەچە بگرمەوە، ئەوەندە خۆشە ببووم گوێم نەدەدایە ئەم مرۆڤە زۆردارانە، من ئاواتم ئەوە بوو بۆ ناو گوند بگەڕێمەوە و چاوم بە "نادیا" بكەوێ، ئەگەر چی بۆ ماوەی چەند كاژێرێكیش بێت، ئیتر هیچ شتێكی ترم بەلاوە گرنگ نەبوو. لەگەڵ ئەوانی تردا سواری ئۆتۆمۆبیل بووین، ئەو كاتەی كە سواری ئۆتۆمۆبیلەكە بووم، وام هەستكرد كە ئەمانە واتێدەگەن بەم جلوبەرگانەوە زۆر لەسەر خۆ كردوویانم بە ژنێكی "ئارەب" ئاسایی، ئیتر ئەوە بەسەر چوو، كە شەڕی ئەو كچە "ئنگلیز"ە بكەن، كە بە تەنوورەی كورت و بسكی ڕووتەوە بینی بوویان، ئێستا لە ڕێگای ئەمانەوە لە جیهان دابڕاو ونكراوم.

شەوێكی درەنگ گەیشتینە ناو گوند. "وەردە" هەر كە لە ئۆتۆمبیلەكە دابەزی یەكسەر بەرەو ماڵی ژنە دراوسێكەیان بە شیوەن و گریان ڕێگای گرتەبەر و منیش بە دوایدا، كە لە ماڵە دراوسێكە نزیك بووینەوە خۆمان كرد بە ژووردا شینوشەپۆڕ و لاواندنەوە و لە خۆدان بوو، خانووەكە پڕ بوو لە ژنان، لە ژوورەوە بۆ مردووەكەیان دەلاواندەوە، ئەو شەوە تاكو بەیانی ئەم بەزمی سەرمۆنی گریانە بوو.

بۆ بەیانی تەرمی ژنەكە ئامادەكرا و لە لایەن پیاوانەوە بەرەو گۆڕستان بەڕێ كرا تا بە خاكی بسپێرن، ئێمەی ژنان بۆمان نەبوو لە ناشتنی تەرمی ژنەكەدا بەشدار بین، ئەوەندە نەبێ كە لە پەنجەرەی ماڵەكەیانەوە گۆڕستانەكە دیار بوو، پیاوێكی پیری گوندەكە نزای لەسەر گۆڕی كردوو خوێند و پاشان نوێژیان لەسەر گۆڕەكە دابەست.

ئەو ڕۆژە كەس نەدەپەرژایە سەر من و سەرنجیان لەسەر من نەبوو، لەبەر ئەوە بە هەلم زانی هاتمە دەرەوە و چوومەوە بۆ خانووەكەی لای خۆمان و بەرەو ژوورەكەی خۆم ڕۆیشتم، بە گەیشتنم بۆ ژوورەكەی خۆم گەلێك دڵشاد بووم. پاش ئەو چەند

مانگ دوور کەوتنەوەیە، بۆ یەکەمجار بوو بۆ ژوورەکەی خۆم بگەڕێمەوە، لەبەر ئەوەی کە هەموو شتەکانم لێرەوە دەستی پێکرد بوو، هەستم بە جۆرە ئارامیەك دەکرد. لە ژوورەکەمدا نە دۆشەك، نە بەتانی لێنەبوو، هەر کە چاوم بە "بەکالە" و "تەمەنا و شیفا" کەوت دەستم بە گریان کرد. زۆر بەوە دڵشاد بووم. کە جارێکی تر ئەمانم بینیەوە، هەر ئەمانیش بوون لە سەرەتاوە فێری زمانی "ئارەب"یان کردم، بەڵام ئێستا دەتوانم باشتر "ئارەب"ی بپەیڤێم و چاکتریش لێیان تێبگەم. ماوەیەك پێکەوە دانیشتین و گفتوگۆمان کرد. پێش ئەوەی رابکشێم، بە گریانەوە بە "بەکالە"م گوت: "دەمەوێ بۆ ئێرە بگەڕێمەوە." ئەو نەیدەزانی چی بڵێ، لە هەمان کاتدا هیچی لە دەست نەدەهات، ئەویش بە ناچاری وەك من دەگریا. کە بەراوردی "بەکالە" و "وەردە"م دەکرد، دوو مرۆڤی گەلێك جوودا بوون. پاشان "بەکالە" بەتانیەك و سەرینێکی بۆ هێنام. ئەو ڕۆژە "نادیا" زانیبووی، کە ئێمە بۆ پرسەی ئەو ژنە گەڕاوینەتەوە، بە پرتاو خۆی گەیاندمێ، ئەو ڕۆژە لە ژوورەکەی خۆمدا تاکو ئێواری پێکەوە بووین. "ئەبدولکەدا"ش گفتی ئەوەی دامێ کە ئەم شەویش لێرە دەمێنینەوە.

بۆ لای ئێواری کە بوولێڵە "نادیا" گەڕایەوە بۆ گوندەکەی خۆیان، بڕیاریدا کە بەیانی دەگەڕێتەوەو بەیانیش پێکەوە بەسەر دەبەین، "وەردە"ش بەو گفتە دڵخۆش بوو، کە "ئەبدولکەدا" پێی داین، "وەردە"ش لە کاری "ریستۆرانت"ە کە وەڕس بوو، بەڵام ناچار بوو، لە ژێر فەرمانی مێردەکەیدا بێ گوێڕایەڵی بکات، لە هەمان کاتدا، ڕێز لە بڕیاری مێردەکەی بگرێ، ئەگەر چی ئەو بڕیارانەش نە بە دڵ و نە خواستی خۆشی لەسەر بێ.

هەر پاش ئەوەی کە "نادیا" رۆیشتەوە، "ئەبدولکەدا" بایدایەوە، گوتی: "خۆتان ئامادەکەن، پێویستە هەر ئەمشەو بۆ "کامپایس" بگەڕێینەوە." هەر کە گوێم لەو فەرمانەی "ئەبدولکەدا" بوو خورپەیەك لە دڵمەوە هات و پێم گوت: "ئەی تۆ پەیمانت نەداینێ کە ئەمشەو لێرە دەمێنینەوە...؟"

وەڵامی دامەوە: "نا پێویستە هەر ئەمشەو بگەڕێینەوە، بەیانی کارمان هەیە."

گوتم: "ئەی تۆ بە "نادیا"ت نە گوت کە بەیانی ئەویش دەتوانێ بۆ ئێرە بێ و سەر لە من بدا...!؟ تۆ بۆچی دەتەوێ خوشکەکەم ئازار بدەی و درۆی لە تەکدا دەکەی...؟"

بە زەردەخەنەیەکەوە وەلامی دامەوە: "هیچ نیە بەیانی کە "نادیا" بۆ ئێرە، هات، "بەکالە" پێی دەلێ کە ئێمە شەوێ گەڕاوینەتەوە."

هەولمدا کە نەختێك گفتوگۆی لە تەکدا بکەم، بەلام چاوەکانی "ئەبدولکەدا" ببوون بە گۆمی خوێن و سوور هەلگەڕابوون، لەوە دەترسام کە لێمدا، لەبەر ئەوە بە ناچاری بێدەنگیم لێکرد، کەلوپەلەکانم پێچایەوە، بەو شەوە ڕێگای "کامپایس" مان گرتە بەر، لە ڕێگا کە بیرم دەکردەوە خەریك بوو دلم لە داخاندا دەپچڕا، هەر لە بیری "نادیا"دا بووم، کە بەیانی ئەو ڕێگایە دەبڕێ، کاتێکیش کە دەگاتە ئەوێندەرێ، من لەوێ نیم و هەوالی ئەوەی دەدەنێ کە "زانا" گەڕاوەتەوە.

دوای ئەوەی کە گەڕاینەوە ڕۆژێکیان "مهەمەد"ی کوڕی "ئەبدولکەدا" بۆ سەردانمان هات، گوێم لێبوو بۆ باوکی دەگێڕایەوە کە شوویەکی بۆ "شیفا"ی کچی دۆزیوەتەوە، دەیدا بە کوڕێك هەر لە گوندەکەی خۆیانە.

ئەو کاتە دەمتوانی "ئارەب"ی بپەیڤم، تا ڕادەیەکی باش تێدەگەیشتم، هەر کە گوێم لەو وتانەی "مهەمەد" بوو دەستم بە گریان کرد، بیرم لەوە دەکردەوە چارەنووسی ئەو کچە مندالەش، وەك چارەنووسی من و "نادیا"یە. "شیفا"ی بەستەزمان تەمەنی تەنیا "نۆ" سالان بوو. کاتێك کە "مهەمەد" ڕۆیشتەوە "ئەبدولکەدا" بۆ باخچەکەی پشتەوە هات، منیش پرسیارم لەو بارەیە لێکرد، پێم گوت: "نیازتان چیە چی لە شیفا دەکەن...؟"

ئەو وەلامی دامەوە: "شیفا بە کوڕی خێزانێکی ناسراو بە شوو دراوە، "شیفا" نانی کەوتۆتە ڕۆنەوە. باوکی کوڕەکە لە "سەئودی"ە دوکانێکی بە برەو و باشی هەیە، زۆربەی براکانی ئەو کوڕەش لەو دوکانەی باوکیاندا کاردەکەن." کە "ئەبدولکەدا" ئەوەی بۆ گێڕامەوە، منیش کەوتمە سەر ئەو ڕایە، کە لەوانەیە شتێکی خراپ نەبێ، هەروەها "شیفا"ش لە هەمان گونددا دەمێنێتەوە و نزیکی مالە باوانیەتی، بە لایەنی

کەمەوە هەموو ڕۆژێك دەتوانێت سەر لـە دایکی بدا، تـا ئـەو دەمـەی دەبـێ بـە ژنیـش، پێویس ناکات سەرپۆشیش ببەستێ.

دوای ئەو تاووتوێکردنی بە شـوودانە "بەکالـە"ی دایکی بـە هیـچ جۆرێـك ئـەوەی نیشان نەدا، کە ڕای لەسەر بە شوودانی کچەکەی چیە، دەشێ "بەکالە"ش ئەوەی بەلاوە ئاسایی بووبێ.

مـاڵی بـاوکی کوڕەکـە خانوویـەکیان هـەبوو، کـەوتبووە ناوەڕاسـتی گوندەکـەوە، خانوو یەکی گەورە و خۆش بوو، لە هەمان کاتدا خێزانەکەش خێزانێکی گەورەی چەند سەری بوون، وا دەزانم ژیانی "شیفا" لەگەڵ ئەواندا باشتر و بەڕێز تر بوو وەك لـە لای ئێمـە. سـەروەت و سـامان لـە ولاتـی "یەمـەن"دا هەمیشـە سەرپشـك و بڕیـاردەرە بـۆ شووکردن و ژن هێنانیش، خێزانی کوڕان هەمیشە کچان بە هێزی پارە لـە خێزانەکـەی دەکڕن. نرخی کچەکە دەکەوێتە سەر توانا و دەوڵەمەندی ماڵی باوکی کوڕەکە، یان ئـەو کوڕە چەند کچەکەی بـە دڵـە. لەگـەڵ ئەمانەشـدا بـاوکی کچەکـەش بڕیـاری ئـەوە ئـەدا شیربایی کچەکەی چەندە و چەند دەخوازێ. زۆر جار هەردوو لایان لەسەر ئەم کڕین و فرۆشـتن و شـیربابیە پێکدێـن. هـەندێك کچـی تەمــەن منــداڵ نرخیــان زۆر هەرزانــە، هەندێکی تریشیان دەشێت نرخیان گران بێت وەکو لە سەرەوە ڕوونم کردەوە.

کوڕەکە دەبێت زێڕێکی زۆر و جلوبەرگی بووکەکەش بکڕێت.

وا دەزانم هەر لەسەر ئەم تەرزەش بوو، کە "ئەبدولکەدا" جاروبار هەندێك زێـڕی بۆ من دەکڕی، بەلام هەرگیز من سوپاسم نەدەکرد، ئەو لەوە نەدەگەیشت لەبەرچی من سوپاسی ناکەم، منیش لەوە نەدەگەیشتم کە بۆچی ئەویش چاوەڕێی ئەوە بـوو کـە مـن سوپاسی بکەم...!

ئەم جۆرە ئاکارانـە لـەو ولات و گوندانـەدا بـاوە و ڕوودەدا، گـەلێکیش بـە ڕەواج و گرنگـە، بێگومـان کولتـوری ئـەو مرۆڤانــە بــەو شــێوەیەیە، بــەلام لــە نــاو شــارەکاندا، دەربارەی ژن هێنان جودایە. کوڕەکە بۆ لای باوکی کچەکە دەچێ و خوازبێنی کچەکـەی لێدەکا، تاڕادەیەك هەر وەکو "ئنگلاند" وایە. ڕۆژی شەکراو خواردنەوەکەش، لـە لایـەن

زاواوه موستیلەیەکی زێڕ دەکرێتە پەنجەی بوکێ، هەروەها لەلایـەن بوکێـوه بـە هـەمان شێوه ئەو کاره دەکرێ. بەڵام ماره بڕینەکه له ماڵەوەیه نەك له مزگەوت، یان کڵێسه.

بۆ ئاهەنگی گواستنەوەش کۆمەڵێك ئۆتۆمۆبێل بەدوای ئۆتۆمۆبێلی زاوا و بوکێـدا به نێو شاردا دەگەڕێن، بەڵام ئەوانەی که دەوڵەمـەندن بـۆ مـانگی هەنگوینەکـەیان ڕوو له وڵاتێکی تر دەکەن. بەڵام ژنـهێنان لـە گونـددا، لەسـەر شـێوەی کـۆن ماوەتـەوه پێـش نەکەوتووه.

له وڵاتی "یەمەن"دا دەربارەی پـەیوەندی کـوڕ و کـچ، نابـێ ئـەو کـوڕو کچـە هیـچ پەیوەندیـەکی هاتوچۆیـان لەگـەڵ یـەکدا هـەبێ، تـا ئـەو دەمـەی کچەکـە دەگوێزرێتــەوه، لەبەر ئەوەی بە هیچ جۆرێك هاتوچۆ و یەکتر بینین دوو بە دوو جێگای متمانە نیــە و جێگـای گومانـە. "ئەبدولکـەدا" بـۆی گێڕامـەوه و گوتـی: "مهەمـەد" بــاوکی کوڕەکـەی بینیوه و لەگەڵیدا ڕێککەوتووه، پێـی گوتـووه، لـە کـاتێکدا کـە "شـیفا" دەگوێزرێتـەوەو دەچێتـە لای ئـەوان و لـەوێ دەژی، بـە هیـــچ جۆرێـك نابــێ کوڕەکـە نزیکــی "شــیفا" ببێتەوه، تاکو تەمەنی "شیفا" "چوارده ساڵان" پڕ دەکاتەوه."

کاتێك ئاهەنگی گواسـتنەوەی "شـیفا" کـرا، ئێمـە بـۆ سـەر ئاهەنگەکـە نـەچووین، لەگـەڵ ئەوەشـدا کـە "وەرده" نـەنکی "شـیفا" بـوو. "ئەبدولکـەدا" وەڵامـی لــە بــاوکی کوڕەکـە گـێڕابۆوه، کـە ناتوانـێ "ڕیسـتۆرانت"ەکـە دابخـا و جێـهێڵێ. بـەڵام مـن وای بـۆ دەچووم کە "ئەبدولکەدا" پیاوێکی پیسی کەللەپووتی دڵڕەش بوو. بـەڵام "وەرده" زۆر بە پەرۆشی "شیفا"وه بوو، لەڕاستیدا منیش زۆر "شیفا"م خۆشدەویست.

ئاهەنگی گواستنەوەی "شیفا"، ڕۆژێك دوای مردنی ئەو ژنە دراوسێیه بوو، کە لــە پرسەکەیدا بەشداریمان کرد. له ئاهەنگی گواستنەوەی هەموو کیژێکدا بـەزم و گۆڵمـەز دەگـێڕرێ، فیشـەکە شــێتە و راکێـت بــە ئاسمــاندا هــەڵدەدرێ، بـــەڵام لـــە ئاهــەنگی گواســتنەوەی "شــیفا"دا، هــەر ئــەوەنده دەبـــێ، لای ئێوارێیـــەك ئۆتۆمۆبیلێــك دێ و "شیفا"ی تێدەخەن بەرەو ماڵی زاوای دەبەن و دەیگوێزنـەوه.

چەند ڕۆژێك دوای ئەوەی کە لە پرسەی ئەو ژنــە گەڕاینـەوه، بـۆ جـارێکی تریـش تووشی نەخۆشی مەلاریا بوومەوه. ئەمجاره "ئەبدولکەدا" بـانگی دکتـۆری بـۆ نـەکردم،

له بری ئـەوه شـیری هوشـتریان دامـێ. ماوەیـەك بەسـەر ئەمـەدا رابـوورد، وا دەزانم كـه "وەردە"ش به تەواوی بێزار ببوو و دەیویست بۆ ناو گوند و ماڵەكەی خۆی بگەڕێتەوە، ڕۆژێـك "ئەبدولكـەدا" وەك شـێت بڕیـاری ئـــەوەیدا، كـه ئیـتر بـه تـەواوی بـۆ گونـد دەگەڕێینەوە، مـن وای بۆ چووم كه ئەویش كاتی ئـەوەی هـاتووە بـای بـاڵی خـۆی بـدا و بـەرەو دەرەوەی وڵات ڕەهـەندە بـێ و كـارێك بدۆزێتـەوە، هـەر چـەندە كـه شـتی وای نەدەدركاند، بەڵام بەهەر شێوەیەك بێ. به پرتاو "ڕیستۆرانت"ەكەی فرۆشت و ئێمەش بەرەو گوندی "هۆكایل" گەڕاینەوە. بەو جۆرە شەش دانه مانگمـان لـه "كامپـایس" بـه دەردیسەری بەسەر برد.

دوای ئـەوەی كـه گەڕاینـەوە هـەرگیز بـڕوام نـەدەكرد، كـه "ئەبدولكـەدا" ئـاوا بـه ئاسانی دەستی لەو كاره هـەڵگرت و چێشتخانەكەی فرۆشـت..! بـه درێژایـی ئـەو شـەش مانگه كه لەوێ بووین، من و "وەردە" زۆر لەگەڵی خەریك بووین، چەندین جار پێمـان دەگوت، كـه دەمانـەوێ بـۆ نـاو گونـد بگەڕێینـەوە. بـەڵام مێـش میوانـی نـەبوو، هـەر وەڵامیشی نەدایەوە بەڵام له كۆتاییدا وای نیشاندا كـه بـه گوێمـان دەكـا و لەبـەر ئێمـه دەستی لەو كاره هەڵگرتووە.

ئەو كاتەی كه به تەواوی بۆ ناو گوند گەڕاینەوە، ژنێك له خێزانی ئەو كوڕەی كه "شـیفا"ی مـارەكردبوو، بۆیگێڕامـەوە گوتـی: "دەسـتگیرانەكەی "شـیفا" پەیمانەكـەی شـكاندووە، هـەر شـەوی دووهـەم خوێـن بەسـەر چەرچـەفی جێگـای نووسـتنەكەی "شیفا"وە بووە."

مێردەكەی "شیفا" كوڕێكی باش و لەسـەر خـۆ بـوو. كـاتێك كـه "شـیفا" تەمـەنی گەیشته سیازده ساڵان ئـەوە فـێر ببـوو كـه مێردەكـەی خـۆش بـوێ، ئـەو سـاڵە دووجـار "تۆل" بوو، بەڵام هەردوو جارەكه سكەكەی له بار چوو. ساڵێك پاش ئەوە كـه تەمـەنی گەیشته "چوارده ساڵان" بۆ جارێكی تریش "تۆل"بۆوە. ئەو كاته "بەكاله"ی دایكی به ماڵەوە بۆ شاری "تایز" گواستبوویانەوە ، لەوێ دەژیان. هەر له سەرەتای مانگی یەكەمی "تۆل" بوونەكەیەوە دایكی بردی بۆ لای خۆی، "شیفا" له هـەفت مـانگیدا دووانەیـەكی

بوو، هەر لە ڕێوە یەکێك لە منداڵەکانی مرد، چەند ڕۆژێکی تریشی پێچوو، منداڵەکەی تریش مرد.

# بەشی هەشتەم
# گەڕانەوە بۆ لای نادیا

دوو هەفتە پاش ئەوەی کە بۆ گوندی "هۆکایل" گەڕاینەوە، "ئەبدولکەدا" گوتی: "دەمەوێ بەرەو شاری "تایز" بچم، بە نیازی کاروباری دوکان و کەلوپەل کڕین. "بەڵام کاتێك کە ڕۆیشت، بۆ ماوەی چەند مانگێك چاومان پێی نەکەوتەوە. من چوار ڕۆژ پاش ڕۆشت نەکەی زانیم کە لە "یەمەن" دەرچووە. ئەویش بە نامەیەك ئاگاداری کردم، کە بەرەو "سەئودی" بەڕێکەوتووە، بۆ کاروباری ئەو "ریستۆرانت"ەی کە لەوێ هەیەتی. لە نامەکەیدا بۆی نووسی بووم، لەبەر ئەوە بە منی نەگوتووە، زانیویەتی بە ڕۆیشتنی ئەو زویر و دڵتەنگ دەبم، کەسی تریش نیە کە بیدوێنم و لەگەڵیدا بە "ئنگلیز"ی بپەیڤم. ڕاستە من لەو ڕووەوە دڵتەنگ بووم، من و "وەردە" هەمیشە دانومان پێکەوە نەدەکولا و یەکتریمان نەدەدواند. بەڵام دەبێ ئەوە بڵێم، بە گەڕانەوەم بۆ ئەم گوندە لە "نادیا" وە نزیك بووم، ئەوە بۆ من هەموو شتێك بوو. لە هەمانکاتدا کۆڵم لە کۆڵی "ئەبدولکەدا"ش بۆوە، ئێستا ئەو سەربەستیەم هەیە، کە ئەو هەمیشە بە دوامەوە نەبێ و سوسەم بکات. هەرچەندە "ئەبدولکەدا" لێرەش نەبێ، لە ڕێگای "وەردە" و "مەهەمەد" و پیاوانی ناو گوندەوە دەتوانێ کۆنترۆڵم بکات، کە چی دەکەم و چی نا کەم. "ئەبدولکەدا" هەمیشە لەوێشەوە هەموو شتێکی دەربارەی هەر یەکێکمان دەزانی و ئاگادار بوو، هەمیشە هەڕەشەی ئەوەی لێدەکردین کە کاتێك هاتەوە چیمان لێدەکات. من هێدی، هێدی بەرامبەر ئەو پیاوە بەربەرەکانی و ڕووبەڕوو بوونەوەم نەما، ئەوە باش فێر بووم کە لەو دژایەتی و دەمەوەریەدا سەرکەوتوو نیم و پاداشتم

تێسرەواندنە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا من هەر بڕیاری خۆم دابوو، کە دەبێ تا دوا هەناسەم لە تێکۆشانی خۆ ڕزگار کردندا بم، بڕوام وابوو کە دەبێ بەهەر کلۆجێك بێ دەربازمان بێ.

ئەو کاتانەی کە "ئەبدولکەدا" لە "سەئودی" بوو، لەوێوە لە ڕێگای پیاوێکی ناسیاوییەوە کە لە شاری "تایز" دەژیا و ناوی "ناسر" بوو، دراوی بۆ "وەردە" ڕەوانە دەکرد. ئەو پیاوانەی کە لە دەرەوەی "یەمەن" کاریان دەکرد، هەریەکەیان لە ڕێگای ناسیاوێکیانەوە ئەو کارانەیان دەکرد. بەڵام ئەم جۆرە ناسیاوانە هەموویان جێگای متمانە نەبوون، ژنان زۆر گلەیی و گازندەیان دەکرد، دەیان گوت: "ئەو دراوانەی کە پیاوەکانیان لە ڕێگای ئەم جۆرە کەسانەوە بۆیان دەنێرنەوە، گزی و دزی تیادا دەکرێ." بەڵام پیاو نەبوو ناخونەك و بلۆف لە "ئەبدولکەدا" بدا، هەمیشە ئەو دراوانەی بە پسو لەوە دەناردەوە، بۆ ئەوەی کە بە هیچ جۆرێك دزی تیادا نەکرێ. وا بزانم کابرای ناسیاویشی ئەوەی باش دەزانی، ئەگەر بێ و ئەو دراوانە وەکو خۆی نەگاتە دەستی خێزانەکەی، ئەوسا لەگەڵ "ئەبدولکەدا" تووشی گونڕەشی خۆی دەبێ.

هەرچەندە "وەردە" هەندێك جار بۆڵەی ئەوەی لێوە دەهات، دەیگوت: "ئەو دراوەی کە مێردەکەی بۆی دەنێرێتەوە، بەشی خەرجی ناو ماڵ ناکات، "لەبەر ئەوە داوای لە "مهەمەد"ی کوڕی دەکرد، کە نامەیەك بۆ باوکی بنووسێ، لەو بارەیەوە ئاگاداری کاتەوە، بەو جۆرە نامەکان و وەڵامەکانیش چەند ڕۆژێکی دەخایاند، زۆربەی پیا وانی ئەو ناوچەیە ڕۆژانە بۆ "سەئودی" دەچوون، یان لەوێوە دەگەڕانەوە.

ماوەیەکی تری پێچوو "مهەمەد"یش کارێکی لە فابریکێکی ڕۆن دروست کردن لە شاری "تایز" بەدەست کەوت، بەڵام لە کۆتایی هەفتەکاندا بۆ سەردانی خێزانەکەی دەگەڕایەوە، ئەو بۆی گێڕامەوە کە کارەکەی باشە و موچەیەکی باشیش وەردەگرێ، بە ڕۆیشتنی "مهەمەد" ئیتر لە ماڵەوە کەس نەما کە بتوانم بە "ئنگلیز"ی لەگەڵیدا بپەیڤم.

ئەو کاتەی کە ئێمە بە تەواوی وازمان لە "ریستۆرانت"ەکە هێنا و بۆ "هۆکایل" گەڕاینەوە، "بەکالە" "تۆل" بوو، گەلێك دڵی بەو "تۆل"بوونە خۆش بوو، خوازیاری

ئەوە بوو کە کوڕێکی ببێ، من زۆر بیرم لە ڕۆژی لە دایك بوونی منداڵەکە نەدەکردەوە، کە چۆن دەبێ و چی ڕوودەدا، وا هەستم دەکرد کە یەکێك لە ئـەندامی خێزانەکـە ئـەو ژنە دەگەیەننە نەخۆشخانەی شاری "تایز" و لە بەشی منداڵ بووندا منداڵەکەی دەبێ. د ەربارەی ساتی لە دایك بوونی منداڵ هیچ زانیاریەکم نەبوو، تەنیا ئەو کەمە زانیاریـە نەبێ، کە کاتی خۆی لە فێرگە فێر ببووم و دەمزانی. سێ مانگ دوای ئـەوە کـە بـۆ نـاو گونـد گەڕاینـەوە، ڕۆژێکیـان کـە سـەیر دەکـەم "بەکالـە" یـەك تەختـە لەسـەر زەوی ڕاکشاوە، بە دەم ئازار و ژا نەوە دەگری و دەناڵێنێ، "وەردە"ی خەسووی خەریکێتی، کـە چاوم بەو ڕووداوە کەوت، ترس و سەرسامی لەشیان داگرتم، بە خۆم دەگوت: " تۆ بڵێی چـی ڕووبـدا، ئەگـەر گرفتێـك هاتـە پێشـێ...؟ دەبـێ مـن چیـم بەسـەر بـێ ئەگـەر "تـۆل"ببـم..؟ کـێ بەرگـەی ئـەم هـەموو خوێـن لێڕۆشـتنە دەگـرێ..؟" بـە دەم ئـەم بیرکردنانـەوە دەلـەرزیم. بـەڵام خـۆم بـەوە هێمـن دەکـردەوە، کـە "ئەبدولکـەدا"گفتـی ئـەوەی دابوومـێ، کـاتێك کـە "تـۆل" دەبم ڕەوانـەی "ئنگلانـد"م دەکاتـەوە، لای دایکـم منداڵەکـەم ببـێ. "بەکالە" بـۆ مـاوەی سـێ کـاژێر ژان گرتـی، پاشـان یارمـەتیماندا و بردمانە ژوورەکـەی خـۆی، جێگایـەکمان لەسـەر زەوی بـۆ ڕاخست. وردە وردە کـاتی لـە دایك بوونی منداڵەکە نزیك بۆوە، منیش لەوێ مامەوە بەڵکو بتوانم یارمەتیەك بـدەم، پاشان "خەولە"ی خوشکەزای "ئەبدولکەدا" پەیدا بوو و هاتە ژوورەوە. لە نـاو گونـددا هەر ژنێك ژان بیگرتایـە و کـاتی منـداڵ بوونـی نزیـك ببوایەتـەوە، ئـەو دەمـە زۆربـەی ژنـانی گونـد دەچـوون بـەدەم ئـەو ژنـەوە و هەریەکـەیان بـەکارێك هەڵدەسـتا و بـە هەرەوەرزی کارەکانیان دەکرد. بەڵام لەبەر ئەوەی کە خانووەکەی ئێمـە کـەوتبووە ئـەو کەشـکەلانەوە و دوورە دەست بـوو، ژنـانی نـاو گونـد بـەو ژان گرتنـەی "بەکالـە" یـان نـەزانی. لەبـەر ئـەوە، تـەنیا "خەولـە" و "وەردە" و دایکـە پیرەکـەی "ئەبدولکـەدا" خـەریکی کـاری مامـانی و کارەکـانی تریـش بـوون، ئـەو ژنانـە هیـچ کارێکیـان بـە مـن نەسپارد، من هەر سەیرم دەکردن و گوێم لێدەگرتن، کە چۆن ئەم کـارە دەکـەن و چـۆن ئەو منداڵە لە دایك دەبێ.

له ناو گونددا به هيچ جۆرێك دكتـۆر، يـان هيـچ يارمـەتيدەرێكی پزيشـكی تريـش نەبوو، ژنەكان به بێدەنگی به ديار ئەو ژنه ژان گرتـۆوه چاوەڕوان بـوون، پـەيتا پـەيتا پەرۆی خوێناويان دەگۆڕی،كاتێك كـه كارەكـه مەيسـەر بـوو، "بەكالـه" كوڕێكـی جوانـی ژيكەڵەی بـوو. بـۆ شـتنی ئـەو كەلوپەلـه خوێناويانــه، كـاری ئاوكێشـان بەسـەر منـدا ساغبۆوه.

كاتێك كه منداڵه له دايك بوو، به گوێزان ناوكيـان بـڕی. "وەرده"ش بـه جـاجم و گوريـس لـه تەنيشـت دايكيـەوه جۆلانەيـەكی بـۆ منداڵەكـه دروسـتكرد و هەڵواسـی. "مهەمەد" ئەو شەوه دەبوايه بۆ ماڵەوه بگەڕايەتەوه، كاتێك كه گەيشته ماڵـەوه زووتـر پێيان ڕاگەياند بوو كه ژنەكەی كوڕی بووه، بەو هەواڵه زۆر كامەران بوو.

"بەكاله" بۆماوەی يەك هەفته لەسەر جێگا لێيكەوت و پشووی وەرگرت، "وەرده" خواردنی بۆ دروستدەكرد و منداڵەكەشی دەشت. من و "شيفا"ش به ئاوهێنـان و كـاری تر و "چاپاتيس" دروستكـردنەوه خەريك بووين. بەم كارانەشم هێدی، هێدی ملكـەچی ئەوه بـووم كـه ببمـه ژنـه "ئـارەب"ێكـی رووسـوور. بـەڵام لـه نـاخمدا هـەر لـه هـەوڵ و هەڵپەی خۆ دەربازكردندا بووم.

كاتێك كه له وڵاتی "يەمەن"دا منداڵێك له دايك دەبێت، خەڵكانێكی زۆر سەردانی دايك و منداڵەكه دەكەن. ڕۆژانی هەفتەی يەكەمی منداڵ له دايـك بـوون پـەيتا، پـەيتا، ژنان به خۆيان و دياريەكانی دەستيانەوه دێـن،يـان هـەندێك دراو بـۆ دايـك و منداڵەكـه دەكەنه دياری. بەڵام ئەگەر منداڵەكه كوڕ بێ، ئەوا سەردان گەرمتر و دياری و دراويـش زۆرتـر دەبێ. بەڵام خۆ ئەگەر منداڵه كچ بێ، سەردان و دياريش كەم دەبن.

له كۆتايی هەفتەی يەكەمدا كـوڕ خەتەنـه دەكـرێ، لـه نـاو گونـددا تـەنيا پيـاوێك كارەكەی ئەوەيه و بەو كاره هەڵدەسـتێ، ئـەم خەتەنـه كردنـه،خەرجيـەكی زۆر لەسـەر باوكی كوڕەكه دادەنێ، جگه لەوەی كه دەبـێ دراوێكـی زۆر بـدا بـه كـابرای خەتەنـەكار، دەبێ ئاهەنگێكی نانخواردنيش بگێڕێ، بۆ ئەم خەتەنه سوورانەش مەڕێك سـەربڕن. وا دەزانم بۆيه له كۆتايی هەفتەی يەكەمدا ئـەو منداڵـه خەتەنـه دەكـەن، بـۆ ئەوەيـه كـه بزانن منداڵەكه دەژی يان تەندروستی باشه و بەرگەی ئەو پێست بڕينەی سـەر پۆپـەی

کێری دەگرێ. ئەو پیاوەی  کە ئەم کارە دەکات، هیچ جۆرە بڕوانامەی دەرمانسازیی نیە، تەنیا ئەوە نەبێ کە ئەم پیشەیەی لە باوکیەوە بۆ ماوەتەوە.

شـێوەی خەتەنـە کردنەکـە بـەم جۆرەیـە. ئـەو پێسـتە زیـادەی سـەر پۆپـەی کـێر دەخرێتە نێوانی دوو پەنجەوە و رادەکێشرێ، پاشان بە دەزوو توند  دەبەسـرێت تـا ئـەو شوێنەی بۆ بڕیـن دیـاری دەکـرێ، پـاش ئەمـە بـە گوێزانێکـی تیـژ، یـان بـە "کافرمـان" پێسـتە زیادەکـە دەبـڕێ. دوای ئـەوە چواردەورەکـەی پـاك دەکرێتـەوەو ڕێکدەخـرێ، بـۆ ئەوەی تیلمە پێستی پێـوە نـەمێنێ. بێگومـان ئـەو "کۆرپـە"یـە لـە تـاو ئـازار و ژان بـە هـەموو هێزێکیـەوە دەگـری شـین و مـۆر دەبێتـەوە. دوای ئـەوە بـە دەرمـانێکی مەیلـەو خـاکی (تیانــترۆك) برینەکـــە دەبرژێننـــەوە پاشـــان کـــابرا منداڵەکـــە هـــەڵدەگرێ و دەینووسـێنێ بـە سـنگی خۆیـەوە و لـە ئـامێزی دەگـــرێ، بـۆ ئـــەوەی منداڵەکـە هێمـن بکاتـەوە. ئـەم منداڵـە،بـۆ مـاوەی چـەند هەفتەیـەك پەڕۆیـەکی نـەرم دەخرێتـە نێـــوان هەردوو ڕانیەوە، لەبەر ئەوەی ئەو برینە لە  ڕانـەکانی نەخشێن، یـان بەرێکـەوت شـتی بەرکەوێت و بێتەوە سۆ و بکولێتەوە.

هەروەها لە ناو گونددا ژنێکیش بۆ بڕینی میتکەی ئەو کچە بچکۆلە تازە لە دایـك بووانـەش هەیـە. "سـەلامە"ی ژنـی "جـەواد" کچێکـی بـوو، "نادیـا"ی خوشـکم میتکـە بڕینی ئەو کچە بچکۆلەیەی بینی بوو،دوای ئەوە بۆ منی گێڕایەوە.  بـەم جۆرەیـە. ئـەو کچە منداڵە ڕووت دەکەنەوە، پاشان میتکەی منداڵەکە رادەکێشن و دەرزیەك دەکەن بـە هەردوو سوچی میتکەکەدا، تاکو ئەو جێگایەی کە دەیانەوێت کورتی بکەنەوە و  بیـبڕن. پاشان بە گوێزانێکی تیژ تا ئەو شوێنە دەبڕن کە دیاریان کردووە. مەبەست لەم میتکە بڕینە ئەوەیە، لە پاشە ڕۆژدا ئەو کچە کە گەورە بوو، خرۆشی سێکسی کەم بکرێتەوە.

جارێکیان پرسیارم لــە ژنێـك کـرد لـە بـارەی خرۆشـی سێکسـیەوە، ژنەکـە وەڵامـی دامەوە گوتی: " من لـەو بارەیەوە هیچ ئاگادار نیم و خرۆشی  سێکسـیم ئاسـاییە، لەبـەر ئەوەی کە من خەتەنە نەکراوم. "لەڕاسـتیدا نـازانم چۆن ئـەو ژنـە لـە خەتەنـە کـردن دەربـاز ببـوو..؟! لەبـەر ئـەوەی خەتەنـەکردن کراوەتـــە نـــەریت، دەبێــت لــە نــاو ئــەو گوندانەدا هەموو کچێك خەتەنە بکرێت، ئەم کارە تاکو ئێستاش هەر  بەردەوامـە.بـەڵام

لەناو شارەکاندا ژنە مۆدێرنیزمەکان، ڕێگا نادەن کچەکانیان خەتەنە بکرێ.بەڵام پیاوان دەڵێن: "ئەگەر بێت و کچ خەتەنە نەکرێ،کارێکی خراپ و ترسناکە. "بەڵام ئەو ژنانەی کە ڕادەی ڕووناکبیریان بەرزە، بەرپەرچی ئەم بۆچوونە دواکەوتووە دەدەنەوە و بێبایەخی دەکەن.

کچە منداڵەکانی ئەم گوندانە بەو جۆرە وا فێرکراون و مێشکیان شۆراوەتەوە، ئەگەر بێت و کچان خەتەنە نەکرێن، ئەوا پاشەڕۆژ کە گەورە بوون میتکەیان درێژ دەبێ، ئەو میتکە درێژە کچان هەراسان دەکەن. ئەم کچانە بەو شێوەیە ترسێنراون و راستیان لێشاردراوەتەوە، ئەو ژن و کچانە هەرگیز تووشی ئەو ژن و کچانە نەبوون کە خەتەنە نەکراون،تاکو راستی خەتەنەکردنەکە بزانن. ئەو ژن و کچانە ئەوەیان زانی بوو، کە "نادیا" خەتەنە نەکراوە، بە کەم و شەرمیان زانی بوو،جارێکیان کچێك داوای لە "نادیا" کردبوو، کە دەیەوێ میتکەی نەبڕاو ببینێ،بزانێ چۆنە. بەڵام "سەلامە" بەو داخوازیە نا ئارام و زویر ببوو، پاشان ئەم بەسەرهاتەی بۆ "جەواد"ی مێردی گێڕابۆوە، "جەواد"یش بەسەر کچەکەدا بۆڵاندبووی، ئیتر لە بەردەمی ئێمەدا باسیان لێوە نەدەکرد، بەڵام هەر ناخۆش بوو، کە لە پاشملە باسی من و "نادیا" یان دەکرد.

هەر گوندێك "کوێخا"یەکی هەیە، ئەم کارەش بە پشتاو پشت بۆ کوڕانی خێزان دەگەڕێتەوە، ئەم پیاوە کوێخایە ژیانی خێزانی لە ژیانی خەڵکی ئاسای ناو گوند جودایە و خاوەنی سامانێکی زۆریشە. هەروەها خانووی ئەم کوێخایانە لە ناو گونددا خانوویەکی گەورە و لەبەر چاوە. خەڵکانی گوند هەر کاتێك گیروگرفتیان هەبوو دەتوانن بچن سەردانی ماڵی کوێخا بکەن و گرفتەکانیان بۆ کوێخا بگێڕنەوە، ئەویش ڕاوێژیان لەگەڵ دەکات، ئەو خەڵکانەش لە بری ئەو ڕاوێژکردنە دەبێت هەندێك دراو بە کوێخا بدەن. بۆ نموونە ئەگەر ژنێك لە ژیانی ژن و مێردایەتیدا نائارام بوو، ئەو کاتە لەسەری پێویستە کە دادی خۆی بۆ لای کوێخا بەرێت و بەسەرهاتی ژیانی بۆ کوێخا بگێڕێتەوە، کە بۆچی لە ژیانی خێزانیدا بەختەوەر نیە، لە کاتێکدا ئەگەر کوێخا زانی مێردی ژنەکە کارێکی نابە جێی بەرامبەر بەو ژنە کردووە، ئەو کاتە کوێخا

پەیوەندی بە شار و لێپرسـراوانی دەوڵەتـەوە دەکـات، ئـەو کاتـە ژنەکـە دەتوانێـت،داوای جودا بوونەوە لە مێردەکەی بکات.

کاتێك کە ژنێك لە مێردەکەی جودا دەبێتەوە، پێویسـتە لەسـەری منداڵـەکانی بـۆ مێردەکەی جێبێڵێ. ئەوسا بێوەژن دەبێ بەرەو باوان ببێتـەوە و ماڵـە بـاوکی بـەخێوی بکەن و ژیانی دابین کـەن. پاشـان زۆربـەی کـات بێوەپیاوەکـە منداڵـەکانی دەخاتـە ژێـر چاودێری و سەرپەرشتی ژنێکی نزیکـی خـۆی، وەك دایـك، یـان خوشـك، یـان خزمێکـی. لەبەر ئەوە ژنانی ئەم وڵاتە لە ترسی ئەوەی کە منداڵەکانیان لە دەست نەدەن، ناچـارن لە ژێر باری ئەو ترسەدا ڕایکێشن. ئەو هۆکـارە بۆتـە هـۆی ئـەوە کـە ژنـان نـەتوانن لـە مێردەکانیان جودا ببنـەوە.

جارێکیان بۆ کڕینی کەلوپەل بۆ ناو گوند چووین، چاوم بە کوێخـای گونـد کـەوت دەیتوانی برێك "ئنگلـیز"ی بپـەیڤێ، پیـاوێکی ڕووخۆشـی بـەڕێز دیـاربوو، لـەو مرۆڤـە دەچوو کە پیاو دەیتوانی ڕێزی لێبگرێ، ویستم بەسەرهاتی خۆمی بۆ بگێڕمەوە، بـەڵام شـەرمم کـرد. ئـەو دەمـە وامدەزانـی، کـە ئـەو گیروگرفتـە دەبـێ هـەر لـە نـاو خـودی خێزانەکـەماندا بمێنێتـەوە. ئەوەشـم دەزانـی ئەگـەر بەسـەرهاتی خـۆم بـۆ کوێخـا بگێڕمەوە، هیچ جۆرە یارمەتیەکی لە دەسـت نایـەت و یارمەتیشـم نـادات، جگـە لـەوەی کـە ئـەو داد و سـکاڵایە بـە زووتریـن کـات بـە نـاو گونـد و خـەڵکیدا بـڵاو دەبێتـەوە و دەماودەم دەکات. تەنیا مرۆڤێك کە دەموێرا نـەهێنی خۆمـی لـەلا بدرکێنـم و هەمیشـە باوەڕم پێی هەبوو، "خەولە"ی برازای "ئەبدولکەدا" بوو. بەڵام لەگەڵ ئەوەشـدا ژنـانی گوند هەموویان دەیـانزانی کـە مـن چۆن بیردەکەمـەوە و چۆن ژیـانێکم هەیـە. ئەگـەر ژنێـك پرسـیاری لێبکردمایـە، کـە مێردەکـەمم بـە دڵـە، یـان ژیـانی ژن و مێردایـەتیمان چۆنــە..؟ بــەبێ یــەك و دوو دەمگــوت: "بــەختیار نیــم، دەمــەوێت بــۆ وڵاتــی خــۆم بگەڕێمەوە." ئاوا هەستم دەکرد هەموویان بەزەییان بە مندا دێتەوە. ژنانی ناو ئـاوایی سەرجەم گوێیان هەڵدەخست، دەیانویست بزانن کە چی لە ئارادایە. زۆر جار پرسـیاری ئەوەیان لێدەکردم. پێیان دەگوتم: "چۆن لـە تـەك ئـەو پیـاوە مێردمنداڵـە، نەخۆشـەدا هەڵدەکـەم.." لـە هـەمان کـاتدا گاڵتـەیان بـە "ئـەبدوڵا"ی بـە نـاو مـێردم دەکـرد. ئــەز

هەرگیز نەمدەزانی چی وەڵامی ئەم ژنانە بدەمەوە، بەڵام ئەم جۆرە وتانەیان تەنیا دڵدانەوە و داخی دڵی خۆیان بوو دەریان دەبڕی.

کاتێك پیاوانی گوند هەریەکەیان رەهەندەی جێگایەك دەبوون و کاریان لە شوێنێکی تر دەدۆزیەوە، ئەو کاتە سەرپەرشتکاری ناو ماڵ دەکەوتە ژێر چنگی ژنێکی بەتەمەنی ماڵەکەوە، ئەو کاروبارەکانی بەرێوە دەبرد. لە خانووەکەی ئێمەدا "وەردە" سەرپشك بوو، ئەو فەرمانی بە من دەدا، کە چی بکەم و چی نەکەم.لەبەر ئەوەی کە نەکەومە بەر لێدان و هەڕەشەی "ئەبدولکەدا"، ئەو کاتە دەبووایە بە ناچاری گوێڕایەڵی فەرمانەکانی "وەردە" بم و کارەکان هەڵسوڕێنم. "وەردە" شانازی بەوەوە دەکرد، کە دەسەڵاتی بەسەرمدا هەیە. هەندێك جار بۆ ماوەی چەند ڕۆژێك خواردنی لێدەشاردمەوە و نەیدەدامێ. یان خواردنی ساردەوە بووی کۆنەی ڕۆژێك لەوەوبەری دەدامێ. یان جاری وا هەبوو لە "چا" و جگەرە تێنەدەپەڕی. هەندێك جار پرسیارم لە "بەکالە"دەکرد، "بۆچی ئەوان خواردنی گەرم دەخۆن و منیش خواردنی ساردەوە بووی کۆن بخۆم... ؟" بەڵام ئەو نەیدەزانی چی بڵێ دەیگوت: "وەردە" بڕیاردەرە."

"وەردە" هیچ کاتێك بەرامبەر بە "بەکالە" ئاوا لینج و دڵڕەش نەبوو، هەروەها "بەکالە"ش هەمیشە گوێڕایەڵی خەسووی بوو. من ناچار بووم کە خۆم خواردن بۆ خۆم دروستبکەم، بەڵام "وەردە" خواردنەکانی دەخستە ناو ژووری گەنجینەکە و دەرگاکەی سەرکلۆم دەدا و کلیلەکەی لای خۆی هەڵدەگرت. لەبەر ئەوەی کە مریشکمان زۆر هەبوو، هەمیشە هێلکەی تازەمان لە ماڵەوە هەبوو، بەڵام "وەردە" ئەو هێلکانەی دەرخواردی پیاوەکان، یان منداڵەکانی "بەکالە" دەدا. بۆ تەنیا جارێك هێلکەیەکی بە من نەدا، "نادیا"ش لە ماڵەوە مریشکی هەبوو، جاروبار چەند هێلکە و هەروەها گۆشتیشی بۆ دەهێنام.

ئەو کاتانەی کە بۆ ناو گوند دادەبەزیم، چەند ژنێکی ناو گوندم دەبینی و ناسیاویم لە تەکیاندا پەیدا کرد بوو، ئەوان دەیانزانی کە "وەردە" بەرامبەر بە من ژنێکی دەغەزار و بۆگەنە، دڵخۆشیان دەدامەوە دەیان گوت: " "وەردە" بە درێژایی تەمەنی هەروا بۆگەن و پیسکە و چاوچنۆك بووە، دایکیشی لێی هەراسان بوو." ئەم

ژنانـه هـەموو بـەڕێز و بـاش بـوون،بـەڵام مـن هـەرگیز لـەوە نەدەگەیشــتم کـە بۆچـی "وەردە" ئەمەندە دڵڕەش و پیسە...؟ ئەو ژنەی کە کاتی خۆی لـە گونـد مـرد، ئێمـەش بەشداریمان لە پرسەکەید ا کرد،پیاوەکەی پاش ماوەیەك ژنی هێنایەوە، ئەو ژنە تازەیـە دراوسێمان بوو، هەموو جارێك بە دزیەوە نان و خواردنی بۆ دەهێنام.

ڕۆژێکیان لەسەر تەنوور خەریکی کاروباری نانکردن بووم، مـارێك بەخشـکەیی بـە بـەردەمدا دەربـاز بـوو، مـن زۆر ترسـام، پاشـان سـەرە بزوتکێکـم هـەڵگرت و مارەکـەم پێکوشت. من لە خەڵکیم بیستبوو،کە گۆشتی مار دەخورێت و دەشیخۆن، منیش سـەری مارەکەم بە دارێك گرت و پاشان بە چیلکەو چەواڵ ئاگرێکم بۆ کـردەوە و خسـتمە نـاو ئاگرەکـەوە، تـا بـە تـەواوی بـرژاو کـاژ و پێسـتەکەی هـەڵقرچا، پاشـان دەسـتم کـرد بـە خواردنی، لە ڕا ستیدا مار، گۆشتێکی بەتام و خۆشی هەیە.

"ئەبدولکەدا" لە "سەئودی"ەوە نامەیەکی بۆ نووسیم، لە نامەکەیدا نووسی بووی گوایا بیستوویەتی کە "وەردە" لەگەڵمدا باش هەڵسوکەوت ناکات و خەڵکانی تر دەسـتی یارمەتیم بۆ درێژ دەکەن و خواردنم دەدەنـێ. منیـش ناچـار بـووم کـە ئـەو یارمەتیانـە نەدەمە دوواوە،کاتێك نامەم بۆ نووسیەوە، لە وەڵامی نامەکەیدا دانم بەو راستیانەدا نا، بۆم نووسی لەبەر ئـەوەی تـۆ هیـچ جـۆرە دراوێکـت بـۆ جێنەهێشـتووم، بێگومـان دەبـێ "وەردە" بڕیارم لەسەر بدا. پاش ئەو هەموو گێرمەو کێشە و نامرۆڤایەتیـەی "وەردە" چەند ڕۆژێك دوای ناردنی ئـەو نامەیـە، نامەیـەکم بـۆ "ئەبدولکـەدا" ڕەوانـە کـردەوە. ئـەنجام "ئەبدولکـەدا" نامەیـەکی بـۆ "وەردە" نــارد، کەسـێك لـە نـاو گونـدەوە هـات نامەکـەی بـۆ "وەردە" خوێنـدەوە. لـە نامەکـەدا بـۆ "وەردە"ی نووسـیبوو، کـە دەبـێ بەرامبـەر بــە "زانــا" کـراوە بیـت و واز لـە بەربـەرەکانی کردنـی بـهێنێ. هـەر بـە خوێندنــەوەی نامەکـە "وەردە" ئـاواتخواز بـوو سـەرم هەڵکـەنێت، بـەڵام لـە ترسـی مێردەکەی نەیدەوێرا هیچ بکات، دەیزانی ئەگەر لەسەر ئەو ڕەوشـتە نزمـەی بـەردەوام بێت، جارێکی تریش نامە بۆ مێردەکەی دەنووسمەوە. "وەردە" دەیزانی کە من هـەموو شتێك لە بارەی ئەوەوە بۆ خەڵکان دەگێڕمـەوە، لەبـەر ئـەوە ئـەوەندەی تـر ڕکوکینـەی بەرامبەرم ئەستوور و بە خوێنی سەرم تینوو بوو. بەڵام هیچ کاتێك بەو شێوەیە دەری

نەدەبڕی، لە داخی دڵی پێی دەگوتم: "هەتا ماوی دەبێ ژیان لـەم گونـدەدا بەسـەربەری، تۆ هەرگیز چاوت بە وڵاتی خـۆت ناکەوێتـەوە، ئـەوە خـەوە خـەو." منیـش بـە هـەموو هێزمەوە تڕۆم دەکرد، بە بێدەنگی ناخیم توێ توێ دەکرد.

کاتێك کە "ئەبدولکەدا" بەرەو "سەئودی" ملی نـاو ڕۆیشت، "ئـەبدوڵا" نـەخۆش کـەوت، ڕۆژ دوای ڕۆژ ئـەو کـوڕە لاواز و زەرد دەبـوو. لەڕاسـتیدا زۆر ترسـام کـە منیـش تووشی ئەو نەخۆشیە بم، لە کاتێکدا کە بەناچاری لەسەر جێگا لەگـەڵیدا پاڵدەکـەوتم. "مهەمەد" پەیتا، پەیتا، "ئەبدوڵا"ی برای بۆ لای دکتۆر دەبرد، بۆ ئــەوەی بزانـن هـۆی نەخۆشــیەکەی چیــە. بــەڵام ئــەو هــاتوو چوونــە هیــچ ســوودی نــەبوو، دکتۆرەکــان نەیاندەزانی کە چ جۆرە نەخۆشیەکی هەیە.

"وەردە"ی دایکی دەیگوت: " "ئەبدوڵا"ی کوڕی هەر لەو ڕۆژەوە کە لە دایك بووە، لاواز و تەن نادروست و کەم خۆر بووە." "ئەبدوڵا" بەرە بەرە نەخۆشـیەکەی کاریگـەر تر دەبوو، پزیشکەکان دەرمانیان بۆ نووسی، بەڵام ئامۆژگـاری ئـەوەیان کـرد بـوو، دەبـێ بۆ چارەسەری نەخۆشیەکەی بۆ ئنگلاند، یان "سەئودی"ە بچێ و خۆی نیشانی دکتۆری تایبەتی بدا.

"مهەمەد" چەند جارێك نامەی بۆ باوکی نووسی، کە "ئەبدوڵا"ی برای نەخۆشە، بـەڵام "ئەبدولکـەدا" تـا ماوەیـەکی دوور و درێـژ وەڵامـی نامـەکانی پشـتگوێ خسـتن و وەڵامی نەدانەوە. نەخۆشیەکەی "ئەبدوڵا" بە تەو اوی کاریگەر تر و پەرێشانی کرد. لە ئەنجامدا، لەسەر جێگا خستی. ناچـار "مهەمـەد"، "ئـەبدوڵا"ی گـەیاندە نەخۆشخانەی شـاری "تـایز" و مـاوەی چــەند هەفتەیــەك لــەوێ مانــەوە. منیــش بــەم نەخۆشــیەی "ئەبدوڵا" گەلێك خەنی بـووم، ڕۆژ دوای ڕۆژ بـە هیـوا دەبـووم، ئەگـەر نـا ڕێـزی و بـێ ویژدانی نەبێ کـە بڵێـم ئـاواتخواز بـووم، ئـەو نەخۆشـییە بیکوشـتایە و منیـش ئـازاد و ڕزگار ببوومایەوە، بـۆ وڵات بگەڕامایەتـەوە. لەڕاسـتیدا ئەوماوەیـەی کـە "ئـەبدوڵا" لـە نەخۆشخانە کەوتبوو، گەلێك خۆش بوو، کە بە تەنیا لە ماڵەوە بووم. لەبەر ئەوەی کـە دەمتوانی بە ئازادی بۆ خۆم بخەوم، لەبەر ئەوە نا کە ئـەو ئـەوەندە ئـازا و جەربـەزە و بـە ئالۆشـی سـێکس بـوو کــە شــەوانە نەیهێشـتبێت بخـەوم، "نـا" لەبــەر ئــەوەی کــە

نەمدەویست چرۆچاوی ببینم و لە نزیکمەوە بێت. تەنیا ئاواتم ئەوە بوو کە لەو ژیانە کۆیلەمەرگییە ئازادبم.

پاش ماوەیەك "ئەبدولکەدا" بەسەردان بۆ ماڵەوە گەڕایەوە. کاتێك کە چاوی بە "ئەبدولا" ی کوڕی کەوت، زانی کە نەخۆشیەکەی کاریگەر و ترسناکە. لەبەر ئەوە بڕیاریدا، کە بیگەیەنێتە "ئنگلاند" بۆ چارەسەرکردن، بۆ ئەو مەبەستە پرسیاری لە منیش کرد، گوتی: "زانا دەتەوێت لە تەکماندا بۆ "ئنگلاند" بێیت..؟" لە سەرەتاوە بڕوام بەو پرسە گورگانەیە نەدەکرد، لەبەر ئەوەی دەمزانی تەنیا مەبەستی ئەو پیاوە ئەوەیە، کە بزانێت من دەڵێم چی، "ئەبدولکەدا" ئەوەشی گوت: "کاروباری پەساپۆرتەکەم، خۆی جێبەجێی دەکات،" ئەمجارە نازانم هۆی چی بوو، بەم بەڵێنەی کە پێیداوم وای لێکردم کە بڕوا بە گفتەکەی بکەم..؟! لەگەڵ ئەوەشدا هەر دوو دڵ بووم، نەمدەتوانی کە ئاوا نەبم، لەبەر ئەوەی بە درێژایی ئەو ماوەیە کە لەو وڵاتە بووم، هەموو جارێك داوای لێدەکردم کە نامە بۆ دایکم بنووسم و ئەو بۆم ڕەوانە دەکات، بەڵام ئەو هەموو نامەیەم بۆ دایکم نووسی و ڕەوانە کرد، بەبێ ئەوەی کە جارێك وەڵامێکم لەلایەن دایکمەوە بدرێتەوە.

بەڵام ئەم جارەیان لەوە دەچوو کە بەڵێنەکەی بباتە سەر، منیش لە لایەن خۆمەوە هەوڵی ئەوەم دەدا کە گوێڕایەڵیان کەم و لە ناو خێزانەکەدا کارێکی ئاوا نەکەم کە گرژی دروست ببێ، بە تایبەتی لەگەڵ "وەردە"دا. ئەو کاتانەی "ئەبدولکەدا" لە "سەئودی" بوو، نامەی بۆ دەناردم، تیایدا دەنووسی و ڕاوێژی دەکردم، ئەگەر بێتو خۆم بگونجێنم و گیروگرفت دروست نەکەم، دڵی "ئەبدولا" راگرم و ئارام بم، ئەوا پەیمانم دەداتێ، کە بەسەردان ڕەوانەی "ئنگلاند"م بکات. ئەو بەڵێنەی لە هەموو نامەیەکدا دەدامێ و دەنووسی.منیش ئاوام بیردەکردەوە لەوانەیە کارێکی وام کردبێ، کە ڕێگای راستی خۆم دۆزیبێتەوە و ئەو بڕوایەم لەلای ئەو پیاوە دروستکردبێ، ئێستا گەیشتبێتە ئەو راستییە کە ڕێگای ئەوەم پێبدا بە سەردان بگەڕێمەوە.

بۆ ئەوەی کە "ئەبدولا" فیزەی "بەریتانیا" وەرگرێت، ئەوا پێویستی بە کات و دراوێکی زۆر و لە هەمان کاتدا، یارمەتی دکتۆرێکیش کە پشتگیری لەو چوونەی ئەو بکات،کە راستە ئەو کورە نەخۆشە و پێویستی بە چارەسەر هەیە. ئەم هەوڵ و کۆششانە بە یارمەتی " ناسر" بەڕێوە دەچوو، کە هاوڕێی "ئەبدولکەدا" بوو لە شاری "تایز" دادەنیشت. منیش نامەیەکی دوور و درێژم بۆ دایکم نووسی، هەموو بەسەرهاتی ژیانی خۆم و "نادیا"م تیا ڕوونکردەوە، ئەوەشم بۆ نووسی، کە ئێمە نیازمان وایە، بە هۆی نەخۆشی "ئەبدولا"وە، بەرەو "بەریتانیا" بگەڕێینەوە. پێویستە کە هەموو توانایەك بخەینە کار بۆ ئەوەی بتوانین "نادیا"ش دەرباز بکەین. ئەم نامەیەم دایە دەست "ئەبدولکەدا"، داوام لێکرد کە پۆستی بکات، ئەویش پەیمانی ئەوەی دامێ کە ڕەوانەی بکات. لەو ماوەیەدا کە چاوەڕێی فیزەکەی "ئەبدولا" بووین، لە هەمانکاتدا منیش چاوەڕێی وەڵامی نامەی دایکم بووم.

ڕۆژێکیان "ئەبدولکەدا" خۆیکرد بە ژوورەکەی مندا و گوتی: " "زانا" نامەیەکت ڕەوانە کرد بوو بۆ دایکت، بەڵام باوکت هەر هەمان نامەی بۆ ئێرە ڕەوانە کردۆتەوە." بە بیستنی ئەو هەواڵە بە تاسەوە چووم،زانیم ئەو نامەیە بە هیچ جۆرێك ڕەوانە نەکراوە. من ئەوەم دەزانی کە ئەو پیاوە کاتی خۆی نامەکەی ڕەوانە نەکردووە و کردوویەتیەوە، ئێستا دەیەوێ وەك بیانوویەك، بۆ نەبردنم بەکاری بهێنێ. "باوکت زۆر لێت تووڕەیە" بەردەوام بوو گوتی: " باوکت نامەی بۆ نووسیووم،" دەڵێ: "نابێ بە هیچ جۆرێك "زانا" لەگەڵ "ئەبدولادا" بگەڕێتەوە."

ئەو پەیمانە کە زووتر "ئەبدولکەدا" پێیدام، زۆر دڵنیای کردبووم، کە ئەمجارەیان بە دڵنیاییەوە خۆم دەرباز دەکەم. بەڵام،مەخابن... ئەو هەواڵە وەك چەکوشێك لە تەپڵی سەرم درا.منیش چارم نەما دەستم بە زریکە و هاوار کردن بەسەریدا.

"تۆ درۆ دەکەی و ئەو نامەیەت ڕەوانە نەکردووە، نامەکەت کردۆتەوە، نامەکانی پێشتریشت هەر بەو جۆرە کردۆتەوە." ئەوەی کە توانیم پێمکرد، کۆنترۆڵم بەسەر خۆما نەما و پەلامارمدا، کەوتمە شاڵاو بردن.

پاش ماوەیەكی زۆر ئەوەم زانی کە دایكم وازی لە باوكم هێناوە و منداڵەكان و ماڵی جێهێشتووە، ئەو نامانەی كە بەهەمان ناونیشان بۆ دایكیشم ناردووە، هەموویان، بەردەستی باوكم كەوتوون هیچیان بە دەستی دایكم نەگەیشتون.

لە كۆتاییدا ریسەكەم بۆوە بە خوری. "ئەبدولا" و باوكی بەرەو "ئنگلاند" هەڵفڕین، منیان لەو گوندەدا جێهێشت. پێش ئەوەی كە سەفەر بكەن "مهەمەد" و باوكی زۆر جار لە ماڵەوە ئەو پرسیارەیان لە یەكتری دەكرد، دەیان گوت: "رێگای "زانا" بدەین لەگەڵ "ئەبدولا" بۆ "ئنگلاند" بگەڕێتەوە..؟" وا دەزانم "ئەبدولكەدا" ئەو دەسەلاتەی بەسەر مندا هەبوو، كە بڕیار لەسەر ژیانم بدا، دڵخۆش بم،یان دڵپەژارە و نا ئارام بم. جاروبار وا هەستم دەكرد كە "مهەمەد"برایەكی گەورەمە و گوێم لێڕادەدێرێ، جاروباریش هەڵدەگەڕایەوە، بەشێوەیەك لە شێوەكان دڵم لێی پیس بوو. هەندێك جاریش بە تەواوی پشتگوێی دەخستم و لە پاشملە لە بارەی منەوە لەگەڵ كەسانی تردا باسی دەكردم و پێم پێدەكەنی كە گوایا لە پلانەكەمدا سەركەوتوو نەبووم. زۆرجار كە لە ژوورەكەی خۆم بووم ئەم شتانەم دەبیست و گوێم لێدەبوو.

كاتێك كە پیاوەكان لە ماڵەوە دەبوون، هەمیشە خواردنی خۆشمان دەخوارد. بەلام هەر كاتێك پیاوان لە ماڵ نەبوونایە ئەوا خواردنی سەرەكیمان تەنیا "چاپاتیس" بوو، "ئەبدولكەدا" پیاوێكی نەوسن و خواردە بوو، هەمیشە دەبووایە خواردنی ئێوارانی گۆشتی مریشك، یان گۆشتی مەڕ بووایە. خۆمان لە ماڵەوە مەڕمان سەردەبڕی. مەڕێكی گەورە بەرگەی سێ یان چوار ڕۆژی دەگرتین، كاتێك كە مەڕێكیان سەردەبڕی بە گوریسێك سەرەو خوار بە دەرگای چێشتخانەكەوە هەڵیاندەواسی و كەوڵیان دەكرد، هەرچی مێش و مەگەز بوو لەو لاكە كۆدەبوونەوە. بە هەر چواردەوردا گیزو هوڕیان دەهات. زۆربەی خەڵكی گوند مریشكی زیندوویان لە یەكتری دەكڕییەوە، بەلام ماڵی "ئەبدولكەدا" خۆیان مریشكی زۆریان راگرتبوو، لەبری ئەوە پێویست بوو هەموو ئەندامانی ماڵ بتوانن بە ژن و پیاوەوە مریشك سەربڕن.

منیش خۆم فێری مریشك سەربڕین كرد. پێش ئەوەی كە مریشكەكە سەربڕن. ملی مریشكەكەیان بادەدا و هەندێك پەڕیان لە ملەكەی دەردەكێشایە دەرەوە، پاشان

سـەریان دەبـڕی دوای ئـەوە، ئاویـان لــە نــاو مەنجــەڵێکدا لەســەر ئــاگر بــۆ دەکوڵانــد، مریشکەکەیان بۆ ماوەی چەند خولەکێك دەخستە ناو ئاوە گەرمەکـەوە، تـا بـە تـەواوی پێستـەکەی نـەرم دەبـوو، دوایـی دەریـان دەهێنـا بـە چـەپك پەڕەکـەیان لـە دەسـتیاندا دەسکەن ە و گرمۆڵە دەکرد و ڕایاندەکێشایە دەرەوە. بەو جۆرە مریشکەکەیان ئـاوەڕووت دەکرد. ئەز هەر کاتێك کە مریشکێکم سەر دەبڕی ئاواتخواز بووم،کە ئەو ملی مریشکە، ملی "ئەبدولکەدا" بێ و لە لاشەی جودای بکەمەوە.

ئەم خەڵکانــە جـۆرە جـەژنێکی تایبـەتیان هەیـە،جـەژنێکی ئاینیـە، وەکـو جـەژنی کرسمس وایە، هەروەك چۆن ئێمە بۆنەی دەکەینەوە. ڕۆژێك لەو ڕۆژانــە پێویسـت بـوو "وەردە" مەڕێك سەربڕێ، بەڵام گوتی: "ئەو کارە ناکەم پێویستە یەکێکی تـر بیکـات." خوشکێکی "ئەبدولکەدا" لە ناو گونددا دەژیا، بەڵام بۆ مـاوەی چـەند هەفتەیـەك هاتـە سەرەو ە، لای ئێمە مایەوە. ئەو ژنە بڕیاریدا مەڕەکە سەربڕێت، منیش لەگەڵیدا چووم یارمەتی بدەم. ئەو ژنە مەڕەکەی گرتوو یخیدا،خۆی هاویشتە سەر لاشەی مەڕەکە، ملی مەڕەکەی بەرزکردەوەو کێردێکی گەورەی خستە سەر ملی. ئــەو مرۆڤانــە پێش ئـەوەی کە شتێك سەربڕن، بە زمانی "ئارەب"ی ناوی خوای لێدێنن، کـاتێك کـە کێردەکـەی بـە ملی مەڕەکەدا هێنا، بە تەواوی کارەکەی مەیسـەر نـەکرد، لـە بـری ئـەوەی کـە مەڕەکـە گیان بە دەستەوە بدات، کەوتە خۆ ڕاپسکاندن و دەرباز بوون. ئەو ژنە نـەیدەزانی چـی بکات، خوێنی ملی مەڕەکە بە هەموو لایەکدا پرژەی دەکرد. منیش هاوارم لێکـرد، "تـۆ مرۆڤێکی بێبەزەییت." بە پرتاو کێردەکەم لـە دەسـتی وەرگـرت، ملـی مەڕەکـەم یـەکاڵا کـردەوە و خوێنەکـە بـە هـوروژم هاتـە دەرەوە. مـن ئـەوە لـە پیاوەکانـەوە فـێر ببـووم، چەند جـارێك لەبـەر چـاوم مـەڕیان سـەربڕی بـوو.دوای ئـەوە کـە دڵنیـا بـووم، وازم لـە مەڕەکە هێنا، بەڵام ئەو ژنە خۆیدا بەسەر مەڕەکەدا تاکو لە لنگە فرتێ کەوت و گیـانی دەرچوو.

خەڵکی گوندەکان لە بارەی کەمتیارەوە زۆر شتیان دەگێڕایەوە،کە ئەو کەمتیارانـە لـە چیاکـان چـۆن پـەلاماری پیـاوی بـە خـۆو بـەهێزیان داوەو خواردویانــە، باســی گورگیشیان هەر بـەو شـێوەیە دەکـرد. دەیـان گـوت: "کـاتی خـۆی ئـەم ناوچەیـە شـێری

هەبوو، بەڵام کاتێك درەخت و دارستانی ئەم ناوەیان بڕیوەتەوە، شێرەکان نەماون و سەری خۆیان هەڵگرت." ئەو ماوەیەی کە من لەوێ ژیام، بە هیچ جۆرێك ئەو ئاژەڵە کێویانەم نەبینی،بەڵام شەوانە گوێم لە دەنگیان دەبوو دەیانلوراند. یان شەوانە نزیکی ناو گوند دەکەوتنەوە بە دوای خواردندا دەگەڕان.خوشکەکەی "ئەبدولکەدا" ورگ و پێست و کەللە و پێچکەکانی مەڕەکەی، بۆ ئەو ئاژەڵە کێویانە فڕێدایە دەرەوە کە شەو بیخۆن. شەوێ گوێم لە هەرا و مرخەی ئەو ئاژەڵانە بوو، کە خۆیان گەیاندبووە سەر ئەو شتانە، لەبەردەم پەنجەرەی ژوورەکەمدا شەڕ و مرخێش مرخێشیان بوو.

پیاوانی ناو گوند هەمیشە تفەنگی ڕاویان هەڵدەگرت، بۆ کوشتنی ئەو ئاژەڵە کێویانە و بۆ پارێزگاری لە خۆ کردن. شەوێکیان لە ژوورەکەی خۆم راکشابووم، گوێم لە دەنگی تەقەی تفەنگێك بوو زرمەی کرد، کاتێك کە چوومە بەر پەنجەرەی ژوورەکەم، سەیری دەرەوەم کرد، ڕووناکی و تیشکی لایتێکم بینی، بۆ بەیانی گوتیان، شەوێ کەمتیارێك نزیکی ناو گوند بۆتەوە و کوشتویانە، ئەو کەسانەی کە کەمتیاریان راو دەکرد، دانەکانیان دەردەهێنا، بۆ چاوەزار و بەختی باش هەڵیان دەگرت.

لەماڵەوە هەندێك جار خواردنەکانمان دەگۆڕی، جاروبار سوورەماسیمان دەخوارد بە پەتاتەی کوڵاوەوە، بەڵام زۆربەی جار برنجمان لەگەڵ هەموو خواردنێکی تردا لێدەنا، خواردنەوەی سەرەکی لەو وڵاتانە "چا"یە، ئەگەر پیاوان لەماڵ بوونایە،دەبوو چای کیسە لێبنرایە. بەڵام ئەگەر ژنان بە تەنیا لە ماڵەوە بن، دەبێت چای وشك لێبنرێت. چای تورەکە نیشانەی چینایەتی و دەوڵەمەندیە. بەڵام چای وشك تەنیا بۆ هەژارانە و ئەوان لێیدەنێن و دەیخۆنەوە.ئێمە هەندێك جار قاوەشمان لەو خێزانانە دەکڕی، کە خۆیان دەیانچاند و بەرهەمیان دەهێنا.

کاتێك کە پیاوان لە ماڵەوە نەدەبوون، لەسەر ژنان پێویست بوو هەموو کارێك بکەن و پێی هەستن، ساڵی جارێك یان دووجار، دەبوایە جووت بکرایە. ئەو ژنانەی کە نەیاندەتوانی و شارەزا نەبوون، ئەوا وەرزێریان بە کرێ دەگرت کە ئەم کارە بکات، بەڵام "وەردە" پیسکە بوو، کەسی بەکرێ نەدەگرت ئەو کارە بکات، ئەو کارەی بە ئێمە دەکرد. لە ماوەی چەند هەفتەیەکدا بە ناچاری دەبوایە بەرەو دەشت بچوومایە، بە

خۆم و بێڵەکان و پێمەڕەوە بۆ پاچە کۆڵە و زەوی ئسپار کردن. چاندنی شەتڵ بە ڕیز و بە دێراو، ئەو ڕۆژگارە دوورو درێژانە، هەر لە بەیانی زووەوە لە خەو هەڵدەستام، بەرەو دەشت ڕێگام دەگرتە بەر، لەو دەشت و ناو کێڵگانەدا بەو تاو و تینی گەرمایە، خەریکی چاندنی شەتڵ لێدان و پاچەکۆڵە دەبووم، تا ئێوارەیەکی درەنگ. ئەو ماوەیە بە تەواوی پشتم دەیدایە ئازار، دەست و پاکانم هەموو تلۆقیان دەکرد و پلیان دەداو و ئازاریان لێهەڵدەستا. لەبەر گرو گەرما پیاو هەمیشە تینووەو ئاو دەخواتەوە. "بەکالە"ش هەندێك جار یارمەتی کارەکەی دەدام، بەڵام لەبەر ئەوەی ئەو منداڵی سەروپێچکەی هەبوو، "وەردە" بۆ ماڵەوە دەیناردەوە. هەندێك کاری ناو ماڵی پێدەسپارد کە بیانکات. "وەردە" ژنێکی گورجوگۆڵ و بەخۆ بوو، هەمیشە چاوێکی لەسەر من بوو، دەیویست منیش وەکو ئەو کار بکەم. ژنانی ئەو ناوچەیە هەموویان گورجوگۆڵ و کارکەرن، تەنانەت کە ئێواران بەرەو ماڵ دەبوونەوە، ئەو هەموو کەلوپەلانەیان دەخستە سەر تەپڵی سەریان و بۆ ماڵەوە دەیانهێنایەوە.

ئێمە بەزۆری گەنم و گەنمەشامیمان دەچاند. چەند مانگێکی دەخایاند تا ئەم دانەوێڵانە بە بەر دەبوون و پێدەگەیشتن، لە هەمانکاتدا فەڕوبەری دانەوێڵە دەکەوتە سەر ئەوە تا چ رادەیەك باران دەبارێ. کاتێك گەنمەکە پێدەگەیشت و وشك دەبۆوە دەماندووریەوە و پاکسازمان دەکرد و دەمانکردە ناو دەبەوە، هەر دەبەیەك نزیکەی بەشی هەفتەیەکی دەکردین، ئەم کارە گەلێك گران بوو، پاشان دەبوایە هەموو ڕۆژێك بە بەردەوامی ئەو گەنمەمان بهاڕیایە و بمانکردایە بە ئارد، ئەمە کارێکی گەلێك گران بوو ماوەی چوار ساڵی ویست تاکو پێستی دەستەکانم بە تەواوی مردن و لەگەڵ ئەم کارەدا راهاتم.

لە ماڵەوە بەدەستهاڕ گەنممان دەهاڕی، یان لە ژێرخان یان لەسەربان ئەو کارەمان دەکرد. ژنان دادوبێدادیان بوو بە دەست گەنم هاڕین و گەنمەشامی هاڕینەوە، ئەوە تەنیا شتێك بوو، کە هەمیشە ژنان لێی دەدوان.

پاش ماوەیەکی زۆر بەوەم زانی، کە هەندێك ژنانی ناو گوند، مەکینەی ئاشی بچوکیان بەکار دەهانی،هەندێکیشیان گەنمەکەیان دەبرد بۆ ئاشی دەرەوە و دەیانهاڕی،

له بری هـاڕینی گەنمەکـه هـەندێك گـەنمیان بـه ئاشـەوانەکه دەدا. بـەڵام "وەردە" ئـەو کـارەی نـەدەکرد، سـوور بـوو لەسـەر ئـەوە، کـه دەبـێ خۆمـان لــه ماڵــەوە بــه دەســتهاڕ گەنمەکه به شێوەی باوی و کۆن بـهاڕین. لەگـەڵ ئەوەشـدا ئـەم گـەنم هاڕینـەی ماڵـەوە ڕۆژێکی تەواوی دەویست. هـەندێك ژنـی نـاو گونـد لـه بـارەی ئـەوەوە لەگـەڵ "وەردە" دەدوان،داوایان لێدەکرد که گەنمەکه بنـێرێ بـۆ ئـاش ئاسـانتر و هـەم باشتریشـه. پێیـان دەگـوت: "بۆچـی ئـەو کچـه "ئنگلیـز"ەت خسـتۆتە ژێـر ئـەو بـارە گرانــەوە...؟" بــەڵام "وەردە" بەم شێوەیه وەڵامی دەدانەوە: "خەمی ئەوتان نەبێ... ئەوە "ئنگلیزە" با فێر بێ."

بـەم شـێوەیه ناچـار بـووم، کـه هـەر ڕۆژە نـا ڕۆژێـك ئـەو کـارە بکـەم خـۆ ئەگـەر میوانمان بهاتایە، ئەوە ناچار بووم که گەنم زۆرتر بهاڕم، بۆ ئەوەی بەشی میوانەکانیش بکات. خۆ ئەگـەر ڕۆژێکیـش بچووینایـه بـۆ دەشـت و سـەر کێڵگـه، ڕۆژێـك پێـش ئـەوە، دەبوایــه گــەنمێکی زۆرتــرم بهاڕیایــه، کــه بەشــی چــەند ڕۆژێکــی بکردینایــه. کــاری وەرزێریش لەو لاوە چاوەڕێی دەکردم. جگه لەوە، دەبوایه بـه بـەردەوامی بـەیانیان ئـاو به سەتڵ کێش بکەم و تەنکیەکانی ماڵەوە پـڕ ئـاو بکەمـەوە، لەمانـەش تـەواو دەبـووم، دەبوایـه بچوومایـه بـۆ چیلکـه کۆکردنـەوە بــۆ ســووتاندن، پــاش ئــەوە ماڵەکــەم پــاك بکردایەتـەوە و گەســکم بدایــه. بــه بــەردەوامی تــۆزو خــۆڵ لــه دەرەوە دەهاتــه نــاو ژوورەکانــەوە، لـه هـەموو شـتێك دەنیشـت، هـەروەها شـەوگەڕ و مارمێلکـه لـه بنمیچــی ژوورەکـاندا هێلکـەکانیان دادەنـا، بـەو جـۆرە هەمیشـه ناوماڵەکـه پیـس و هـەرگیز پـاك نەدەبۆوە.

جارێکیان له ژوورەکەی "بەکاله" دانیشتبووم "قۆڕی" یەك خۆی کـرد بـه ژووردا منیـش تـا لـه توانـامدا بـوو زریکـاندم، لـەو کاتـەدا منداڵەکـەی "بەکالـه"ش خــەوتبوو، "بەکاله" به ڕاکردن خۆیکرد بـه ژووردا و کوشـتی. جـارێکی تریـان مـارێکم لـه لێفـەی یەکێك له منداڵەکاندا بینی پەپکەی خواردبوو. هەروەها به بـەردەوامی جاڵجاڵۆکـه لـه هـەموو شـوێنێکی خانووەکـه دەبیـنران. جـارێکی تریـان لـه دەرەوە لەبـەر هـەتاو خــۆم هەڵخسـتبوو، چاوەکـانم لێکنـابوون، دەسـتەکانم خسـتبوونه پشـت سـەرم، لـه ناکـاوێکدا

هەستم بە شتێك كرد، لە ژێر بن باڵمدا دەجووڵێتەوە، كـاتێك كـە سـەیری بنبـاڵم كـرد جاڵجاڵۆكەیـەكی ڕەشـی توكـن، لەسـەر خـۆ بـە بنبـاڵمدا هەڵدەگـەڕا. هـەر بـە دیتنـی هەناسەم سوار و موچوڕكە بـە لـەشمدا دەهـات و زریكـاندم. پاشـان كەوتـە خـوارەوە بـۆ سەر زەویەكە، بە پێكانم بە زەویەكەدا پانم كردەوە. بە گریان و ترسـەوە خۆمكـرد بـە ژووردا، بۆ ئەو مرۆڤانەم گێڕایەوە كە چی ڕوویداوە، بەڵام ئەوان بە شـان هەڵتـەكاندن وەڵامیان دامەوە. لای ئەوان شتێكی شایانی باس نەبوو.

شـتێكی ترسـناكی تـر دووپشـك بـوو، جارێكیـان بـە پێپلیكانـەكاندا دەچوومـە خوارەوە، گۆزەیەكم لەبن هەنگڵدا بوو، دەمویست بۆ سەر بیر بچـم بـۆ ئـاو هێنـان، كـە هەسـتم كـرد بەسـەر كەڵەموسـتی پامـەوە شـتێك دەجوڵێتـەوە، هـەتا لـە توانـامدا بـوو گۆزەكەم تووڕدا و بـە ڕاكـردن چوومـە دەرەوە، بـۆ بـەر ڕووناكاییەكـە، كـە سـەیردەكەم دووپشكێكی ڕەشی گەورەیە بە پامەوە خۆی نووساندوە هـەوڵی ئـەوە دەدات چزوەكـەی لـە كەڵەموسـتم ڕۆچێنـێ، بـەڵام بـاری ڕاوەسـتانەكەی وا بـوو چزوەكـەی نەدەگەیشـتە پەنجەم. "بەكاڵە" گوێی لە هاوارەكەم بوو، بە ڕاكردن گەیشتە سـەرم و بـە چیلكەیـەك دووپشكەكەی لەسەر پام لابرد، دووپشكەكە فریای خۆ ونكردن و دەرباز بوون كەوت.

"نادیا"ی خوشكم بەختی لە بەختی من باشتر نەبوو، لە ناو ئەو گوندیانەدا ژنان جۆرە ڕ ووەكێك بەكاردێنن كە پێیدەڵێن "ڕێهانە" ئێمە دەماندا لە سـەرمان، ژنـان ئـەم ڕووەكە چەپك دەكەن و دەیخەنە ناو گوڵدانەوە ئەم ڕووەكە بۆنێكی خۆشی هەیە، ژنان ئەم "ڕێهانە" یە دەخەنە ناو بوخچەی جلەكانیانەوە، تاكو جلەكانیان بۆنی خـۆش بـێ، ڕۆژێكیان "نادیا" دەیەوێ، تۆوی ئەو "ڕێهانە"یە لـە ئینجانەیـەكدا بچێنـێ، بـە دەسـت نەختێك گڵی بۆ چاك دەكات و دەیچێنێ. چـەند ڕۆژێـك دوای ئـەوە "نادیـا" كـە سـەیر دەكات كونێك لە خۆڵی ناو ئینجانەكە بووە، دەیەوێ بە دەست كونەكە پڕ بكاتـەوە، لـە ناكـاو چـزە لـە دەسـتی هەڵدەسـتێ، كـاتێك "نادیـا" هـاواری لێهەڵدەسـێ "سـەلامە"ی خەسووی گوێی لە هاوارەكـەی "نادیـا" دەبـێ، رادەكـا بزانـێ چـی ڕوویـداوە، كـاتێك كـە دەگاتـە سـەر "نادیـا" كـە سـەیر دەكـات دوو پشـكێك لـەناو خۆڵـی ئینجانەكەدایـە، بـە "نادیا"یەوە داوە.

دووپشکەکە ژەهرەکەی کردبووە دەستی "نادیا"وە و چوو بووە خوێنیەوە، بەو شێوەیە هەموو لەشی "نادیا" هەڵئاوسا و سوور هەڵگەڕا. لەڕاستیدا بەتەمای نەمام، دەمگوت چاك نابێتەوە و دەمرێ. بەڵام ژنە گوندیەکان جۆرە هەتوانێکیان لە ڕەگی ڕووەك بۆ دروستکرد، چەند جارێك لە جێگای چزوەکەیان سوو، چەند ڕۆژێکی برد"نادیا" چاك بۆوە. هەندێك کەس کە دووپشك پێیانەوە دەدا دەمرن و هەندێکیش چاك دەبنەوە.

ئێمە ناچار بووین بە بەردەوامی خزمەتی مەڕو ماڵات و ڕەشە وڵاخیش بکەین. ئەگەر ئاژەڵ لە ژوورەوە بوونایە، دەبوو گەوڕەکان بە دەست بماڵین، ئەگەر بکرانایەتە دەشت و دەریش، دەبوایە بە دیاریانەوە شوانێتی بکەین و ئاگامان لێیان بێ، لە کەمتیار و گورگ و ئاژەڵی دڕندەی تر بیانپارێزین. ڕۆژانی گەرما بەو خۆرەتاوە شوانکاری کارێکی ئاسان نەبوو. ئەگەر لە دەرەوە لەلای ئاژەڵەکان بوومایە، ئەوا ناچار لەبەر ئەو گەرما و خۆرەتاوە، شوێنێکی سێبەرم بدۆزیایەتەوە و مەڕەکانم مۆڵدایە و خۆشم لێی دانیشتمایە، بەڵام ئەوەش هەموو جارێك نەدەلوا، هەر چۆنێك بوو ئەو چوونە دەرەوەیە بۆ من باش بوو، بە تەنیا دادەنیشتم بە ئازادی بیرم دەکردەوە، ئەو کاتانە هەستم بە هەموو ئازارەکانم دەکرد، و دەمزانی کە هەموو گیانم بە ئازارە، دەستم دەکرد بە گریان و فرمێسك هەڵڕشتن. هەستم دەکرد کە تەسکینیم بە گریان دێ.

ئەو کاتانەی کە تۆزێك وچانم دەدا، ئێواران بوو. کاتێك کە لە هەموو کارو فەرمانێکی ڕۆژانە دەبوومەوە، کردبووم بە خوو، دەچووم بۆ لای باوکی "ئەبدولکەدا"، ئەو پیاوە بەو ڕۆژگارە درێژە لەسەر سەکۆی دەرەوە لەبەر ئەو هەتاوە لێی دادەنیشت، منیش ئێواران دەچووم بۆ لای دادەنیشتم، لە بارەی هەموو شتێکەوە، دەستمان بە گفتوگۆ دەکرد. ئەو هەمیشە باسی ڕۆژگاری رابردووی خۆی بۆ دەکردم، کە چۆن ژیانی بەسەر بردووە، خەڵکی چۆن ژیاون، بۆ نموونە باسی ئەوەی دەکرد، کە چۆن ناچار بوون بەرد لەو کێوانە هەڵکەنن و داتاشن، بۆ ئەوەی خانووی پێدروستکەن. من هەمیشە باسی بەختڕەشی و ناکامەرانی خۆمم بۆ دەکرد، کە چۆن ئەمانە مامەڵەم لەتەکدا دەکەن، چۆن ئاوا بەبێ خواستی خۆم ئەو چارەنووسە نەگریسەیان بەسەرمدا

سەپاندووە، چۆن بیری وڵاتی خۆم و کەسوکارم دەکەم. ئەو پیاوە زۆر بەسۆز و پاك بوو، بەڵام دەسەڵاتی هیچی نەبوو، تەنیا شتێك کە لە دەستی دەهات، دڵی دەدامەوە و زوو زوو دەیگوت: "دان بە خۆتدا بگرە و ئارام بگرە، خەم مەخۆ، من دڵنیام لەوە کە ڕۆژێك دێ بۆ "ئینگلاند" دەگەڕێیتەوە."

# بەشی نۆیەم
# ژیانێکی سەخت

"ئەبدولکەدا" بە سەردان بۆ ناو گوند گەڕایەوە، بڕیاری ئەوەیدا کـە دەسـتێك بـە خانووەکەدا بێنێ و ئاڵوگۆڕێکی تێدا بکات. ئێمە بەر هەیوانی سەرەوەمان وەك سەکۆ و بەربەرۆچکە بەکار دەهێنا. بەڵا م ئەو بیری لەوە کردەوە کە بیکات بە ژوورێکی گـەورە. بۆ ئەم مەبەستە داوای لە هاوڕێکانی کرد یارمەتی بدەن، لەگـەڵ ئەوەشـدا کرێکـارێك و وەستایەکی خانووی بەکرێ گرت. دروستکردنی ئەم ژوورە چەند مانگێکی خایاند.

ئێمە پێویستمان بەوە نەبوو کە بچین بەرد لە چیا هەڵکەنین، بـەو شـێوە کۆنـەی کە باوکی "ئەبدولکەدا" بۆی گێڕامەوە، "ئەبدولکـەدا" لـە شـارەوە بلـۆك و چیمـەنتۆی بە لۆری بۆ هێنا. بەڵام لەبەر ئەوەی کـە لـۆری نەدەگەیشـتە ئـەو کەشکەلانە کـە مـاڵی "ئەبدولکەدا"ی لێبوو. ئـەو کیسـە چیمـەنتۆ و بلۆکانـەیان لـە خـوارەوە لـە بـن کلکـەی چیا اکە داگرت، دەبووایە من ئەو شتانە بەسەر شان بۆ ماڵەوە بگوێزمەوە. کاتێك کیسـە چیمـەنتۆکانم دەخسـتە سـەر سـەرم، زۆربـەی جـار کیسـەکان دەدڕان، چیمـەنتۆ بەسـەر لەشولارما بڵاو دەبۆوە و دەچووە ناو چاوانم و دەمیشمەوە، یان تێکەڵاوی ئارەقی لەشـم دەبوو. بۆ ماوەی هەفتەیەکی تەواو ئەمە کارم بـوو، هـەر لـە بەیانیـەوە تـا ئێوارەیـەکی درەنگ، دەبوایە لەو سـەرەوە بـەو ڕێگـا باریکـەدا بچوومایەتـە خـوارەوە، بلـۆك و کیسـە چیمەنتۆم بۆ سەرەوە کێش بکردایە. هەندێك جار خەڵکی یارمەتیان دەدام، بۆ نموونـە کوڕەکانی "ئەبدولنور" بەڵام لەسەر من پێویست بـوو تـا دوا بلـۆك و کیسـە چیمـەنتۆ بهێنمـە سـەرەوە. کـاری "ئەبدولکـەدا"ش تـەنیا ئـەوە بـوو، لەسـەر سـەکۆکەی دەرەوە

لەگەڵ باوکیدا دانیشێ، جاروباریش ڕەخنەی لێدەگرتم و لە کاتی هاتن و چوونمدا توانجی لێدەدام. منیش سات دوای سات هەوڵم دەدا پەلە بکەم، بۆ ئەوەی ئەو کارە تەو او بێ، بەڵام ئەو هەموو ڕەنجەم بە خۆڕایی چوو. لە ئەنجامدا "ئەبدولکەدا" لێم شێت بوو، گوتی: "کارەکەت باش نەکردووە." سەرەڕای ئەوەش بەردەوام بووم لە چوون و هاتندا، تا بە تەواوی لە پەلوپۆ کەوتم. بە هەر شێوەیە بوو، هەموو ئەو بلۆك و کیسە چیمەنتۆیانەم سەرخستە سەرەوە. ئێستا نۆرەی ئەوەیە، لەگەڵ "ئەبدولکەدا" دا چیمەنتۆ بگرمەوەو تاسە چیمەنتۆ بۆ سەربان سەرخەم. گیروگرفتێکی تریشم لە پێش بوو، ئەویش ئەوە بوو کە پێویستمان بە ئاوی زۆر هەبوو، لەو کاتانەشدا ئاو لە هەموو جێگایەك کەمی کردبوو، دەبوایە ماڵ بە ماڵ بۆ سەتڵێ ئاو بە بیرەکاندا بگەڕاینایە، ئەوسا ئاوەکەم لەگەڵ چیمەنتۆدا بگرتایەتەوە. پاشان تاسە چیمەنتۆم بە پەیژەدا بۆ سەربان سەربخستایە، بۆ دروستکردنی ئەو ژوورە پێویستمان بە ئاوێکی زۆر هەبوو، ئەوەش بۆ من کارێکی ئاسان نەبوو، ئەو هەموو ئاوە پەیداکەم، لەبەر ئەوە "ئەبدولکەدا" کچێکی لە ناو گوند پەیدا کرد کە یارمەتیم بدا، بەو شێوەیە هەر لە کازیوەی بەیانیەوە دەستم بە کار و ئاوکێشان دەکرد تا شەوگارێکی درەنگ. کاتێك کە بە شەو هاتووچۆم دەکرد لەبەر تاریکی لایتێکی بچکۆلەم پێبوو. "بەکالە"ش جاروبار لەگەڵمدا دەهات لەبەر ئەوەی دنیا تاریك بوو دەترسام، زۆرجاریش بە ناچاری خۆم بە تاك و تەنیا بۆ ئاوکێشان دەچووم، بۆ ئەوەی بێ ئاو نەبین.

نزیکەی دوو هەفتەی برد بارانێکی زۆر باری، منیش لە خۆشیاندا دەگریام، بیرم لەوە دەکردەوە کە ئیتر پێویست بەوە ناکات بە دوای ئاودا ئەم بیر و ئەو بیر ڕاکە ڕاکەم بێت. بەڵام "ئەبدولکەدا" فەرمانیدا کە ئەم ئاوەش بەرگە ناگرێ و بەش ناکات. لەبەر ئەوە ناچار دوو هێندەی جاران ئاوم کێش دەکرد، پێش ئەوەی کە ئاوەکە لە چاڵئاوەکاندا بە زەویدا بچێتە خوارەوەو نەمێنێ، ئەو سێ تانکیە گەورەیەی کە لە سەربان بوون، دەبووایە هەمیشە پڕ لە ئاو بوونایە.

لەبەر ئەوەی کە پیاوی بیانی لەماڵەوە کاریان دەکرد، دەبوایە سەرپۆش و پەچە بدەین بەسەرسەرمانا و شتێکی تریش لەوە ناخۆشتر ئەوە بوو، بەو ڕۆژە گەرم و تینوتاوە بە پێوە ڕاوەستامایە و کارم بکردایە.

"سەلامە"ی ژنی "جەواد" بەرمیلێکی بە تاڵی داینێ، "ئەبدولکەدا"، پرسیاری کرد، """زانا" دەتوانی بڕۆی ئەو بەرمیلە لە گوندەکەی "جەواد" بێنی..؟" منیش یەکسەر وەڵامم دایەوە. "ئا" بیرم کردەوە هەر چۆنێك بێ دەچم "نادیا"ی خوشکم دەبینم، ئەگەر بۆ چەند چرکەیەکیش بێ. "تەمەنا"م لەتەك خۆمدا برد و ڕۆیشتم. کاتێ بە ڕێکەوتین "ئەبدولکەدا" هاواری لێکردم، "زانا زۆر لەوێ بەند نەبی." کاتژمێر نزیکەی یەك و نیو بوو، ئەو درێژەی پێدا. "دەمەوێت کاتژمێری سێ لێرە بن." بەو گڕوگەرمی خۆرەتاوە تا گەیشتینە "ئاسکۆبی" هەموو گیانمان لە ئارەق و تەپوتۆز هەڵکشا، کە گەیشتینە ماڵی "سەلامە" پێم گوت: "هاتووین بۆ بەرمیلی ئاوەکە دەماندەیتێ...؟" "سەلامە" گوتی: "ئا ئەوەتا بیبەن." بۆ ماوەی چەند خولەکێك لەگەڵ "نادیا" دانیشتم، هەموو ئەو دەردیسەریانەم بۆ گێڕایەوە، کە چ کارێکی گران دەکەم و "ئەبدولکەدا" چۆن پشووی لێبڕیوم، نایەڵێ ساتێك دانیشم. "نادیا" گوتی: "با من بێم یارمەتیت بدەم." بە "نادیا"م گوت: "نا.. چۆن دەهێڵم تۆ بکەویتە ژێر ئازارەوە." لەڕاستیدا من نەمدەویست باسی ئەو شتانە بۆ "نادیا" بکەم کە دلگرانی دەکەن، من دەمویست تەنیا خۆم ئەو ئازارانە بچێژم. لەبەر ئەوەی "نادیا" کچێکی منداڵ بوو، لەسەر من پێویست بوو کە بەرگری لێبکەم و بیپارێزم و گرفتی بۆ دروست نەکەم.

ماوەیەك بە گفتوگۆوە خەریك بووین و هەموو شتێکمان بیر چووەوە، لە ناکاو بە بیرمدا هات، کە پێویستە دەستبەجێ پێش ئەوەی تووشی لێپرسینەوە و لێدان بم بگەڕێینەوە. بەو خۆرەتاوە گەرمە جارێکی تر ڕێگای ماڵەوەمان گرتەوەبەر. بەرمیلی ئاوەکە بەرمیلێکی گەورە بوو، ئەگەر لە تەنیشتی بەرمیلەکەوە رابوەستامایە، نزیکەی هێندەی باڵای خۆشم بەرز بوو. بەڵام بە یارمەتی "سەلامە" و "نادیا" توانیم بیخەمە سەر سەرم. ئێستا لە خۆم رادەبینی، وەکو گوندیەکان بەسەر سەر شت هەلگرم. ڕێگای

ماڵەوەم گرتەبەر، کەوتمە پەلەکردن و خێرا ڕۆیشتن، "تەمەنا"ش لە تەنیشتمەوە دەڕۆیشت. لە ناکاویێکدا پێم لە بەردێك هەڵنوتا و بەرمیل لەسەر سەرم بەر بۆوە و خۆشم کەوتم. لەبەر ئەوە کاتژمێر لە سێ لاید ا بوو. ترس و لەرز دایگرتم، دەمزانی کە "ئەبدولکەدا" بەرد بەسەرمدا دەبارێنێ.

بە "تەمەنا"م گوت: " "تەمەنا" کات لایداوە، پێویستە پەلە بکەین، یارمەتیم بدە با ئەو بەرمیلە بخەمەوە سەر سەرم."

"تەمەنا"ی ژیکەڵەی بچکۆلە، هەموو توانای خۆی خستبووە کار، یارمەتیم بدا، ئەو بەرمیلە بخاتە سەر سەرم. بەڵام "تەمەنا" نەیتوانی بەرمیلەکە بجولێنێ، کیژێکی وا منداڵی لاواز ئەو کارەی بۆ نەدەکرا. لەوەش دەترسا ئەگەر درەنگ بکەوین چیمان بەسەر دێ. لە ترساندا لوشکە لوشك دەگریا. منیش هیچ چارێکم نەبوو ئەوە نەبێ، کە بە تەنیا خۆم بەرمیلە کە بەرز بکەمەوە و بیخەمە سەر تەپڵی سەرم، لە پێشدا خۆم چەماندەوە و پاشان بەرمیلەکەم لارکردەوە و رامکێشا، بۆ ئەوەی بیخەمە سەرسەرم، پاشان خۆم راستکردەوە هەوڵمدا بەرمیلەکە لەسەر سەرم نەخزێ، ویستم پشتم راست بکەمەوە، لەو کاتەدا هەموو دەمارەکانی لەشم دەیانزریکاند خەریك بوو گازەرەی پشتم لە گرێژەنە دەرچێ، خرچە لە پشتمەوە هەڵدەستا. لەبەر ئازاری دەمارەکانم ئاگادار نەبووم کە درکێك بە دەموچاومەوە نووساوە، ئەوکاتەی بەرمیلەکەم بەرز کردەوە درکەکە لە ڕوومەتم ڕۆچوو، لەبەر ئازاری درکەکە خۆم بۆ نەگیرا، بەرمیلەکە لەسەر سەرم بەربۆوە، "تەمەنا" لە دوامەوە لە زرمەی بەرمیلەکە زراوی چوو.

درکەکەم لە ڕوومەتم دەرهانی، خوێن بە ڕوومەتمدا هاتە خوارێ، وام هەست دەکرد کە خوێن لە هەموو گیانم دەچۆڕێ. وام لێهات گوێم نە دەدایە ئازار و ژان هەر لە خەم و ترسی ئەوەدا بووم کە چۆن ئاوا درەنگ کەوتین،لە دڵی خۆمدا دەمگوت، دەبێ "ئەبدولکەدا" لە سزای ئەم دواکەوتنەم چیم لێبکات...؟

جارێکی تریش خۆم چەماندەوە، بۆ ئەوەی بەرمیلەکە بخەمەوە سەر سەرم، ئەم جارە زۆرم لە خۆم کرد کە بتوانم راستبمەوە، هەوڵەکەم سەری گرت، بەرەو تولە ڕێگای چیاکە بەرێک ەوتم. کاتژمێر سێ و نیو گەیشتینە بەردەمی ماڵەوە، "وەردە" هات

بۆ ئەوەی یارمەتیم بدا، بەرمیلەکە لەسەر سەرم داگرم، ئەو دەیویست بزانێ بۆچی دەموچاوم خوێناویە، بەڵام من خۆم لە بیر چووبوۆوە و توانای وەڵام دانەوەم نەبوو، خەریك بوو دەبووورامەوە. "وەردە" پێی گوتم: "بچۆ بۆ سەرەوە بۆ لای "ئەبدولکەدا" و پێی بڵێ کە گەڕاویتەوە،" هەر هەنگاوێك کە بەسەر پێپلیکانەکاندا هەڵم دەنا، وەك سەرکەوتن بوو بەسەر دیواری مەرگدا، تا گەیشتمە سەرەوە، ئەژنۆم شکا.

هەر کە "ئەبدولکەدا" چاوی پێمکەوت بە تووڕەییەوە گوتی: "بۆچی وا درەنگ ها تیتەوە..؟" تا ئەو کاتەش توانای وەڵام دانەوەم نەبوو، هەر هێندەم زانی کە دەستی دایە پێڵاوە کۆنەکانی پێی، بە هەموو هێزی زرمەی لە دەموچاوم سرەواند. خۆم بۆ نەگیرایەوە بەپشتا لەترمدا، بە پێپلیکانەکاندا بۆ خوارەوە سەرەو لێژ بوومەوە، بە بێ ئەوەی توانای ئەوەم هەبێ خۆم بگرمەوە، ئەمجارەش بە پرتاو گەیشتەوە سەرم. "دەڵێم بۆچی وا درەنگ هاتیتەوە..؟" لە ناکاو زمانم پژاو گوتم: "بەرمیلەکە زۆر گەورە و گران بوو، دڕکێکیش چوو بە ڕوومەتمدا و برینداری کرد." بەڵام ئەو گوێی لێنەگرتم و گوتی: "خێرا بڕۆ بۆ ناو گوند، نەختێ نەوت بکڕە."

من و "تەمەنا" جارێکی تر ڕێگامان بەرەو ناو گوند گرتە بەر و بەرەو خوار بووینەوە، لە ناو گونددا پیاوێ هەبوو، لەوەوبەر بینی بووم، ئەو پیاوە دەیتوانی بە زمانی "ئنگلیز"ی بپەیڤێ، کە چاوی بەو خوێنە وشك بووەوەی دەموچاو و فرمێسکەکانی ناو چاوم کەوت، سەرنجی دەدام، بەڵام هیچی نەگوت.

برینەکە خوێنی لێنەدەهات، بەڵام ئەو جێگا پێڵاوەی کە "ئەبدولکەدا" بە دەموچاوما کێشابووی، دەکزایەوە و ژانی لێهەڵدەستا، بە سەرپۆشەکەم جێگا ئاوساویەکەم شاردبۆوە.

سیازدە لیتر نەوتم خستە سەر سەرم، سەری تەنەکە کە بە باشی دانەدەخرا، نەوت بەسەر دەموچاومدا هاتە خوارێ، برینەکەی سەر ڕوومەتمی دەبرژاندەوە، سەرپۆشەکەم نەوتەکەی هەڵدەمژی، وام لێهات بیرم لە هیچ نەدەکردەوە لە مردن نەبێ. کاتێ کە بۆ ماڵەوە گەڕامەوە، "ئەبدولکەدا" ڕاوەستا بوو چاوەڕوانی دەکردم.. هەموو جلەکانی بەرم نەوتاوی بوون، من وا بیرم کردەوە کە "ئەبدولکەدا" چینێکی

تریش بێزارم دەکات، کە چاوی پێمکەوت. گوتی: "بچۆ خۆت بشۆ." هیچی تری نەگوت. کاتێك کە خۆم شت و گەڕامەوە، بەرەو ڕووم هات و ناوچەوانمی ماچ کرد، گوتی "زانا لێم ببورە". گوێم بە گوتەکەی نەدا، ئەو لێبووردنە زۆر درەنگ بوو. لێبووردن لەو جۆرە ئاکار و کارانە کە بەرامبەرم دەیکرد.

"بەکالە" کە چاوی پێم کەوت دەستیکرد بە گریان و برینەکەی بۆ پاك و برژاندمەوە، بە مەرهەمێك بۆی چەورکردم. هەموو خێزانەکە خەم بە ڕوویانەوە دیار و دڵتەنگی ئەوە بوون، کە چۆن مامەڵەیەکم لەگەڵ کراوە، بەڵام کەس نەبوو بوێرێ ورتە لە دەمیەوە بێتە دەرێ. تەنیا دایکی "ئەبدولکەدا" نەبێ. ئەو ژنە هەموو جارێ لەسەری هەڵدەدامێ و بەسەر "ئەبدولکەدا" دا بۆڵە و خورتەی دەکرد، بەڵام ئەو پیاوە بە هیچ جۆرێك لە ڕووی دایکیدا هەڵنەدەگەڕایەوە و بێدەنگ بوو. ئەو زۆر ڕێزی لە دایك و باوکی دەگرت، بەڵام زۆر بە ئاسانیش تووڕە بوونی دایکی پشتگوێ دەخست، بەڵام باوکی لەبەر ئەوەی کوێر و نابینا بوو، ئەو شتانەی نەدەبینی کە ڕوویان دەدا، بەڵام شەوێ بەسەرهاتەکەم بۆ گێڕایەوە، کە ئەمڕۆ کوڕەکەی چی لێکردووم. تەنیا وەڵامی ئەویش ئەوە بوو دەیگوت: "دەبێ ئارام بگری، ڕۆژێك دێ، بۆ وڵاتی خۆت دەگەڕێیتەوە، دەبێ خۆڕاگربی."

ماوەی چەند مانگێك بوو لەو گوندەدا دەژیام، بۆم دەرکەوت کە من و "نادیا" تەنیا کچ نین کە لە ناوچەی "مۆکبانە" بارمتە و دەستبەسەر بین و لە وڵاتی خۆمان هەڵکەنرابین.

خێزانەکەی "ئەبدولکەدا" بە هەموو لایەکی "یەمەن"دا بڵاو ببوونەوە. ئەو پیاوە دووخوشکی زۆر بەڕێزی هەبوو، لە گوندی "روکاب" دەژیان، "بەکالە"ش خەڵکی ئەو گوندە بوو، ئەو دوو خوشکەی "ئەبدولکەدا" مێردەکانیان خەڵکی ئەو گوندە بوون. ئەو گوندە نزیکەی نیو کاژێر لە گوندەکەی ئێمەوە دوور بوو. ئەو ژنانە زوو زوو دەهاتن و سەردانی ئێمەیان دەکرد منیش هەر زوو ئەوانم ناسی.

خانووەکانی گوندی "روکاب" لە بری بۆیە کردن و ڕەنگ کردن بە جۆرە گڵێك تەڕاویان دەکەن، ئەم گڵە لە هەندێك لە ناوچە چیاییەکاندا هەیە. گڵێکی سپیە وەك

"گەچ" وایە "گڵەسپی". ئەم گڵە شەو دەکرێتە ئاوەوە تا وەك "مڵەماچ"ی لێدێ. پاش ئەوە تەڕاوی دیوار و خانووی پێدەکرێ، لە کێوەکانی گوندی "روکاب" ئەم جۆرە گڵە هەبوو. "وەردە" بیری لەوە کردەوە، کە خانووەکە پێویستی بە تەڕاوکردن هەیە. لەبەر ئەوە من و بەکالە"ی نارد لە گوندی "روکاب" هەندێك لەو گڵە بێنین. من زۆرم پێخۆش بوو، بۆ وچانێك لە ماڵەوە دوور کەومەوە. بۆ ڕۆژی دوایی بەیانی زوو لە خەو هەستاین، چەند تورەکەیەکمان لەگەڵ خۆماندا بردو و بەڕێ کەوتین، "بەکالە" شارەزای ڕێگاکە بوو، لەبەر ئەوەی کە گوندی خۆیان بوو، بەڵام من بۆ یەکەمجار بوو، بۆ ئەو گوندە بچم. بۆ ئەوەی کە بگەینە گوندەکە دەبوایە لە کلکەی چیاکەوە بەرەو خوار ببینەوە، گوندەکە کەوتبووە ناو دۆڵێکەوە، کاتێك گەیشتینە ئەوێ، من زۆرم تینوو بوو، چووینە ماڵی یەکێ لە خوشکەکانی "ئەبدولکەدا" بۆ ئەوەی نەختێ خواردنەوە بخۆینەوە. هەر کە ئێمە گەیشتینە ماڵەکەیان خەڵکێکی زۆری گوندەکە هاتن. ئەوانە دەیانویست بزانن کە من کێم، ژنەکان زۆر بەسۆز و ڕووخۆش بوون، هەر سەیری منیان دەکرد، وا دەزانم ئەو کاتە کەسیان لە هیچ بارەیەکەوە پرسیاریان لێنەکردم. من ئەوەم دە زانی کە ئەو ژنانە هەموویان بە دوای سەرە داوێکدا دەگەڕێن، دەیانەوێ شت بزانن. ژنەکان زۆر ڕێزیان لە "بەکالە" دەگرت، لەبەر ئەوە بڕیاریاندا، کە ئەوان گڵەکەمان لە کێوەکە بۆ هەڵکەنن، ئێمە تەنیا کۆی بکەینەوە و بیکەینە ناو تورەکەکانەوە. "بەکالە" شەرمی دەکرد ئەو کارە بدا بەسەر ئەو ژنانەدا، بەڵام ئەو ژنانە "بەکالە" یان چاك دەناسی و داخوازیەکەی خۆیان بەسەر "بەکالە"دا سەپاند. بە ئێمەیان گوت: "دانیشن پشوو بدەن، ئێمە ئەو کارە دەکەین." ژنانی گوند دەستە، دەستە دەهاتن و سەردانیان دەکردین. منیش دانیشتبووم سەیرم دەکرد، لەو کاتەدا کیژێ هاتە ژوورەوە تەمەنی نزیکەی چواردە ساڵان دەبوو، کچێکی خرپنەی جوانی ژیکەڵە، کەز زەرد بە کیژە "ئنگلیز" دەچوو، لە ناو ژنەکاندا وا دیار بوو.

پرسیارم کرد: "ئەو کچە کێیە..؟" "بەکالە" وەڵامی دامەوە گوتی: "ئەویش کیژە "ئنگلیزە"، ئەو هەر زۆر منداڵ بوو کە بۆ ئێرەیان هێنا".

من دەمویست پتر لەو شتە بزانم، لەبەر ئەوە بە "بەکاله"م گوت: "دەمەوێ بچمە دەرەوە و هەندێك هەوای فێنك وەرگرم. "داوام لە کیژەکەش کرد کە بچینە دەرەوە نەختێك پێکەوە بدوێین. لە پێپلیکانی ژوورەکە چووینە خوارەوە، چەند ژنێکیش لە تەکماندا هاتن، بەلامەوە زۆر گرنگ بوو کە یەکێکی تر بناسم هەمان ئازاری ئێمەی هەبێ، ئەو کیژەش دایکی "ئنگلیز" و باوکی "یەمەن"ی بوو، بەڵام زمانی "ئینگلیز"ی لە بیر چوو بۆوە، ناچار بە "ئارەب"ی دەستمان بە پەیڤین کرد. ئەو کیژە بۆی گێڕامەوە، تاکو تەمەنی هەفت سالآن لە "ئنگلاند" ژیاوە، لەگەڵ باوك و دایك و خوشکێکیدا کە ئەو دەمە تەمەنی نۆ سالان دەبێ. کاتێك ئەم کچە دایکی دەمرێ، باوکی ژنێکی "ئنگلیز" دەهێنێتەوە، دوای ئەوە باوکی و باوەژنەکەی لەگەڵ ئەو دوو خوشکەدا، بە سەردان بۆ گوندی "روکاب" دێن، بەڵام باوەژنەکەیان زۆر بێبەزەیی و نامرۆڤانە هەڵسوکەوت لە تەك ئەم دوو کیژە منداڵەدا دەکات. لەبەر ئەوە دەیەوێ لە کۆڵ خۆیانی بکاتەوە، بۆیە داوا لە باوکیان دەکات ئەو کچانە لێرە جێبهێڵێ، باوکەکەشیان ئەمەی بەلاوە پەسەند دەبێ، ئەو دوو کچە لای باپیریان جێدەهێڵێ.

ئەو کچە بۆیگێڕامەوە کاتێك کە تەمەنی دەبێ بە دە سالان، باپیری بە شووی دەدا. ئەوەشی بۆ گێڕامەوە کە خەسووی چۆن هەڵسوکەوتێکی لە تەکدا دەکات، کوتومت وەك ئەوەی کە"وەردە" بە منی دەکرد. خوشکەکەشی بە ئامۆزایەکی خۆی بەشوو درابوو. ئەو کچە لە بارەی "ئنگلاند"ەوە هیچ شتێکی لە یاد نەمابوو. نەیدەزانی ئایا هیچ کەسوکار و خزمی لەوێ هەن یان نا. تەنیا شتێك کە بە "ئنگلیز"ی لە یادی مابوو، ئەویش ئەوە بوو، کە دەیتوانی لە یەکەوە تا "دە" بژمێرێ.

زۆر لەسەر خۆ بۆی دەژماردم، فرمێسك لە چاوەکانمەوە زەنگۆڵەیان دەکرد، بیرم لەوە دەکردەوە، ئەو کیژە کاتێك منداڵ بووە چۆن ژیاوە.؟! بەڵام ئێستا دەربارەی ژیانی منداڵی خۆی هیچ شتێکی لەیاد نەمابوو. کاتێك کە گوندەکەمان جێهێشت داوای ژیانێکی بەختەوەرانەم بۆ خواست، بەداخەوە دەمزانی کە هیچ جۆرە رووناکیەك لەبەردەم ژیانی ئەو کیژەدا نیە. لەبەر ئەوەی کەسێکی مشوور خۆری نیە، تاکو بە هانایەوە بێ و دەربازی کات.

هەر کاتێ کە بیرم لە گوتــە و گێڕانــەوەکانی ئـەو کیـژە دەکـردەوە دەگریـام. بـەڵام ئەو ماوەیەی کە لە "یەمەن" دەژیام هەستم کرد کە زۆر ئاسـایی و بـاوە، کـە کچـان لـە ئەمەریکا و "ئنگلاند" ەوە بۆ "یەمەن" دەهێنن و لەناو ئـەو گونـدە چیایانـەدا دەست بەسەریان دەکەن. زۆربەی ئەم کچانە لە هەموو شـتێك دابڕابـوون و هیـچ شـتێکیان لـە بارەی وڵاتەکانی خۆیانـەوە نەدەبیست و نـەدەزانی، بـەڵام مـن ئـەو بڕیـارەم دابـوو کـە نەهێڵم ئەو کارەساتە نە بەسەر من و نـە بەسـەر "نادیـا" بـهێنرێ. گرنـگ نیـە چـەند دەخایەنێ، بەڵام پێویستە بە بەردەوامی لە هەوڵ و کۆششدا بم تـا ئـەو کاتـەی خۆمـان رزگار دەکەین و دەگەڕێینەوە.

"ئەبدولکــەدا" هەرچــەند بەرامبــەرم پیــاوێکی خــراپ و دەروون بۆگــەن بــوو، سەرچاوەی هەموو ئازارەکانم بوو، لەگەڵ ئەوەشدا جاروبار "سـانتی" ی لـە شـارەوە بـۆ دەهێنام. بەڵام ژنەکانی ناو گوند کەسیان "سانتی" یان لە کاتی "مەهــەکی مانگانـە" دا بەکار نەدەهێنا، ئەوان پەڕۆی ئاساییان بەکار دەهێنا.هەوڵی ئەوەیاندا ویسـتیان منیـش بە هەمان شێوە وەکو ئەوان لە کاتی "مەهەکی مانگانە" دا پەڕۆی ئاسـایی بـەکارهێنم، بەڵام من ئەو داوایەم خستە دواوە، من لەوە نەدەگەیشتم ئەو ژنانە چۆن دەتوانــن ئـەو پەڕۆیانە بەکاربێنن. بەڵام لە رووی تریشەوە ئەو پەڕۆیانەی کـە بـەکاریان دەهێنـا، زوو زوو دەیـانگۆڕی و دەشـیان شـت. بـە لایـەنی کەمـەوە رۆژی پێنــج شـەش جـار ئـــەو پەڕۆیانەیان دەشت و لایەنی کەمیش دووجار خۆیان دەشت.

هەموو خێزانێك جگـە لـە منداڵـە گچکـەکان دەبـێ نوێـژ بکـەن، ئـەم خەڵکانـە لـە ماڵـەوە لەسـەر بـەرماڵ نوێـژ دادەبەسـتن، نوێـژ کـردن جوڵانـی لـەش و دانیشـتنی سـەر ئەژنۆ و خۆچەماندنەوە و راستکردنەوەیە. ژنـەکان بـەبێ دەنگـی نوێژەکانیـان دەکـەن، بەڵام پیاوەکان بە دەنگێکی بەرزی تایبەتیەوە نوێژ دەکەن. هەر نوێـژ کردنـێ نزیکـەی دە خولـەك دەخایـەنێ. لـە سـەرەتاوە مـن نوێـژم نـەدەکرد، تـەنیا دادەنیشـتم و سـەیرم دەکـردن. کـاتێك کـە لـە زمـانی "ئـارەب" ی تێگەیشـتم بـە رادیـۆ گوێـم لـە خوێندنـی "قورئـان" دەگـرت، لـە کۆتـاییدا وام لێهات بـڕوا بـەوە بکـەم، لـە خـودا بپاڕێمــەوە کـە یارمەتیم بدات و رزگارم بکات لەو ژیانەی کە بەسەرم هێنراوە. من هەمیشە بە زمـانی

"ئنگلـیز" ی دەپاڕامــەوە و نـــزام دەكــرد، هەمیشـــەش هــاوارم بــۆ خــوا دەبـــرد و دەمگوت:"خوایە، خوایە گیان یارمەتیم بدە." بەڵام ئاسان نیــە مـرۆڤ بـاوەڕ بكـات كـە خودا ئاگاداری ئەو ژن و كچانە بێ، كە لە ناو گوندەكانی "مۆكبانە" دەژیان.

خانووی برازاكەی "جەواد" لەسەرو ماڵی "نادیا" وە بوون كەوتبووە سەر چیاكە. برازاكەی "جەواد" مرد. ژن و منداڵەكانی بە تەنیا مانەوە. ئەو بێوەژنە دەیتوانی شوو بكاتەوە، بەڵام بڕیار ی ئەوەی دا شووی نەكردەوە، بە دیار منداڵەكانیەوە دانیشت، بەڵام پێویسـتی بـە كـارێك هـەبوو تـاكو منداڵـەكانی بـەخێو و بەڕێوەبـەرێ، كچێكـی هەشـت ساڵانە و كوڕێكی چكۆلەی هەبوو. ئەم ژنە بەناو گوندەكاندا دەستی بە گەڕان كـرد، بـۆ ئەوەی جلوبەرگی ژنانە بـدوورێ. ئـەم ژنـە لەگـەڵ "نادیـا" بوونـە دوو هـاوڕێی نزیـك، "نادیا" ی فـێری بـەرگدروون كـرد، "نادیـا" ش بـۆ ئـەو مەبەسـتە مەكینەیـەكی كۆنـی بـەرگدرووونی پـەیدا كـرد، دەسـتی كـرد بـە بـــەرگدروون. كـاتێك كــە ئــەو ژنــە بــەناو گوندەكاندا دەگەڕا بۆ كار پەیداكردن، منداڵەكانی لەگـەڵ خـۆی دەهێنانـە خـوارەوە لای "نادیا" و "سەلامە" جێی دەهێشتن.

ڕۆژێكیان لە ناكاو گوێم لە هاوارێك بوو بانگم دەكەن، "ئامینە" هـەواڵێكی تـازەی وەرگرتبوو، لە كەسێكەوە كە بە ناو گوندا ڕەتببوو. ئەویش پـاش وەرگرتنـی هەواڵەكـە بە هاوار هاوار هەواڵەكەی گەیاندە ئێمە، "ئامینە" گوتی كە كچـی ئـەو ژنـە مـردووە و "نادیا" دەستی لە مردنەكەدا هەیە.

هەر كە ئەو هەواڵەم بیست، بە ڕاكردن بـۆ گونـدی "ئاسـكۆبی" تـاكو لای "نادیـا" نەوەستامەوە، نەمدەزانی چی بكەم. كاتێ گەیشتمە ئەوێ، كە چاوم بـە "نادیـا" كـەوت گـەلێك لەسـەرخۆ و ئـارام بـوو. مردووەكـەیان بـە خـاك سـپارد بـــوو، "نادیــا" هــەموو كارەساتەكەی بۆ گێڕامەوە كەچی ڕوویداوە.

"نادیا" گوتی: "ئێمە بە كوڕەكـەوە خـەریك بوویـن و چاودێریمـان دەكـرد، ژنێـك هاتوو پێیگوتین، كە لەسەر جۆگـە ئاوەكـە پێـلاوی منداڵێكـی بینیـوە لەگـەڵ گۆزەیـەك بەسەر ئاوەكەوە بووە، كاتێك من و "سـەلامە" رامـانكرد بـۆ سـەر جۆگـەی ئاوەكـە، كـە سەیر دەكەین خەڵكێكی زۆر بەر لە ئێمە لەوێ بوون، خەریكی دارو گاڵۆك كردن بـوون

بـە بنـی ئاوەکـەدا بـۆ منداڵـە رۆچووەکـە دەگـەڕان، کـەس نـەبوو بتوانـێ مەلـە بکـات، "سەلامە" بە خەڵکەکەی گوت: " "نادیا" دەتوانێ مەلـە بکـات." "منیـش پرسـیارم لـە "سـەلامە" کـرد: "خـۆم هەڵدەمـە نـاو ئاوەکـەوە..؟" لەڕاسـتیدا گـەلێك دەترسـام کـە منداڵێکی مردوو بدۆزمـەوە، بـەڵام بیریشـم بـۆ ئـەوە دەچـوو، لەوانەیـە ئـەو چانسـەش هەبێ ئەو کچە نەمردبێ. پاش ئەوە خۆم هەڵدایە ناو ئاوەکەوە، دەسـتم کـرد بـە مەلـە کـردن بـە دوای لاشـەی منداڵەکـەدا بەهـەر چـواردەوردا دەگـەڕام، لەبـەر ئـەوەی کـە ئەمەندە گۆچان و داریان کرد بوو بە بنی ئاوەکەدا، ئاوەکە لێڵ ببوو، لە ئاوەکەدا چاوم هیـچ شـتێکی نـەدەبینی. ناچار بـەرەو بنـی ئاوەکـە بـە مەلـە چـووم، دەسـتم بـە بنـی ئاوەکـەدا دەگـێڕا، جاروبـاریش خـۆم دەگـەیاندەوە سـەرئاوەکە، بـۆ ئـەوەی هەناسـەیەك بدەم، پاشان خۆم دەکردەوە بە ئاوەکەدا، تا پانتای بنی ئاوەکە دەچوومـەوە. لـە ناکـاودا دەسـتم بـەر شـتێکی نـەرم کـەوت لاشـەی کچەکـە بـوو، دەسـتم دایـە لاشـەی کچەکـە و رامکێشـایە سـەر ئاوەکـە، پیاوەکـان لاشـەکەیان لێوەرگـرتم و بردیانـە دەرەوەی ئاوەکـە، لەسە ر زەوی دایاننا، منداڵەکە چاوی کرابۆوە و کەف لە دەمیەوە هاتبووە دەرێ."

کاتی خۆی لە فێرگە فێری فریاگوزاری سەرەتایی دەکراین. "نادیـا"ش شـتێك لـەو بارەوە فێر ببوو. لەبەر ئەوە کچەکە دەخاتە سەردەم، بە دەستەکانی هێز دەخاتە سـەر سـکی کچەکـە، بـۆ ئـەوەی ئاوەکـەی نـاو سـکی بهێنێتـە دەرەوە، ئـەم کـارە چـەند بـارە دەکاتەوە بـەڵام هیـچ دادێـك نـادا و کـار لـە کـار تـرازا بـوو، کچەکـە مردبـوو. ئـەوانیش لاشـەی کچـە مردووەکـە بـۆ ماڵـەوە دەبەنـەوە. چـەند پیـاوێکی ئـاوایی دەڕۆن بــە دوای دایکەکەدا دەگەڕێن، کە بیدۆزنەوە و هەواڵی مردنـی کچەکـەی پـێ بـدەن، ئـەم پیاوانـە دایکی کچەکە دەدۆزنەوە، لەو کاتەدا بە رێکەوت ئەو ژنە بەرەو ماڵەوە بـەڕێوە دەبـێ و بگەڕێتـەوە. ژنـە هـەر کـە چـاوی بـە پیاوەکـان دەکـەوێت دەزانێـت کـە شـتێك بەسـەر منداڵەکانیدا هاتووە. بە راکردن و بە گریـان بـەرەو مـاڵ دەبێتـەوە، نادیـا گوتـی: "ئـەو ژ نە بە گریان و هاوار هاوار کە گەیشتە ئێرە بە تەواوی لـە پـەلوپۆ کـەوتبوو، یەکسـەر خۆیکرد بەو ژوورەدا کە تەرمی کچەکەیان لێدانا بوو. پاش ئـەوەش کـە کچەکـەیان بـە خاك سپارد. لە ناشتنی تەرمی کچەکەیدا رێگایان پێنەدا کە بەشدار بێت، بەو بیانووەوە

که ئەوە کاری ژنان نیە و کاری پیاوانە. لەو خوارەوە گۆڕێکیان بۆ کچەکە هەڵکەند و بە خاکیان سپارد و نوێژیان لەسەر کرد، بەڵام پیاوەکـان ڕێگـای ئـەوەیان پێـدا لـە دوورەوە سەیری بە خاك سپاردنی کچەکـەی بکـات. ژنەکـەش لـە دوورەوە کـوڕە بچکۆلەکـەی لـە ئامێز گرتبوو، بە گریانەوە سەیری بەخاك سپاردنی جگەر گۆشەکەی دەکرد."

# بەشی دەیەم
# گوندییەکی بێچارە

لەو کاتەوەی کە ئێمە بۆ "یەمەن" هاتین، جەوادیش بۆ ماوەی دوو ساڵ لە "یەمەن" مایەوە، پاش ئەوە "یەمەن" ی جێهێشت. "مەهمەد" ی مێردی "نادیا"ش وەك هەموو پیاوان و کوڕانی گوندەکان خۆی گەیاندە "سەئودی" بۆ کارکردن.

"مەهمەد" بە تەندروست و بەدەنی باشەوە لە کوڕێکەوە بوو بە پیاوێ، بەڵام "ئەبدوڵا"ی بەناو مێردم، بەو شێوەیە نەبوو. "مەهمەد" لە "سەئودی" لە دوکانێکی بۆن فرۆش کارێکی باشی دەستکەوت بوو. ئەو لەوێوە جاروبار دراوی بۆ "نادیا" و دایکی دەناردەوە. "مەهمەد" بڕیاری دابوو تەنیا بۆ ماوەی شەش مانگ کار بکات، پاش ئەوە بۆ "یەمەن" بگەڕێتەوە و پشووبدا.

دوای ئەو شەش مانگە کە "مەهمەد" لە "سەئودی" ەوە گەڕایەوە. "نادیا" سکی پڕ بوو، "جەواد" ئەو کاتە لە "ئنگلاند" بوو، زوو زوو نامەی بۆ "نادیا" رەوانە دەکرد و تێیدا دەنووسی، "نادیا" لەگەڵ "مەهمەد" دا دەتوانن سەردانی "ئنگلاند" بکەن، لە کاتێکدا کە "مەهمەد" دراوێکی وای بە دەستەوە بێ، کە بتوانن بلێتی پێبکڕن. "ئەم پەیمانەش هەر وەك هەمان پەیمان بوو کە "ئەبدولکەدا" هەمیشە بە منی دەدا، ئەم پیاوانە ئاوا بیریان دەکردەوە، ئەگەر بێت و ئێمە "تۆل" بین، ئەو کاتە بیر لە خۆ دەرباز بوون و جێهێشتنی "یەمەن" ناکەینەوە و دادەمرکێینەوە، واز لە سەرکێشی و لاساریی دێنین، دەبینە دوو ژنە "ئارەب" ی رووسوور.

کاتێك کە "نادیا" "تۆل" بوو، تەندروستی باش بوو، تەنیا ئەوە نەبێ کە مەمکەکانی لە گەورە بووندا بوون. بە هیچ جۆرێك نائارام نەبوو، لەوە نەدەترسا کە لەو گوندەدا منداڵی ببێ. بە شێوەیەك لە شێوەکان ئازا و خۆراگر و بە ئاسایی شتەکانی وەردەگرت. لەو بڕوایەدا بووم ئەگەر بێ و من لە تەنیشتیەوە نەبوومایە، ئەو کاتە بە ئاسانی رابردووی خۆی لە بیر دەکرد، کە لەوەوبەر کچێکی "ئینگلیز" بووە، لە ئەنجامدا دەیانکردە ئەو ژنە رووسوورە "ئارەب" ەی کە ئەوان دەیانخواست. من هەمیشە خەریکی بووم و دەنوکم لەسەری بوو، کە نابێ کۆڵبدا، دەبێ لە هەوڵی خۆ دەربازکردندا بێ، خۆی بە دەستەوە نەدا. من دڵنیا بووم بەبێ من، ئەو پیاوانە دەیانتوانی "نادیا" بەو شێوەیە بارکەن کە دەیانویست.

"سەلامە" بەرامبەر بە "نادیا" ژنێکی باش بوو، بە تایبەتی لەو کاتەدا کە "نادیا" تۆل بوو، ئەو ژنە یارمەتی "نادیا"ی دەدا کە پشووی خۆی وەرگرێ و ماندوو نەبێت. رێگای ئەوەشی پێدەدا سەردانی من بکات. منیش لەلای خۆمەوە چەند ماوەم هەبووایە سەرم لە "نادیا" دەدا، بۆ ئەوەی "نادیا" ماندوو نەبێ، ئەو کاتە "ئەبدولکەدا" لە "سەئودی" بوو، بەڵام لەوێوە زوو زوو نامەی بۆ دەناردم و بۆی دەنووسیم، کە واز لەو هاتووچۆیە بێنم و بۆلای "نادیا" نەچم. "ئەبدولکەدا" دڵی بەوەوە نەبوو کە من و "نادیا" زۆر پێکەوەبین و یەکتری ببینین، وای هەست دەکرد کە ئێمە پلانی خۆ دەربازکردن ساز دەکەین. ئەو پیاوە نەیدەویست ماڵەوە جێبهێڵم، ئەو دەیویست لە بری ئەو هاتوچۆیە کارەکانی ناو ماڵ جێبەجێ بکەم. ئەو وای هەست دەکرد کە پیاوە سیخوڕ و دوو زمانەکانی لەناو گونددا ئاگاداری من نین، نازانن کە چی دەکەم و بۆ کوێ دەچم، زۆر لەوە دەترسا کە لەژێر کۆنترۆڵی ئەودا نەمێنم.

لە دوا نامەدا کە بۆی نووسیم گوتبووی:"زانا" هەفتەی یەك جار بۆت هەیە سەر لە "نادیا" بدەی. منیش لەو کاتەوە هەفتەی جارێك سەردانی "نادیا" م دەکرد. لەبەر ئەو فشار و هێزەی کە خستبوویە سەرم، ناچار بووم پەیڕەوی ئەو مەرجانە بکەم. بەو جۆرە لەسەرخۆ، خووم بە ژیانی ژنە "ئارەب"یەکی گوندییەوە گرت. ئەگەر خۆ گوێڕایەڵیم نەکردایە، ئەوا لە ناو خێزانەکەیەوە یان کەسێك لەناو گوندەکەوە نامەیان

بۆ دەنووسی و لە بارەی منەوە ئاگاداریان دەکردەوە، ئەو کاتە دەیزانی کە سەرپێچیم لە فەرمانەکەی کردووە، ئەویش زوو زوو نامەی بۆ دەناردم و هەمیشە ئەوەی بۆ دەنووسیم، ئەگەر بێت و سەرپێچی بکەم، ئەو کاتەی کە دەگەڕێتەوە، سزام دەدا و بێزارم دەکات. من بەچە ترسێن کرابووم. لەو سنوورە دەرباز نەدەبووم کە بۆی کێشابووم. وەك تاکتیك شەڕی بڕیار و مەرجەکانی ئەو پیاوەم نەدەکرد. بەڵام هەرگیز خۆم بە دەستەوە نەدەدا و سوور بووم لەسەر تێکۆشانم، بۆ خۆ دەرباز کردنمان، ئەوەم کردبووە هەڵوێست. لەگەڵ ئەوەشدا بە هەموو هێزێکمەوە رکوکینم لە "ئەبدولکەدا" بوو.

بەیانیەك زوو یەکێ لە دراوسێکانمان هات، بۆ "وەردە"ی گێڕایەوە کە ئەمشەو "نادیا" کوڕێکی بووە، هەموو شتێك بە باشی و بە ئاسایی تەواو بووە.

کاتێك کە گوێم لەو گوتانە بوو، لە داخاندا ئارامم نەبوو، کە بۆچی یەکێکیان نەناردووە ئاگادارم بکات. ئەو ژنە ئاوا وەڵامی دامەوە، گوتی: "دوێنێ شەو درەنگێ "نادیا" ژان گرتی، ژنانیش نەیاندەوێرا بەو تاریکیە بە شوێن تۆدا بێن. ئەگەر بەو شەوە پیاوێك بهاتایە بە شوێنتا و لەگەڵ ئەو پیاوە بۆ لای "نادیا" بچوویتایە، پاش ئەوە ئەگەر "ئەبدولکەدا" بیزانیایە، بەبێ یەك و دوو دەیکوشتی. چونکە ئەوەی بە کارێکی بەرەڵایی دەزانی کە ژنێك لە تەك پیاوێکی بیانیدا لە شەوێکی وا ئەنگوستەچاودا شان بە شان بڕوات." ئەو تێبینیانەی ئەو ژنەم بەلاوە پەسەند بوو. بە پرتاو خۆم گۆڕی و دەرپەڕیمە دەرەوە، "وەردە" کە چاوی پێم کەوت هاواری لێکردم، گوتی: "هیوادارم کە بۆ نانی نیوەڕۆ لێرە بیت." منیش وەڵامیم دایەوە گوتم: "ئەمڕۆ ناگەڕێمەوە، لەلای خوشکەکەم دەمێنمەوە." بە پرتاو ڕێگام گرتە بەر تاکو گوندی "ئاسکۆبی" نەوەستامەوە. کاتێك کە گەیشتمە ئەوێ، یەکسەر خۆم بە ژوورەکەی "نادیا"دا کرد. ژوورەوە پڕ بوو لە ژن، "کۆرپە" کە لە جۆلانەیەکدا لە تەنیشت دایکیەوە خەوتبوو، جۆلانەکەیان لە جاجم دروستکرد بوو. هەر کە چاوم بە "نادیا" کەوت دەستم بە گریان کرد. ئەو ڕۆژە هەر دەگریام "نادیا" روو گەش و

تەندروست باش بوو. داوای لێکردم واز لـە گریـان بێنـم. بـەڵام مـن هەسـتم دەکـرد کـە تەندروستیم باش نیە، هەستم بەوە کرد دەنگم نووساوە.

"نادیا" بۆی گێڕامەوە گوتی: "شەو درەنگێك هەستم بە ژان کرد، بـەڵام هێنـدەی نەخایاند، "سەلامە" بـە پڕتـاو بـۆ ئـەو گونـدەی نزیکمـان چـوو، ژنێکـی پـیری دەناسـی لەگەڵ خۆیدا هێنای مامانیەکە بکات." پاشان گوتی: "لە ڕاستیدا هێنـدەم ئـازار نـەبوو زوو رزگارم بوو، مامانەکەش گەلێك کارامە و لەسەر خـۆ بـوو، پـاش کـاژێرێك ژانگرتـن منداڵەکەم بوو." من هەرگیز باوەڕم نەدەکرد، کە خوشکە بچکۆلەکەم بووە بە دایك.

لە ژوورەوە ژنێك لە تەکماندا دانیشت بوو، ناوێکی پێشنیاز کرد، داوای لە "نادیا" کرد کە منداڵەکەی بەو ناوەوە ناوبنێ، ناوەکە نایەتـەوە یـادم چـی بـوو، بـەڵام "نادیـا" ئەو پێشنیازەی دایە دواوە، بڕیاریدا بوو کە کوڕەکەی "هانی" ناو بنێ. "هانی" لە 29ی فێبریوەری 1984 لە دایك بوو. کوڕێکی جوان بوو، هەر بە دایکی دەچوو. بۆ ماوەی سـێ ڕۆژ لای "نادیا" مامەوە، منیش هـەر لـە ژوورەکـەی نادیـا لـە تـەکیاندا دەخـەوتم، ئـەو ماوەیە کە لەوێ بووم بە تەواوی نەخۆش کـەوتم، هـەر لـە یەکـەم ڕۆژی چوونمـەوە بـۆ لای "نادیا" دەنگم کـەوت و نـەمدەتوانی بپـەیڤم. ئەگـەر لەگـەڵ "نادیـا" بپەیڤیمایـە، دەبوایە سەرم ببردایەتە بن گوێیەوە، تاکو بتوانم تێی بگەیەنم. نەخۆشیەکە وایلێکردم لەسەر جێگا خستمی، وەك منداڵێکی تازە لە دایك بوو. "نادیـا" بـە کـەوچك خواردنـی بە دەممەوە دەکرد.

"نادیا" هەر لە سەرەتاوە زۆر لەسەر خۆ ڕۆڵی دایکی دەبینی، هێمن و ئارام، وەکو چۆن هەر لەوەوبەریش هەر بەو شێوەیە بوو. ئەو دایکە بۆ مـاوەی دوو سـاڵ شـیری بـە "هانی"دا، پیاو هەستی پێدەکرد کە "هانی" باش پەروەردە دەکات و بەلاو دوویـدا دێ. کاتێك کە "نادیا" بوو بە دایك، ئیتر بە تەواوی بەسـترایەوە، هـەر کاتـێ دەربـارەی خـۆ ڕزگارکردن و گەڕانەوەم بۆ باس دەکرد ترس دایدەگرت.

لـە وەڵامـدا دەیگـوت: "ئەگـەر ئێمـە بمانـەوێ بـۆ ئنگلانـد بگەڕێینـەوە "هـانی"م لێزەوت دەکەن." ئەم جۆرە بیرکردنەوانە ترسیان لە لا دروست کردبوو. من بەم جـۆرە

بۆچوونانەی "نادیا" نا ئارام دەبووم، کە چۆن ئەو پیاوانە توانیان ئەو کارە لەگەڵ "نادیا" بکەن و بیبەستنەوە، نەتوانێ ئەم وڵاتە جێهێڵێ و لەگەڵ مندا بگەڕێتەوە.

کاتێ من و "نادیا" یەکتریمان دەبینی، هەوڵمان دەدا کە هەردووکمان خۆ بە خۆ پێکەوە بین، خۆمان لە ژنەکانی تر دەدزیەوە، ئێمە دەمانویست کە هەمیشە پێکڤە بین. بە جووتە باسمان لە ڕۆژانی رابردوو دەکرد، یادگاری و ڕۆژانی پێکەوە بوونمان دەهێنایە گۆڕێ، ئەمانە تەنیا شتێ بوون کە"نادیا" بخەنە خەندە و پێکەنین. لە بارەی وڵاتی "یەمەن"ەوە هیچ یادگاریەکی شیرینمان نەبوو، بمانخاتە خەندە و پێکەنین.

بە جووتە زۆر شتمان بەبیردا دەهات، خەومان بە زۆر شتەوە دەبینی، خۆمانی پێدەرباز بکەین. ئەم بیرکردنەوانە تەنیا شتێك بوون کە ئاهێك بە دڵماندا بهێنێ، بەڵام ئەوەمان چاك دەزانی کە تەنیا ڕێگا و ئاواتمان ئەوە بوو، کە نامەیەکمان بگاتە دەستی دایکم و لە کارەساتەکەمان ئاگادار بێت، ئەویش هەوڵێکمان بۆ بدا و لەم ژیانە ناهەموارە دەربازمان کات. لە بارەی دایکمانەوە هیچ شتێکمان نەدەزانی، کە ئەو چۆن بیر لە ئێمە دەکاتەوە، کە چیمان بەسەر هێنراوە. ئەو کارتەی یەکەمجار بۆم ڕەوانە کرد، تیایدا نووسی بووم ژیانمان باشە، ئەگەر بە دەستی گەیشتبێ..!؟ لەوانەیە دایکم ئاوای بیری کردبێتەوە کە ئێمە ژیانێکی بەختەوەرانە دەژین. بۆیە لە "یەمەن" ماوینەتەوەو دامانکوتاوە. ئێمە نەماندەویست دایکم بەو جۆرە بیربکاتەوە و تێبگا. ئاواتخواز بووین، ئەو راستیە بزانێ کە ئێمە بەندو دەست بەسەرین. ئەو کاتە ئەویش دەستبەردارمان نەدەبوو و هەوڵی رزگار کردنی دەدایین.

ئەو کاسێتەی کە کاتی خۆی "ئەبدولکەدا" بۆ دایکمی ڕەوانە کرد، لەسەر تۆمارکردنی ئەو کاسێتە "ئەبدولکەدا" زۆری لێکردم و لێشیدام، ئەو دەیویست بە دەنگی خۆم بە دایکم بڵێم: "باوکم کارێکی باشی لە تەکماندا کرد کە ئێمەی بۆ "یەمەن" ناردووە، ئێمە لە "یەمەن" گەلێك دڵشادین وەکو لەوەی کە لە "ئنگلاند" بین. "ئەوەشی بە زۆر پێتۆمارکردم کە بڵێم: "ئەم وڵاتە گەلێك خۆش و دڵگیرە." من نەمدەتوانی ئەوە نەکەم، بەڵام دەمزانی کە ئەو کاسێتە دایکم چەواشە دەکات.

هەر لەو ماوەیەی کە "هانی" لە دایك بوو، دکتۆرێك بـۆ گونـدی "هۆکـایل" هـات، ئەم دکتۆرە خوێندنی لە دەرەوەی وڵات تەواو کردبوو، پاش تەواوکردنی خوێندنەکەی بڕیـاری دابـوو، کـە بـۆ وڵاتـی خـۆی (گوندەکـەی) بگەڕێتـەوە و لـەو ڕێگایـەوە یارمـەتی گەلەکەی خۆی بدات. ئەو پزیشکە کوڕێکی گەنج بوو، هەر کاتێك کە نەخۆش بوومایـە بۆ لای ئەو دکتۆرە دەچووم، ئەو پیاوە زمانی "ئینگلیز"ی نەدەزانی، بەڵام من ئەو کاتـە دەمتوانـی بـە تـەواوی بـە "ئـارەب"ی بپـەیڤم. هـەندێك لـە بـارەی نەخۆشـی و ئـەو شـتانەش ڕوون بکەمـەوە کـە لێیدەپرسـیم. ماوەیـەك نـەمدەتوانی بـە شـەو بخـەوم، دەرمـانی خـەوی بـۆ نووسـیم، ئازارەکـەم نـەما، لەڕاسـتیدا پزیشـکێکی بـاش و کوڕێکـی بەڕێز بوو. ئەو خانووەی کە تیایدا دەژیا بە خانووەکانی ئێمـە نـەدەچوو، بـە خـانووی بەر پرسیارێکی دەوڵەت دەچوو، ناو خانووەکە فەرش ڕێژ کرابوو، بەستەڵۆك و هـەموو کەلوپـەلێکی پێویسـتی تێدابـوو. بـۆ ئـەوەی ئـەم کەلوپـەل و ئامێرانـە بـەکار بێنـێ، دینـەمۆی ئەلـەتریکی بـەکار دەهێنـا. لەبـەر ئـەوەی لـە نـاو ئـەم گوندانـەدا سـەرچاوەی ئەلـەتریك نـەبوو. لـەو ڕووەشـەوە باشـترین خـانووی ناوچەکـە بـوو. گوندیـەکانی ئـەو ناوچەیە لە بارەی ئەو خانووەوە دەدوان. بـاوکی ئـەو کـوڕە خانووەکـەی بـۆ دروسـتکرد بوو. لە هەمانکاتدا باوکی کوێخای گوندەکەش بوو.

جـار دوای جـار ئاسـانتر لـە تـەك ئـەو دکتـۆرەدا دەپـەیڤیم، منیـش ئـەو نزیـك بوونەوەیـەم بەهـەل زانـی، لەبـەر ئـەوە ڕۆژێکیـان پێـم بـە جـەرگی خۆمـدا هێنـا، بـۆم گێڕایەوە، لەو کاتـەی کـە بـە فڕوفێـڵ بـۆ ئـەم ناوچەیـە هێـنراوم، لـە دایکمـەوە نامـەم پێنەگەیشتووەو هەواڵی یەکتری نازانین. پاش ئەوە پرسیارم لێکرد: "کاتێك بەرەو شـار دەچی دەتوانی نامەیەکم بۆ پۆست بکەی...؟"

من دەمزانی کە زوو زوو هاتوچۆی شار دەکات، لەسەرەتاوە زۆر گرنگی بە داواکەم نەدا، ئەو نەیدەویست دەستبخاتە کاری خێزانێکی ترەوە. چەند جارێك ئەو داخوازیەم لێکرد کـە یارمـەتیم بـدا، لـە کۆتـاییدا داخوازیەکـەمی پەسـەند کـرد و پـەیمانی دامـێ. هێندە ورەم بەرز بۆوە لە خۆشیاندا خەریك بوو شێت دەبووم. گفتی ئەوەشی دامێ کە دایکیشم دەتوانێ لـە ڕێگـای ژمـارەی پۆسـتەکەی خۆیـەوە نامـەم بـۆ بنـێرێ، ئـەو کاتـە

ئەویش بە نەهێنی نامەکە دەگەیەنێتە دەستم. بەو جۆرە ڕێککەوتین. لە دڵی خۆمدا دەمگوت: ئیتر لە "ناسر" ڕزگارم بوو. ئەو نامانەی کە دایکم لە ڕێگای "ناسر" ەوە دەیناردن نەدەگەیشتە دەستمان، بە دەستی "ئەبدولکەدا" دەگەیشتن.

کاتێ کە بەسەرهاتەکەم بۆ "نادیا" گێڕایەوە، کە گەیشتوومەتە ئەو هەوڵ و کۆششە و یەکێ هەیە بڕوای پێبکەم. جارێکی تر هەردووکمان کەوتینەوە سەر کەڵکەڵەی خۆ دەرباز کردن. من ئەو دەمەش بە تەواوی بڕوام نەدەکرد کە کارەکەم سەر بگرێ. لەڕاستیدا زۆر دەترسام لەوەی کە نامەکەی دایکم بکەوێتە دەستی یەکێ لە گوندیەکان، یان لە شاری "تایز" دەستی کەسێ بکەوێ. ئەو کاتە ئاگاداری "ئەبدولکەدا" بکەنەوە، ئەویش ئەوەی ناخۆشە بەرامبەرم بیکات و سزای مەرگم بدا، بیانووەکەشی ئەوە بێت کە بۆ جارێکی تریش لە کۆششی ئەوەدام بیخەڵەتێنم، لە هەمانکاتدا ریسەکەشمان دەبۆوە بە خوری. تا ئەو کاتەش ئەو نامانەی کە بۆ دایکم دەنووسی نەمدەوێرا هەموو شتێکیان تێدا بنووسم. لەبەر ئەوە ناچار بووم کە بە شێوەیەك لە شێوە سمبولیەکان نامەکان بنووسم، لە هەمانکاتیشدا ئاواتخواز بووم کە دایکم لە مەبەستی نووسینەکەم بگات، ئەو تێبگات و بزانێ کە پێویستمان بە یارمەتی هەیە. نامەکانم بە شێوەیەك دەنووسی کە بە مانا بن.

لە سەرەتاوە بەرگی پەڕاوێکی کۆنم دڕی و نامەکەم تێدا نووسی، هەروەها ناونیشان و ژمارەی پۆستەکەی دکتۆرم نووسی. دوو هەفتە دوای ئەو نامەیە، ژنی دکتۆر سەردانی ماڵەوەی کردین. ئەو کاتەی کە لەگەڵ ژنی دکتۆردا دانیشتبووین، بە ڕێکەوت "وەردە" لە ژوورەوە چووە دەرەوە، ژنەکە بە دەنگێکی نزم پێی گوتم: "دایکت نامەیەکی ناردووە لە لای دکتۆرە، دەتوانی بچیت بۆ خوارەوە بیهێنی." دەستبەجێ بە هەڵەداوان خۆم گەیاندە لای دکتۆر. تا ئەو دەمەش بڕوام نەدەکرد کاتێ کە زەرفی نامەکەم بینی، پاش ئەو هەموو ساڵانە نووسینی دایکمم ناسیەوە. پرسیارم لە خۆم دەکرد چۆن ئاوا بەو ئاسانیە کوتوپڕ دەستم گەیشتە دایکم، لە مێژ ساڵ بوو چاوەڕوانی ڕۆژێکی ئاوا بووم...؟

دکتۆر بـه خەندەیەکـەوە پرسـیاری لیکـردم، گوتـی: "دەتـەوێ لـیرە بمینیتـەوە تـا نامەکەت بخوینیتەوە...؟"

منیش سو پاسم کرد و پیم گوت: "دەمەوێ بە تەنیابم و لە شوینیکدا بە نـەهینی بیخوینمـەوە." شـەرمم دەکـرد لەبـەر چـاوی ئـەو بگریـم، نامەکـەم لـە ژیـر جلـەکانمدا شاردەوە و بۆ مالەوە گەرامەوە. کـاتیك کـە بەسـەر چیاکـەدا سـەردەکەوتم، دلـم کەوتـە تەپـە تـەپ، وا هەسـتم دەکـرد لەگـەڵ ئـەو نامـە نەهینیـەدا دلـم دەکەویتــە خــوارەوە. هـەرگیز لـەو بروایـەدا نـەبووم، کـە بتـوانم و بویـرم ئـەو نامەیـە بخوینمـەوە. لــەوەش دەترسام، کە یەکێ ئەو نامەیەم لە دەست بفرینێ، هەروەك چۆن "ئەبدولکـەدا" وینـە فۆتۆگرافیەکانی لە دەست فراندم و دراندی.

دایکم لە نامەکەدا دەرکی بەوە کرد بوو، کە شتێ روویداوە، نامەکە گەلـێ دوور و دریژ بوو، پـر بـوو لـە پرسـیار، ئەوەشـی بـۆ نووسـی بـووم، کـە نامـەی تـری بـە دەسـت نەگەیشتووە. بەڵام ئەو کاسـیتەی کـە بـە زۆر دەنگـی منیـان لەسـەر تۆمـارکرد بـوو بـە دەست گەیشت بوو.

"ئەبدولکـەدا" کاسـیتەکەی رەوانـە کـرد بـوو بـۆ بـاوکم، بـەڵام دایکـم بـەر گویـی کەوتبوو کە کاسیتیکی وامان رەوانە کردووە. رۆژێ "مۆ"ی برام دەچـێ سـەر لـە بـاوکم دەدا، بـە دزی باوکمـەوە کاسـیتەکە دەهینـێ بـۆ دایکـم و گویـی لیدەگـرن. لـە نامەکـەدا نووسی بووی، هەستی بەوە کردووە و تیگەیشـتووە کـە زۆریـان لیکردوویـن ئـەو شـتانە بلیین. بەڵام ئەوەشـی نووسـی بـوو، لـەو کاتـەدا نـەیزانیوە چـی بکـات. بـاوکم کـە بـەوە دەزانێ کاسیتەکە بەردەستی دایکم کەوتووە، لە "مۆ" تووڕە دەبـێ، زۆری لیدەکـات یـان کوری ئەو بـێ، یـان کـوری دایکـی. "مـۆ" دایکـم پەسـەند دەکـات، ئیـتر سـەردانی بـاوکم ناکات.

کاتێ کە نامەکەم دەخویندەوە، بەوە دلگـران بـووم، کـە تـا ئـەم کاتـەش دایکـم بـە باشی رەوشەکەی ئیمە تیناگا، تاکو ئەو سـاتەی کـە نامەکـەی دایکیشـم گەیشـتە دەسـت، وامدەزانی کە دەرباز بوونمان کاریکی ئاسانە. پاش خویندنەوەی نامەکە گەیشـتمە ئـەو راستیەی کە کاتیکی زۆر دەبـا، تـاکو ئیمـە لـە "یەمـەن" رزگارمـان دەبیـت. زانیـم ئـەم

هەویرە ئاو زۆر دەکێشێ. من و "نادیا" گەیشتینە ئەو راستیە، کە دایکم ئاگاداری ئەو بازاڕی فرۆشتنەی ئێمە نەبووە کە ئێمەی تێدا فرۆشراوین. بەڵام ئێستا، کە دایکمان ئاگادار کردەوە، هەموو توانای خۆی دەخاتە کار بۆ ئەوەی رزگارمان کات.

بەو شێوەیە بە بەردەوامی نامەم بۆ دایکم دەنووسی، ئەویش وەڵامی هەموو نامەکانی دەدایەوە. من و "نادیا" وا هەستمان دەکرد کە ئێستا لە جاران مسۆگەرترین، زوو زوو نامەمان دەنووسی. خەمی ئەوەمان نەما کە خەڵکانی تر پێبزانن کە پەیوەندیمان بە دایکمانەوە هەیە. بەڵام شێوەی پەیوەندیەکەمان دەشاردەوە و بەلامانەوە مەبەست بوو. هەندێك جار ژنی دکتۆر سەردانی ماڵەوەی دەکردین، بەبێ ترس نامەی بۆ دەهێناین، هەر چەندە ژن و خێزانەکەی "ئەبدولکەدا" دەیانزانی، دڵیان بەو پەیوەندی و نامانە خۆش نەبوو، بەڵام هەوڵی ئەوەیان نەدەدا کە نامەکانمان بدزن و بیاندڕێنن.

ئەم دکتۆرە، لەلایەن خێزانەکەیەوە باش پەروەردە کرابوو، لە هەمان کاتدا بە دەسەڵاتیش بوون، "ئەبدولکەدا" نەیدەتوانی هیچ شتێك بەرامبەریان بکا، بەڵکو بە پێچەوانەوە، ئێمە بەختێکی باشمان هەبوو کە تووشی یەکێ بووین بە دەسەڵات بوو.

"ئەبدولکەدا" بەوەی زانی کە چۆن زرمەمان لێهەستاندووە، بەڵام نەیدەتوانی راستی و هەستی دەروونی دەربڕێ، لە نامەیەکدا کە لە "سەئودی"ەوە بۆی ڕەوانە کردم، بەو شێوەیە توانا و هەڕەشەی خۆی دەربڕی بوو، لە نامەکەدا نووسی بووی: "دڵخۆشم بەو هەواڵە کە نامەت لە دایکتەوە بەدەست گەیشتووە." خۆی لە شتەکان نەگەیاندبوو، و هەواڵی دایکمی پرسی بوو، وەکو دۆستێکی زۆر نزیك خۆی نیشاندا بوو.

لەگەڵ ئەوەشدا کە دایکم لە هەموو شتێك ئاگادار بوو، بەڵام تا ئەو کاتەش هیچ جۆرە گۆڕانکاریەك بەسەر ژیان و ڕەوشەکەماندا نەهاتبوو. دایکیشم شتێکی وای نەکردبوو، کە نیشانەی دەست پێکردن بێ.

دایکم لە نامەکەدا ئەوەی بۆ نووسی بووم، کە هاوڕێکانمان بۆ شت کڕین بۆ دوکان چوون، یەکەمجار لە دەمی ئەوانەوە بەر گوێی کەوت بوو، کە "زانا و نادیا" شوویان

کردووه. هاورێکانیشمان له دەمی ژنێکی "ئنگلیز"ەوە بیستبوویان، ئەو ژنە مێردەکەی خەڵکی "مۆکبانە" ببوو. ئەوەشی نووسی بوو، ڕۆژێك دایکم بە کاروباری دوکانەوە خەریك دەبێ، باوکم بە هەلی دەزانێ و لە ماڵەوە بە دوای ناسنامەی رۆژی لە دایکبوونی من و "نادیا" دەگەرێ و بەدزی دایکمەوە بردبوونی. کاتێ دایکم بەوە دەزانێ باوکم بە گیر دەهێنێت، ئەویش لە وەڵامدا دەڵێ: "بۆ ئەوەی کە بە شێوەیەکی فەرمی کاروباری مارەبڕین بۆ کچەکان جێبەجێ بکەم،" پاشان بە دایکم دەڵێ: "ئەو هەوڵەم سەری گرتووە و دوو پیاوی "یەمەن"ی بوونەتە گەواهیدەرم بۆ مارەبڕینەکەیان."

دایکم بە بیستنی ئەو هەواڵە لە باوکم شێتگیر دەبێ و دەڵێ: "چۆن دەتوانی ئەو کارە بکەی...؟ ئەوانە منداڵی منن... ئەوانە هی منن... تۆ ئەو کچانەت فرۆشتووە...!"

باوکم پێکەنینی بە دایکم دێ و دەڵێ: "بیسەلمێنە."

دایکم بە باوکم دەڵێت: "من ئەو کچانەم دەوێتەوە." بەڵام باوکم گاڵتەی بە وتەکان و پێکەنینی بە دایکم دێت.

ئەمجارە بە دایکم دەڵێ: "هەوڵبدە بیانگەڕێنەوە، بەڵام هیچ شتێکی بۆ ناکرێ، ئەوان هەر وەکو دووانەکەی تر لەوێن و لەوێ دەژین."

بەو شێوەیە دایکم نامەیەك بۆ شالیارگای دەرەوەی "بەریتانیا" دەنووسێ، هەر وەکو چۆن کاتی خۆی بۆ گەڕاندنەوەی "لەیلا و ئەهمەد"ی نووسی بوو. بەڵام شالیارگای دەرەوە بەو شێوەیە وەڵامی دایکمیان دابۆوە، "ئەو کچانە لە هەر دوو لایەنەوە هاوڵاتین، لە لای باوکیانەوە هاوڵاتی "یەمەن"ین، لە لایەنی دایکیشەوە هاوڵاتی "بەریتانی"ین. هەروەها دەسەڵاتدارانی "یەمەن"یش وەك هاوڵاتیەك دانیان بەو مافەیاندا ناوە. "ئەوەش دەڵێن: "تەنیا چارەسەر ئەوەیە، کە پیاوەکانیان دەستیان لێهەلگرن، بۆ ئەوەی کە بتوانن بۆ "بەریتانیا" بگەڕێنەوەو وڵاتی "یەمەن" جێهێڵن.

چاودێرەکەی پێشووی "نادیا" "ماری بیرچێل" ئەویش نامەیەك بۆ باڵیۆزخانەی بەریتانی دەنووسێ، هەروەها نامە بۆ زۆربەی ئەو کۆمەڵە و دام و دەزگا مرۆڤیانەی تر

که هەن ڕەوانە دەکات، بەڵام وەڵامی هەموویان وەکو یەك دەبێت و دەڵێـن: "بەداخـەوە کە ناتوانین لەو بارەیەوە کارێك بکەن."

ئەو چاودێرە ژنە چەند نامەیەك بۆ من و "نادیا" دەنووسێ بەو ناونیشـانەی کـە "جەواد و ئەبدولکەدا" لە سەرەتاوە دابوویانێ، بەڵام ئەو ژنە بە هیچ جۆرێـك وەڵامـی نامەکانی لەلایەن ئێمەوە بەدەست ناگاتەوە. لەبەر ئەوەی کە نامەکانی ئـەو ژنـەش بـە دەسـتی ئێمـە نەدەگەیشـتن و لێیـان ئاگـادار نـەبووین. لەگـەڵ ئەوەشـدا کارکـەرانی باڵیۆزخانەی "بەریتانی"ش لە "سەنئا" زۆریان هەوڵدا بوو، بەڵام ئەوانیش نەیانتوانی بوو لە ڕێگای ئەو ناونیشانەی "ئەبدولکەدا و جەواد"ەوە بنەوانمان بزانن.

دایکی "لێنێت"ی هـاوڕێم، خـانمی "جویلینتۆنـگ" کـە هاوڕێیـەکی نزیکـی دایکـم بوو، ئەویش بۆ ئەو مەبەستە کەوتبووە یارمـەتیدانی دایکـم. ئـەو ژنـە نامەیـەکی بـۆ شـاژنی "بـەریتانی" نووسـی بـوو، داوای یارمـەتی لێکـرد، بـەڵام شـاژنی بـە دەسـەڵات، وەڵامی نامەکە بە شێوەیەکی زۆر بەڕێزانـە دەداتـەوەو دەڵێ: "نامەکـەم بـۆ شـالیارگای دەرەوە بەڕێکردووە." هەروەها "ماری بیرچێڵ" و دایکم بە جووتە نامەیەك دەنووسـن بۆ بەڕێز "نیگێل کانتوێڵ" بەرپرسیاری (Defence of Children International) لە جنێڤ. بەڵام وەڵامی ئەم بەڕێزەش وەکو هەموو وەڵامی ئەوانی تر دەبێ و دەڵێ: "کە ئەو دوو کچـە هـاوڵاتی "یەمـەن"یـن و شووشـیان کـردووە. لەبـەر ئـەوە نـاتوانین هیـچ جـۆرە یارمەتیـەکیان بدەیـن." بـەڵام ئـەو لـە نامەکـەدا نووسـی بـووی: ئـەو دەخوازێـت بـەو شـێوەیە ژن و مێردایـەتی بـاوکم و دایکـم بـۆ دەسـەڵاتدارانی "یەمـەن"ی شـیکاتەوە. (لەبەر ئەوە کە ئەو ژنە بە شێوەیەکی فەرمی مارەبڕی ئەو پیاوانەیە، واتا بـاوکی ئـەو کچانە دایکی ئەو دوو کچەی نەخواستووە و بە فەرمی ژن و مـێرد نـین، ئەمـەش ئـەوە دەگەیەنێ کە ئەو ژنە لە ڕووی یاساییەوە ژنێکی بەشوو و مێردار نیە. بە واتایەکی تـر دایکـی ئـەو کچانـە بـە تـەنیا بەرپرسـیار و بـەخێوکاری منداڵەکانیـەتی. لەبـەر ئـەوە، دایکیـان دان بـەو شـووکردن و مـارە بڕینـەیاندا نانـێ، ئـەو مـارە بڕینـەش بـە ئاگـاداری دایکیـان نـەبووە و پرسـیاری پێنـەکراوە. ئـەوەش تـەنیا ڕێگایەکـە کـە دەسـەڵاتدارانی

"یەمەن"ی چاو بخشێننەوە بە مارەکردن و شـووکردنی ئـەو دوو کچـەدا، کـە ئـەو مـارە بڕینە، مارە بڕینێکی یاسایی نیە و ساختەیە.)

مـن دەسـتم گـرت بـەو چڵە گیایـەوە، وا تێگەیشـتم کـە بـەخت یارمـان بـێ و لـەو زۆنگاوە دێینە دەرێ، خۆم ئەوەم چاك دەزانی کە ئەو مارە بڕینەمان یاسایی نیـە. ئـەو جۆرە مارەبڕینانە دەبێ لە کوێـوە یاسـایی و دڵخوازانـە بـن...؟ ئێمـە بـە هیـچ جۆرێـك پرسـیارمان پێنـەکراوە، لەڕاسـتیدا ئێمـە ئـەو کوڕانـەمان نەویسـتووە و هەسـتمان نـەکردووە کـە ئەوانـە هاوژینمـانن، ئەگـەر دایکـم بەوکارانـەی بزانیایـە، ئـەو کاتـە مارەبڕینمان لەو کوڕانە یاسایی دەبوون...؟ بەڵام دایکم لەو ڕووەوە هیوایـەکی ئـەوتۆی بـەو شـتە نیـە، وا دەردەکـەوت کـە دایکـم بـڕوای بـەوە نـەبوو، کـە دەسـەڵاتدارانی "یەمەن"ی کاتی خۆیان بەوەوە بکوژن، کە بیانەوێ و بزانن ئەو مارە بڕینانە یاسـایین یـان نایاسـایین. دایکـم لـەوەش دەترسا کـە بـاوکم هـەمان کارەسـات بەسـەر "ئاشـیا و تینا"شدا بێنێ، ئەو دوو منداڵەشی لێزەوتکات و بفرێنێ. هەروەك چۆن لەگـەڵ "لـەیلا و ئەهمەد و من و نادیا" دا کردی. خەڵکی بۆیان دەنووسیم کە دایکم تووشی نەخۆشـی لەرزینی کوتوپڕی بووە، هۆکەشی ئەوەیە لەو ماوەی چـەند سـاڵەدا کـە هیـچ هـەواڵێکی ئێمـەی نـەدەزانی، ئـەو هـەموو بیرکردنـەوە و ئـازار و ژانـە بـارێکی زۆر گرانـی بەسـەر دایکمەوە دانابوو. بەڵام پاش ئەوەی کە هەواڵ و نامەی ئێمـەی بـە دەسـت دەگـات، ئـەو کاتە هێز و توانای بەبەردا دێتەوەو دەکەوێتەوە سەرخۆی.

ئەو شتەی کـە دایکـم نـەیکردبوو، ئـەوە بـوو، کـە ئـەم ڕووداوەمـان لـە ڕۆژنامـە و گۆڤارەکاندا گەلەکێش بکات. هەموو جارێك لەو بارەیەوە لە نامەکانمدا بۆم دەنووسی و هانم دەدا کە ئەو کارە بکـات و گەلەکێشی بەسـەرهاتەکەمان بکـات، بـا هـەموو کەسـێك بەو کارەساتەمان بزانن. هەندێ لە پیرەمێردەکانی ناو گوند، کـە دەهـاتن و سـەریان لـە بـاوکی "ئەبدولکـەدا" دەدا پێیـان دەگوتم: "خەفـەت مـەخۆ، دان بـە خۆتـدا بگـرە، بـۆ وڵاتـی خـۆت دەگەڕێیتـەوە." هـەندێ لـەو پیرەمێردانـە ئـەوەیان دەزانـی کـە خـەڵکی "ئنگلیز" چۆنن، ئەگەر دایکم بەردەوام بێ و لە بارەی ئەو کارەسـاتەوە بـدوێ کـە چـی ڕوویـداوە، لـەو بڕوایـەدا بـوون بەرپرسـیارانی دەوڵـەتی "یەمـەن"ش نـاتوانن بێدەنگـی

لێبکەن، ناچارن بەڕاستی کاری بۆ بکەن. منیش بە بەردەوامی دەنووکم لەسەر دایکم بوو، کە لە هەوڵی ئەوەدا بێ، کە کەسێك هان بدات لە یەکێ لە ڕۆژنامەکاندا لەسەر ئەو کارەساتە و لە بارەی ئێمەوە بنووسێ. بەڵام لە سەرەتاوە دایکم ئەو داخوازی و پێشنیازەی منی پەسەند نەدەکرد، دەیویست خۆی هەموو کارەکان بکا، من تا ئەو کاتەش نەمدەوێرا بە راشکاوی و بەکراوەیی هەموو شتێك بنووسم، لێم روون نەبوو، ئەو نامانەی کە دەیان نێرم کێ دەیانخوێنێتەوە.

پاش ئەو هەموو هەوڵدانە، من و دایکم بە بەردەوامی نامەمان بۆ یەکتری دەنووسی، هەرچەندە جاری وا هەبوو نێوانی نامە گۆڕینەوەمان دوو مانگی پێدەچوو. بەڵام ئەم ماوەیە بەراورد ناکرێ لەگەڵ ئەو ماوەی چوار ساڵ بێدەنگ و پڕ لە ئازارەی پێشوومانددا. دایکم وێنەی خۆی و منداڵەکانی بۆ ناردم لە بری ئەو وێنانەی کە "ئەبدولکەدا" دڕاندنی. "ئاشیا"ی خوشکم کچێکی ببوو، من لەو بارەیەوە ئاگادار نەبووم.

"ئەبدولکەدا"کامێرایەکی هەبوو، وێنەی من و "نادیا"ی بەیەکەوە گرت و بۆ دایکمانی ڕەوانە کرد. ئەو پیاوە دەیویست بەم کردارەی ئەوە بەدرۆ بخاتەوە، کە ئێمە بەند و دەست بەسەرنین. ئەو شتانەی کە دەگوترێن هەمووی بوختان و درۆن. لە ماوەی چەند مانگێکدا بە بەردەوامی بە نامە پەیوەندیمان بە دایکمەوە هەبوو، ئەوەش هێز و توانا و هیوای لە لامان دروست کردبوو، کە دەبێ شتێ رووبدات، ئەمەش خۆی لە خۆیدا دان بە خۆدا گرتنی کەم کرد بووینەوە، دەمانویست بە زووترین کات رزگارمان بێ، بە وڵات و خێزانی خۆمان شاد ببینەوە.

# بەشی یازدە
# "گەشتێکی بە مەبەست"

"ئەبدولکەدا" بۆ چارەسەری نەخۆشی کوڕەکەی توانیان بۆ "ئنگلاند" بەڕێکەون، لە "بەریتانیا" "ئەبدولکەدا" کوڕە نەخۆشەکەی بۆ لای باوکم بردبوو، بە مەبەستی ئەوەی، کە باوکم چاوی بەو زاوا نەخۆشە بچکۆلەیەی بکەوێت، کاتێك باوکم "ئەبدولا"ی بە ناو مێردم دەبینێ، تووشی دڵە خورپە دەبێ. ئەو کەسانەی کە چاویان بە "ئەبدولا" کەوتبوو، پێکەنینیان پێهاتبوو، لە هەمان کاتدا سەرزەنشتی باوکمیان کردبوو، پێیان گوتبوو، تۆ چۆن ئەو کچەت بەو کوڕە نەخۆشە بە شووداوە. باوکم لە شەرماندا وەڵامی هاوڕێکانی نەدابۆوە.

کاتێك کە "ئەبدولکەدا" بە تەنیا بەبێ "ئەبدولا"ی کوڕی بۆ "یەمەن" گەڕایەوە. "ئەبدولکەدا" خۆی هەموو ئەم شتانەی بۆ گێڕامەوە و گوتی: "ئەو مرۆڤانە نەیاندەتوانی رەخنە لە باوکت بگرن دەربارەی ئەو کارەی کە کردوویەتی، ئەگەر "ئەبدولا" تەندروستی باش بووایە." "ئەبدولکەدا" گوتی: "ئەو کاتەی کە لە "ئنگلاند" بووم، تەلەفۆنم بۆ دایکت کرد و لەگەڵیدا وتووێژم کرد، داوام لە دایکت کرد لە ماڵی "جەواد" یەکتری ببینین." ماڵی "جەواد" لە "بیرمینگهام" بوو. دایکم، "ئەبدولکەدا"ی بینی بوو، کاتێك دایکم هەواڵی من و "نادیا"ی لێدەپرسێ، ئەو بە دایکم دەڵێ: "کچەکان ژیانیان باشە و شوویان کردووە." هەروەها خوشکەکانمی بینی بوو. "ئەبدولکەدا"، "ئەبدولا"ی لە "ئنگلاند" جێهێشت بوو، بۆ ئەوەی چارەسەری

نەخۆشیەکەی بکەن. چەند ڕۆژێك دوای ئەوە کە لە "ئنگلاند" گەڕایەوە، "هۆکایل"ی جێهێشت و بۆ "سەئودی" گەڕایەوە.

من هەرگیز نەمزانی کە نەخۆشیەکەی "ئەبدولا" چیە و چیان لێکردووە. "ئەبدولا" ماوەی نۆ مانگ لە "ئنگلاند" مایەوە، بەلام لە کۆتاییدا ناچار بوو کە "ئنگلاند" جێهێلێ، بێ ئەوەی نەخۆشیەکەی چارەسەر بکەن و چاك ببێتەوە. لەبەر ئەوەی ماوەی ڤیزەکەی تەواو ببوو. لە هەمان کاتدا لە ڕەچەتەی دکتۆر و ئەو کاغەزانەدا بۆیان نووسی بوو، ماوەی رووخسەتی ڤیزەکەی تەواو بووە، لەگەڵ ئەمانەشدا نووسی بوویان، ئەو نەخۆشیە جارێکی تر لە داهاتوودا سەر هەڵدەداتەوەو ژیانی سەخت و پڕ ئازار دەبێ.

ئەو ماوەیەی کە لە "ئنگلاند" بوو هەندێ بالای بەرز ببوو، بەلام هەر وەکو پێشوو لاواز و هەمان کوڕە نەخۆش و زەردەکە بوو. من هەستم نەدەکرد ئەو ماوەیەی کە لە "ئنگلاند" بووە، لە بارەی چارەسەری نەخۆشیەکەیەوە شتێکیان بۆ کردبێ، هیچ دیاردەی تەنساغی پێوە دیار نەبوو. کاتێ کە بۆ ماڵەوە گەڕایەوە. ماوەی چەند هەفتەیەك لە ماڵەوە دەرنەچووە دەرەوە، تا ئەو کاتەی "ئەبدولکەدا" بۆ چارەسەری نەخۆشییەکەی بۆ "سەئود"یەی برد.

"مهەمەد"ی برای "ئەبدولا" بە نامە پەیوەندی بە باوکیەوە کرد، کە "ئەبدولا" تەندروستی باش نیە و ڕوو لە خراپی دەکات، لەبەر ئەوە داوای لە باوکی کرد، کە "ئەبدولا" بیگەیەننە "ئارەبی سەئودی" و نیشانی دکتۆری بدەن، باوکیشی لەگەڵ ئەو پێشنیازەدا بوو، "ئەبدولا" بۆ چارەسەری نەخۆشیەکەی جارێکی تریش "یەمەن"ی جێهێشت. بە ڕۆیشتنی "ئەبدولا" منیش سەر و گیانم سووك بوو و ئاهێکم بە گیاندا هات، هەر چەندە ئەو کاتانەی کە لە ماڵەوە بوو گوێم نەدەدایە و تڕۆم کردبوو.

ماوەیەکی پێچوو بیستم کە "ئەبدولا" نەشتەرگەرییەکی مەزن دەکرێت. دەردەکەشی ئەوەیە، دەماری خوێنبەری دڵی ناساغە، خوێن بە باشی ناگەیەنێ. دەبێ بۆریەکی پلاستیکی بۆ دابنێن، بۆ ئەم کاری نەشتەرگەرییەش پێویستە ماوەی شەو و ڕۆژێك بەبێ هۆشی بیخەوێنن. دکتۆرەکان لەسەدا پازدە، چانسیان بە "ئەبدولا" دابوو

که سەرکەوتوو دەبێ. ڕۆژ بە ڕۆژ ئەم هەواڵانەم پێدەگەیشت. منیش هیوادار بووم لەسەر جێگای نەشتەرگەرییەکە گیان بە دەستەوە بدا و ڕاست نەبێتەوە. بەو شێوەیە منیش ئازاد دەبووم، ئەم وڵاتەم جێدەهێشت. چەند ڕۆژێك پاش نەشتەرگەرییەکە، هەواڵم زانی کە "ئەبدوڵا" لە ژێر نەشتەرگەریەکەدا دەرچووە و ڕزگاری بووە. بە تەواوی خەم دایگرتم و پڕ بە دڵ پێم ناخۆش بوو. لەبەر ئەوەی کە "وەردە" زۆر نائارامی کوڕەکەی بوو، "ئەبدولکەدا" بروسکەیەکی بۆ ڕەوانە کرد تاکو دڵنیای بکا و مژدەی بداتێ. چەند ڕۆژێ پاش ئەو بروسکەیە "ئەبدولکەدا" خۆی گەڕایەوە، بۆ ئەوەی "وەردە"ی ژنی هێمن کاتەوە.

"ئەبدوڵا" بۆ ماوەی چەند مانگێك لە "ئارەبی سەئودی" مایەوە، تاکو تەواو هاتەوە سەر خۆی. لەبەرەوەش لە کاروباری "ریستۆرانت"ەکەدا یارمەتی باوکی دەدا. پاش ئەو چەند مانگە بە زیت و زیندوویەتی بۆ گیانی من ڕەوانەی گوندی کردەوە. کە گەڕایەوە زیت و زیندو و ڕۆژ دوای ڕۆژ ملی پان دەبوو. ئێستا دەیتوانی سکم پڕ بکا. پێشتر هەموو کەسێك ئەو پرسیارەیان لێدەکردم کە بۆچی تۆڵ نابی..؟ منیش گوێم نەدەدا یە ئەو جۆرە پرسیارانە و بەلامەوە گرنگ نەبوو. پاش ئەوەی کە تۆڵ بووم، ئەو کەسانە لەو بڕوایەدا بوون هۆی (تۆڵ) سك پڕ نەبوونم پەیوەندی بە نەخۆشیەکەی "ئەبدوڵا"وە هەبووە.

هەر دوای هاتنەوەی "ئەبدوڵا" زوو سکم پڕ بوو (تۆڵ بووم)، ساڵی 1985 بۆ یەکەمجار مەهەکی مانگانەم نەهات، ئەوە تێگەیشتم کە چی ڕوویداوە، ئەو خوێن نەهاتنەم بۆ "وەردە" گێڕایەوە، لە خۆشیاندا بەرخی وازی دەکرد. هەموو لایەك بەو هەواڵە دڵخۆش بوون، لەو ماوەیەدا تەندروستیم باش بوو، هیچ جۆرە ئازار و دڵتێکەڵ هاتنێکم نەبوو، لەگەڵ ئەوەشدا کە سکم پڕ بوو.

بەو تۆڵ بوونەم زۆر دڵخۆش بووم، لەبەر ئەوەی کە "ئەبدولکەدا" هەمیشە بەڵێنی ئەوەی پێدەدام، کە هەر کاتێك تۆڵ بووم بۆ "ئنگلاند" دەمنێرێتەوەو لەوێ منداڵەکەم ببێ. لەو ماوەی چەند مانگەدا هەرچیەك لە توانامدا بوو کردم، بۆ ئەوەی دڵیان ڕازی بکەم و نیشانیان دەم کە هەموو شتێك بە دڵی ئەوان کراوەو منیش لەگەڵ

"ئەبدولا" بەختەوەرم. هەموو ئەم مەرایییانەم لەبەر ئەوە بوو کە چاوبەستیان لێکەم. درۆی زۆرم دەکرد دەمویست خۆم ئاوا نیشان بدەم، تاکو بڕوام پێبکەن بۆ ئەوەی بۆ "ئنگلاند" بمنێرنەوە بۆ گەڕەکی "بیرمینگهام" و لەوێ منداڵەکەم ببێ.

ئەو نۆ مانگە کە تۆل بووم، "وەردە" بەرامبەرم زۆر نالەبارانە دەجووڵایەوە. بەڵام، "سەلامە" بەرامبەر بە "نادیا"، دلسۆز و نەرم بوو لە کاتی تۆل بوونەکەیدا. بەڵام من بە سکیکی زلەوە دەبووایە ئەو هەموو کارانەم هەر وەك جاران راپەراندایە. رۆژانی وا هەبوو بڕوام نەدەکرد کە بتوانم و فریای ئەو هەموو کارانە بکەوم. لەگەڵ ئەوەشدا ناچار بووم.

لەبەر ئەوەی کە "بەکالە" پیش ئەوەی کە گوندی "هۆکایل" جیهیلن و لە شار نیشتەجیبن، منداليکی تریشی بوو. ئەنجام ئەو کەوتە ناو جیهانیکی مۆدیرنەوە، من ئیرەییم پیدەبرد. ئەو منداڵەی کە بووی کور بوو. ئەم کورە هەر لەو رۆژەوەی کە لە دایك بوو نەخۆش بوو. دەبوایە زوو زوو بچوونایە بۆ شاری "تایز" و ئەو کورەیان نیشانی دکتۆر بدایە. لەبەر ئەوە "مهەمەد" داوای لە "بەکالە" ژنی کرد، کە بەیەکجاری بچنە شار و لەوێ بژین. من بە تەنیا مابوومەوە، "وەردە" هیچ کاریکی نەدەکرد، هەر خۆی دەلستەوە. هەموو کارەکانی بەسەر منـدا دابوو، جگە لە منیش کەسیکی تر نەبوو ئاو بۆ ماڵەوە بکیشێ، چیشت لینێ، گەسکی ناو ماڵ بدا و لە هەمانکاتدا سەرپەرشتی مەرو ماڵاتیشم دەکرد. ئەوە جگە لە دایك و باوکە پیرەکەی "ئەبدولکەدا"داش کە باربوون بەسەرمەوە.

هەندێ رۆژ بیرم لەو منداڵ بوونە بە ئازار و ترسناکەی ئیرە دەکردەوە، هەموو هەولیکم بۆ ئەوە بوو لە کۆتاییدا ئەوان بگەنە ئەو بڕوایەی، کە من وازم لەسەرکیشی هیناوە و هەموو شتیك بە دلی ئەوانە و بووکیکی دلسۆزیان هەیە. تەنیا بە مەبەستی ئەوەی کە ریگام بدەن بەسەردان بۆ "ئنگلاند" بگەریمەوە، ئەو کاتەش بە تەواوی لەم وڵاتە خۆم رزگار دەکرد. هەندیك رۆژیش دەکەوتمە گومانەوە، نەکا شتیك رووبدا و لە بەلینەکەی خۆیان پەشیمان بنەوە. بۆ ئەوەی کە دەربازم ببێ، شانم دایە بەر کاروباری ناو ماڵ و بەردەوام بووم. "سەلامە" لای خۆیەوە بەزەیی پیامدا دەهاتەوە، بۆیە بواری

بە "نادیا" دابوو، ئەویش دەهات و یارمەتی دەدام. کاتێ کە دەچووم بۆ ئاوکێشان، ژنانی سەر بیر کە چاویان پێم دەکەوت، ڕادەچڵەکین، کە سکەکەم هەشت مانگە و تاکو ئێستا دەبێ بەسەرسەر و بەسەر شان ئاوکێش بکەم...! بەو گڕوگەرمی خۆرەتاوە بە سکێکی زل و لەشێکی پڕ ئازارەوە، درێژەم بەو ژیانە کۆیلەمەرگیەدا، هێندە شەکەت بووم پاکانم لە دووم نەدەهاتن.

لەدوا مانگی سکەکەمدا، بە هەموو شێوەیەك هەوڵم دەدا، تا ئەو شوێنەی کە دەکرێ پشوو بدەم و خۆم ئازار نەدەم. ڕۆژێکیان پاش نیوەڕۆژ، لەسەر جێگاکەم ڕاکشا بووم، چەند جارێ گوێم لە دەنگی "ئامینە" بوو لەسەر بانیژگەکەی خۆیان لە ژێر خانووەکەی ئێمەوە بانگم دەکا، وچانێکی ویست تاکو توانیم لەسەر جێگاکەم بەرز بمەوە، کە چوومە دەرەوە، "ئامینە" گوتی: ""زانا" مهەمەد پاکەتێکی لە شاری "تایز"ەوە بۆ ڕەوانە کردووی لە خوارەوەیە، دەتوانین هەردووکمان دابەزین بۆ ناو ئاوایی و بیهێنین." "وەردە" بە پرتاو لە پێش ئێمەوە بۆی دەرچوو، منیش بەرەو گوند هاتمە خوارەوە.

کاتێ کە گەیشتمە ناو ئاوایی، کە سەیرم کرد کۆمەڵێك لە خەڵکی گوند کۆبوونەتەوە و مۆڵیان بەستووە، بە گوێی یەکدا فسکە فسکیانە. کاتێك کە ئەوەم بینی تێگەیشتم کە شتێکی نامۆ بەرامبەر ئەوان لە ئارادایە. کە منیان بینی کردیان بە وتووێژ و دەنگیان لێهەڵبڕی. من شتێکم لە ڕێگاکەی خوارەوە دەبینی بەڵام "جێپی لاندرۆڤەر"م نەبینی، بەڵام ئەوە تێگەیشتم لەوانەیە تاکو ئێستاش جێپەکە هەر وەستا بێ و پاکەتەکەم بدەنێ.

لە ناکاو "خەولە" بە ڕوویەکی خۆش و پێکەنیناویەوە هات و گوتی: "زانا دایکت هاتووە، لەو ڕێگایە راوەستاوە و چاوەڕێی تۆ دەکا." کاتێ کە بە گردەکەدا سەرکەوتم چاوم بە ئۆتۆمبیلێك کەوت، بە ڕێگاکەدا بەرەو شار دەگەڕێتەوە. کە بە سەرنجەوە سەیری ڕێگاکەم کرد دوو کەس لە تەنیشتی ڕێگاکە راوەستاون، ژنێ بلوزێکی سووری لەبەردا بوو، لەگەڵ کوڕێکی مێرد منداڵدا، کە نەمدەناسی کێیە، ئەمە بۆ جاری یەکەم بوو لە ماوەی ئەم چەند ساڵەدا ژنێکی بێ سەرپۆش ببینم. وەك بت لە جێگای خۆم

وشك بووم. تووشی دڵە خورپێ هاتم، هێزم تیادا نەما، فرمێسك لە چاوانم خوڕە خوڕ دەهاتنە خوارێ، وا هەستم دەکرد خەریکە دڵم دەوەستێ. هەروەك لەسەر پلەی پەیژەیەك هەڵخلیسکم و سەرەو ژێر ببمەوە و بکەومە بەردەمیان. دایکم کە چاوی بە من کەوت باوەشی بۆ کردمەوە، کاتێ کە گەیشتمە لایان هەردووکمان دەستمان بە گریان کرد و باوەشمان بەیەکدا کرد، بۆ ماوەیەك تێك ئالاین، لە یەکتری تێر نەدەبووین. ژنەکانی گوند بەبێ دەنگی راوەستا بوون و بەسەرنجەوە تێیان دەڕوانین.

کاتێ کە دایکم بەردا، ئەو کوڕەکەی پێناساندم کە لە تەنیشتیەوە وەستا بوو، گوتی: "ئەوە "زانا"ی خوشکتە، سڵاوی لێبکە." کە دایکم ئەوەی پێگوت، تێگەیشتم کە ئەوە "مۆ"ی برامە. لەڕاستیدا نەمناسیەوە، لە ماوەی ئەو پێنج ساڵەدا گەلێك گۆڕا بوو. "مۆ" خۆی بۆ رانەگیرا، دەستی بە گریان کرد. زانیم گڕەوگەرما وەڕسی کردووین. بۆیە پێم گوتن: "با بڕۆین لە ژێر ئەم گڕوگەرمایەدا رانەوەستین."

هەر چەندە مانگی خۆم بوو، بەڵام بە خێرایی بەسەر گردەکەدا سەردەکەوتم، بەڵام بۆ دایکم ئاسان نەبوو، لەبەر ئەوە دایکم داوای لێکردم لەسەر خۆ بڕۆم. گەیشتینە بەر ماڵی "ئەبدولنور" لە دەرەوە لەسەر سەکۆیەکی چیمەنتۆ لە ژێر سێبەرێك لێیدانیشتین. خەڵکی دێکە لە دەورمان کۆزیلکەیان بەست، چاویان لە ئێمە بڕیبوو. من نەمدەزانی کە چی بڵێم، "ئامینە" بێدەنگی شکاند. "ئاوا... "زانا" ئەوە دایکتە...؟" وەڵامی "ئامینە"م نەدایەوە، لەبری ئەوە دایکم بە پرسیار داگرتەوە.

"چی ڕوویدا...؟ چۆن ئێرەت دۆزیەوە...؟ هاتووی کە بمانبەیتەوە...؟"

دایکم گوتی: "ئێستا وازم لێبێنە با تۆزێك پشوو بدەم، دوایی هەموو شتێکت بۆ ڕوونەدکەمەوە. ...خانووەکەتان لە کوێیە...؟" منیش دەستێکم بۆ لوتکەی چیاکە هەڵبڕی، دایکم بڕوای نەدەکرد. بەسەر سامیەوە گوتی: "دەبێت بۆ ئەوێ سەرکەوین...؟!"

"ئامینە" خواردنەوەیەکی ساردی بۆ هێنایین، ئاهێك بە بەر دایکمدا هاتەوە. بە ئاواتەوە بووم کە هەرچی زووترە دایکم بەرمە سەرەوە بۆ ئەوەی ببینێت کە چیمان

بەسەر هاتووە. من هۆشم لەبەر بڕابوو، دەمویست هەموو شتێك لە دایكم ببیستم و بزانم.

نزیكەی نیو كاژێری برد تاكو لە هەورازەكە سەركەوتین، كاتێك گەیشتینە بەر دەركی ماڵەوە، دایكم هێزی لەبەر بڕابوو، خەریك بوو بكەوێت، تەنانەت توانای ئەوەی نەمابوو كە بچێتە ژوورەوە.

ئەگەر پێشتر بمزانیایە كە دایكم دێ، هەوڵم دەدا نەختێك خواردنی بۆ ئامادە بكەم، یان هیچ نەبێ بتوانم خزمەتێكی باشی بكەم. لە ماڵەوە خواردنێكی وامان نەبوو بیدەم بە یەكێ كە لە "ئینگلاند"ەوە هاتبێت. تەنیا گەنمەشامیمان هەبوو، لە سەرەتادا كە منیش بۆ ئەم گوندە هاتم، هەموو ئەم شتانە بە منیش نامۆ بوون، بەڵام پاش ماوەیەك بە ناچاری خۆم لەگەڵ ئەم جۆرە خواردنانەدا راهێنا. بەڵام دایكم نەیدەتوانی ئەو خواردنانە بخوات، لەوانە بوو لێشی بسڵەمێتەوە.

مێش و مەگەز بە هەموو لایەكدا گیز و وڕیان بوو، بە لەش و لاری دایكمەوە نیشتبوونەوە، ئەم هاتنەی دایكم ئەوەی دەهێنامەوە یاد، كە لە یەكەمجاردا بۆ ئێرە هاتم، چۆن بە هەموو شتەكان نامۆ بووم، بەڵام لە ماوەی ئەو چەند ساڵەدا لەسەرخۆ ماڵی كرام و لەسەر ئەم ژیانە راهێنرام.

"خەولە" جانتاكانی دایكمی بۆ ژووری سەرەوە برد. پاشان گوتی: "دەچم بۆ گوندی "ئاسكۆبی" "نادیا" لەگەڵ خۆم دێنم." بەڵام من داوام لە "خەولە" كرد بە "نادیا" نەڵێ، كە دایكم هاتووە و لێرەیە. ئێمەش چووینە ژوورەوە. لە ژوورەكەی خۆم دانیشتین، دایكم دەستی كرد بە گێڕانەوەی شتەكان. كەچی كردووە و چی ڕوویداوە. دایكم گوتی: " دوای ئەوەی كە ئێوە لە سەفەرەكەتان نەگەڕانەوە، هەر زوو هەستم بەوە كرد كە لە "یەمەن" شتێكتان بەسەرهاتووە." بەڵام دایكم بە تەواوی نەیزانی بوو كەچی لە ئارادایە و هۆی نەگەڕانەوەمان چیە. ئەو پیاوانەی كە لە "یەمەن"ەوە بۆ "ئینگلاند" دەگەڕانەوە، هەواڵی ئێمەیان دەبرد و دایكیشم دەیبیستەوە. كاتێ دایكم دەزانێ كە باوكم چی كردووە، لە ئەنجامدا كاروباری دوكان و باوكیشم جێدەهێڵێ، پەلی "مۆ"، "تینا" و "ئاشیا" دەگرێ و دەیانبا و دەگوێزێتەوە. ئەمە ساڵێ پاش ئەوەی كە

مـن و "نادیـا" لـە یەمـەن بوویـن. دوای ئـەوە دایکـم نامـە دەنووسـێ بـۆ بـەڕێز "نیگـڵ کانتوێڵ" بەرپرسیاری "Defence of Children International" لە جنێڤ و داوای یارمـەتی لێدەکا.

دایکم گوتی: " زۆر دەترسام لەوەی کە کارەکە بـە شـێوەیەکی تـر ڕەنـگ بداتـەوە، "یەمەنی"ەکان بەوە بزانـن و بـە تـەواوی لـە نـاو چیاکانـدا شـوێنە ونتانکـەن." بـەڕێز "کانتوێڵ" نامەگەلێکی زۆر لەو بارەیەوە بۆ لێپرسراوانی "یەمەن"ی دەنووسـێ، بـەڵام تەنیا جارێك وەڵامی دەدەنەوە، لە وەڵامی لێپرسراوانی "یەمەن"یدا ئـەوە دەڵێـن: "لـە ڕووداوەکـە دەکۆڵینـەوە." بـەڕێز "کـانتوێڵ" بـە دایکـم دەڵـێ: کـە دەسـەڵاتدارانی "یەمەن"ی دەڵێن: "ئەو ناوچەیـە لەسـەر نەخشـە بوونـی نیـە، بـەڵام لەگـەڵ ئەوەشـدا پۆلیسـی "تـایز" هـەندێك بـەرتیلیان دانـاوە بـۆ ئـەو کەسـەی کـە بـەدوای ئـەو کچانـەدا بگەڕێ، بەڵام کەس بەو کارە هەڵنەسـتاوە، لەبـەر ئـەوە هەوڵـەکانی هـەموو لایـەك بـێ ئەنجام بووە."

ڕۆژێکیـان دایکـم دەچێتـە دەرەوە، بـۆ دووکـانێك لـە نزیـك خانووەکـەی خۆیـەوە تەلـەفۆن بکـا، لـەو کاتـەدا کـە لـە دووکانەکـەدا خـەریکی تەلـەفۆن کـردن دەبـێ، ئۆتۆمۆبیلێـك خـۆی دەکا بـە دووکانەکەدا و دایکـم بـە گرانـی بریـنـدار دەبـێ، پاشـان دەیگەیەننـە نەخۆشـخانە و نەشـتەرگەری دەکـرێ. دوای مـاوەی چـەند سـاڵێك لـە بـری بریندار بوونەکەی 6500 "پاوەند"ی دەدەنێ. خەڵکی بە دایکمیان گوتبوو، ئەگەر بـێ و سکاڵا ببەیتە بەردەمی دادگا، ئـەو کاتـە دادگـا گـەلێك زۆرتـر لـەو دراوەت بـۆ دەپچڕن. بەڵام دایکم ئەوەی نەکرد بوو. پاش ئەو هەموو هەوڵدانانەی کـە بـۆ دۆزینـەوەی ئێمـە دەکرێ، بێ ئەنجام دەبێ کە ئێمە بدۆزێتەوە. لەبەر ئـەوە دایکـم بڕیـاری دابـوو لەگـەڵ "مـۆ"ی برامـدا بـەرەو "یەمـەن" هـەڵفڕن و خۆیـان بـە شـوێنماندا بگـەڕێن و بماندۆزێتەوە. بە ماوەیەك پێش ئەوە دایکم پلانەکە بۆ بەرێز "کـانتوێڵ" بـاس دەکـا. ئەویش بە دایکم دەڵێ: "ئەگەر بێت و لەم کارەدا سەرنەکەوتی، ئەوا کاتی ئەوە هاتووە کە دەمی "میدیا" بکەینەوە، هیچ شتێکی تر نیە کە بیدۆزینین." دایکم ئەوەشی گوت، ئەو ڕوودانی ئۆتۆمۆبیلە، چارەنووسێکی باش بوو، کـە توانـی هـەندێ دراو وەرگـرێ بـۆ

ئەوەی ئـەو سـەفەرەی پێبکـا و بـەدوای ئێمـەدا بگـەڕێ. بـەڵام دایکـم پێـش ئـەوەی کـە دراوەکـە وەرگـرێ. زوو زوو بـە تەلـەفۆن و نامـە پـەیوەندی بـە بـەڕێز "کـانتوێڵ"وە دەکات، و پێی دەڵێ، هەر کاتێ ئـەو دراوەم بـۆ هـات کـە بڕیـاری لەسـەر دراوە، یەکسـەر بەرەو "یەمەن" سەفەر دەکەم، بەڵام دایکم مـاوەی سـێ دانـە سـاڵ چـاوەڕێ دەبـێ تـاکو ئەو دراوە دەگاتە دەستی.

کـاتێك دایکـم و "مـۆ" دەگەنـە "یەمـەن" لـە پێشـدا یـاریدەدەری کۆنسـوڵی "بەریتانی" "کۆلین پـەیج" دەبینـن، ئـەو پیـاوە زۆر بێشـەرمانە دەست بـە ڕوویانـەوە دەنێ، بە دایکم دەڵێ، ئەو هەوڵانەی کە تۆ دەیدەی هیچ سوودێکی نیە، تـۆ هیـچ جۆرە چانسێکت نیە، ئەو کچانە لە "یەمـەن" بەریتـە دەرەوە. لەبـەر ئـەوە چاکتر وایـە هـەر ئێستا دەستبەجێ بۆ "ئنگلانـد" بگەڕێیتـەوە، واز لـە کچـەکان بێنـە، بـا لای پیاوەکـانی خۆیان بمێننەوە. ئەو پیـاوە سـەری لـەوە دەرنـەچوو بـوو کـە دایکـم بـە چ مێشـکێکەوە هاتووە و دەیەوێ ئێمە بدۆزێتەوە.! لە کۆتاییدا دایکم ناوی ناوچەکە و ناوی گوندەکـان بە "کۆلین پەیج" دەڵێـت. بـەڵام نـاوی ئـەم ناوچـە و گوندانـە، لـە لای "کۆلـین پـەیج" بێبایەخ دەبێ، لەبەر ئەوەی ئـەو ناوچـە و گوندانـە لەسـەر نەخشـەی وڵاتـی "یەمـەن" دیاری نەکراوەو لە نەخشەدا نیە.

کاتێ دایکم بیرۆی بەڕێز، "پەیج" جێدەهێڵێ، ئەو بەڕێزە، ئامۆژگاری دایکم دەکا و دەڵێ: چاوت لە "مۆ" بێت و ئاگادار بە، لەبەر ئەوەی کـە دەسـەڵاتدارانی "یەمـەن"ی دەتوانن ئەویش گل بدەنەوەو نەهێڵن لە "یەمەن" دەرچێتە دەرەوە.

پـاش ئـەوە کـە دایکـم بـە نـائومێدی و بـەبێ یارمـەتی باڵیۆزخانـەی "بـەریتان"ی جێدەهێڵێ، بـەرەو شـاری "تـایز" سـواری پـاس دەبـن. مـن زووتـر لـە نامـەدا باسـی هاوڕێکەی "ئەبدولکەدا"، "ناسر"م بۆ دایکم کرد بوو پێشنیازی ئەوەشم بـۆ کـرد بـوو، ئەگـەر بـۆ "یەمـەن" هـات، لـە شـاری "تـایز" پـەیوەندی بـە ناسـر"ەوە بکـا. دایکـم وێنەیەکی "مهەمەد"ی کوڕی "ئەبدولکەدا"ی لەگەڵ خۆی هێنا بـوو، وێنەکـە لـە سـاڵی 1980 گیرا بـوو، لـە هـەمان کـاتدا دایکـم ئـەوەی دەزانـی کـە ئێسـتا "مهەمـەد" لەگـەڵ خێزانەکەیدا لە شاری "تایز" دەژین و لـە کارگەیـەکی ڕۆن دروسـت کـردن کـار دەکـات،

ماوەی سێ رۆژ دایکم هەموو شار تەیدەکات، لە هەمان کاتدا بە دوای یەکێکدا دەگەڕێت کە زمانی "ئنگلیز"ی بزانێ، وێنەکەی "مهەمەد" نیشـانی خـەڵکان دەدا، بـەڵکو یـەکێك خۆو بەخت بیناسێ و شوێنی کارەکەی "مهەمەد" بدۆزێتەوە. دایکـم نـاوی ناوچەکـە و گوندەکـان لـە خـەڵکی دەپرسـێ. بـە ڕێکـەوت یـەکێ "ناسـر" دەناسـێ و دایکــم بــۆ لای "ناسر" دەبا. "ناسر" دەستبەجێ بە دوای "مهەمەد"دا دەنێرێ کە بێ و دایکم ببینێ.

کاتێ کە "مهەمەد" دایکم دەبینێ، وەك لە سەربانێکەوە فڕێیدەنە خوارەوە، بەڵام بە دەنگیانەوە دێ و کارەکەی دایکم مەیسـەر دەکـا، بـەرەو "مۆکبانـە" ڕەوانـەیان دەکـا، "مهەمەد" پێش ئەوەی کە گفت بە دایکم بدا، تەلـەفۆن بـۆ "سـەئودی" دەکـا و لەگـەڵ باوکیدا گفتوگۆ دەکا، پاشان داوا لە دایکم دەکا کە لەگەڵ باوکیدا بپەیڤێ. دایکم گوتـی، کاتێ بە تەلەفۆن دەپەیڤین، "ئەبدولکەدا" تووڕەیی و ترس لە وتـەکانیا دیـار بـوو. بـە دایکمی گوتبوو: "بۆچی هاتووی..؟ کارت بـەو کچانـە چیـە..؟ دەتـەوێ چـی بکـەی...؟" دایکمی ئاگادار کرد بۆوە کە کارێکی ناپەسـەند نـەکات. دایکیشـم بـۆ ئـەوەی ئـەو پیـاوە هەست بە هیــچ شـتێ نـەکا، هێمنـی دەکاتـەوە، پێیدەڵـێ: " تـەنیا بـۆ ئـەوە هـاتووم کـە سەردانیان بکەم و چاوم بە کچەکانم بکەوێ."

ئەو بە تووڕەییەوە بە دایکم دەڵێ: "باوکی ئەو کچانە نامەی بۆ ناردووم، منی لـە بارەی ئەو کچانەوە سەرپشك کردووە، کە چۆن بڕیاریان لەسەر بدەم، ئەگەر بێت و تـۆ ناخۆشیەك بنێیتەوە، ئەو دەمە بڕیاری خۆم دەدەم."

دایکم لەسەرخۆ "ئەبدولکەدا" هێمن دەکاتەوەو تەلەفۆنەکـە دادەخـا. "مهەمـەد" بە شەرمەوە بۆ دایکمی دەگێڕێتەوە، کە باوکم، ئێمــەی فرۆشـتووە بـە 1300 "پـاوەند". ئەوە بۆ یەکەمجارە کە دایکم بەو فرۆشتنەی ئێمە دەزانێ.

دایکم پێشتر ئەوەی زانی بوو، هەموو ئەو نامانەی کە لە نێوانماندا بـۆ یـەکتریمان ڕەوانە کرد بوو، "ناسر" هەموویانی خوێندۆتەوە. دایکم زووتر زانیاری لەسەر "ناسر" بە دەسەڵاتدارانی "یەمەن"ی دابـوو، لەسـەر ئـەو کـارە کـە "ناسـر" کردبـووی زیندانـی کرابوو. بەڵام لەڕاستیدا "ئەبدولکەدا" و "جەواد" "ناسریان" راسپاردبوو کـە نامـەکانی ئێمە بخوێنێتەوە. لە بری ئـەو کـارە هـەندێك دراویـان بـە "ناسـر" دابـوو. ئێمـە کـاتی

خۆی ئەم شتانەمان نەدەزانی. کاتێ کە دایکم دێ بۆ "تـایز" و دێتـە لای "ناسـر"، ئـەو پیـاوە دایکـم نیشـانی ناسـیاوەکانی خـۆی دەدا، دەڵـێ: "ئـا ئـەم ژنــە بــوو، کــە تووشــی بەندیخانە و کێشە کێشی کردم."

دایکم و "مۆ" شـەوێ لـە مـاڵی "مهەمـەد" دەمێننـەوە، بـۆ بـەیانی جێپێکیـان بـۆ دەگرێ و ڕەوانەی لای منیان دەکا. کاتـێ دایکـم و "مـۆ" شـار جێدێڵن، بـەرەو بیابـانی چارەنووس بەرێدەکەون، کە ئەو خانووە لە قوڕ و بەرد دروستکراوە بچوکانـە دەبینـن، زراویـان دەچـێ، وا دێتـە بـەرچاویان کـە ئـەم ناوچانـە بـەر بــۆم دراون. دایکـم گوتــی: "بینینی ئەو دیمەنانە خەوێکی ناخۆش بوو."

کاتێك کە دایکم لە گێڕانــەوەی شـتەکانی خـۆی بـۆوە، نـۆرەی مـن هـات، شـتەکانی خۆم بگێڕمەوە. لە کاتی گێڕانەوەدا، هەسـتم دەکـرد کـە دایکـم موچووڕکـە بـە لەشـیدا دێ. من لە گێڕانەوەکەمدا نەدەچوومە ناوەرۆکی شتەکانەوە، هـەر هێنـدە شـتەکانم بـە شێوەیەکی ڕووکەشی باس دەکرد، کە چۆن ڕوویانداوە. بەڵام دایکم ئەوەی نەدەزانی کە هەریەکـەیان چـۆن ئـازار و ژانێـك بـوون. لـە گێڕانـەوەی ئـەو شـتانەدا دایکـم سەرســام مابوو. تەزوو بە گیانیدا دەهات.

کاتێك کە پێیان ڕاگەیاندم "نادیا" خەریکە دەگاتە لامان بە تەنیا چوومــە دەرەوە بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی وا بە "نادیا" بڵێم کە دایکـم هـاتووە، کـە تووشـی دڵـە خورپـە نەبێ. "نادیا"ش بە وێنەی من یەکسـەر باوەشـی بـە دایکمـدا کـرد، ئـەو دەمـە "هـانی" تەمەنی دوو ساڵان بوو، کە چـاوی بـە دایکـم و جلوبەرگـەکانی بـەری کـەوت، دەترسـا و خۆی دەشاردەوە.

کاتێ کە دایکم و "مۆ" هاتنەماڵەوە، "وەردە" هیچ ڕوویەکی گـرژی پیشـان نـەدا. بە پێچەوانەوە خواردنەوەشی بۆ هێنان.

لە سەرەتاوە کە دایکم لەسەر ڕێگاکە بینی کە ڕاوەستا بوو. وام دەزانـی کـە دایکـم بە شوێنماندا هاتووە و یەکسەری لە تەك خۆیدا دەمانباتـەوە. بـەڵام کـە لـەو بارەیـەوە کەوتینە گفتوگۆ، زانیم کە ناتوانین ئاوا بە سانایی ئێرە جێهێڵین.

دایکیشم له لایەن خۆیەوە کارەکانی بـە باشی هەڵنەسووڕاند بـوو، بـۆ نموونـە تـا ئەو کاتەش پەیوەندی بـە دەزگای ڕاگەیاندنـەوە نـەکرد بـوو، مـن داوام لـە دایکـم کـرد کاتێك کە بۆ "ئنگلاند" گەڕایەوە دەسبەجێ پەیوەندی بە دەزگای ڕاگەیاندنـەوە بکا و هەوڵی ئەوە بدا، کارێکی وا بکەن کە یارمەتیمان بدەن.

مـن و دایکـم لەسـەر ئـەوە ڕێککـەوتین، بـەڵام دایکـم گوتـی: "بـۆ ئـەو مەبەسـتە پێویسـتی بـە کەرەسـەی بەڵگـەدار هەیـە." منیـش پێشـنیازی ئـەوەم کـرد کـە لەسـەر کاسێتێك دەنگی خۆم تۆمار کەم، دایکم ئـەو کاسێتە بنـێرێت بـۆ "جنێـڤ" بـە هیـوای ئـەوە کـە بـە دەسـتی بـەڕێز "کـانتوێڵ" بگـا، هـەروەها کۆپـی ئـەو کاسـێتە بـە ڕۆژنامەوانەکان بدرێ. بڕیارماندا کە ئەم جارە بە وتەکانی خۆم دەزگای ڕاگـەیاندن بـە ئاگا بهێنم، کە چیمان بەسەر هاتووە.

ئەو "تەیپ"ە (تەسجیل) بچکۆلەیەی کە کاتی خـۆی لـە "ئنگلانـد"ەوە هێنـابووم، تاکو ئەو دەمەش بەکارم دەهێنا، بە تەنیا چوومـە سـەربان و دەنگـی خـۆم تۆمـار کـرد، داوام لـە بـەڕێز "کـانتوێڵ" کـرد کـە یارمـەتیمان بـدا. گێڕانـەوەی ئـەو شـتانە و تۆمارکردنی کارێکی گران بوو. نەمدەزانی کە چۆن و لـە کوێـوە دەست پێکەم، ئاسان نـەبوو کـە بتـوانم ئـەو وشـە کاریگەریانـە بـە "ئنگلیـز"ی داڕێـژم. کاتێ کـە خـەریکی تۆمارکردنی کاسێتەکە بووم، لوشکە لوشکی گریان ڕێگای بیرکردنـەوەی لێگـرتم، زانیـم بەو شێوەیە کارەکەم ناچێتە سەر. لەبەر ئەوە دەسـتم لـە تۆمـار کـردن هـەڵگرت، تـاکو نەختێ هاتمەوە سەرخۆم، پاشان دەستم بە تۆمارکردنی کاسێتەکە کـردەوە. ئـەم کـارەم چـەند کـاژێرێکی خایـاند، لـە کۆتـاییدا توانیـم کاسـێتەکە بـە باشـی بـە دەنگـی خـۆم و گێڕانەوەی ڕاستیەکان پڕ بکەمەوە. کاسێتەکەم هێنا و دامە دەست دایکـم. داوام لێکـرد کە گوێ لەو کاسـێتە نـەگرێ، لەبـەر ئـەوە زۆر شـتم تێـدا تۆمـارکردبوو کـە دایکـم لـەو بارەیەوە هیچی نەدەزانی، بۆ نموونە کە "ئەبدولکەدا" چۆنی لێدابووم، دەمزانی ئەگەر دایکم ئەوانە ببیستێ خەمیان پێدەخوا. لەبەر ئەوە داوام لێکـرد بـە زووتریـن کـات لـە بنی جانتاکەی خۆیدا بیشارێتەوە و لەگەڵ خۆیدا بیباتەوە.

دایکم بۆ ماوەی دوو هەفتە لە لای ئیمە مایەوە. ماوەیـەك لای مـن و ماوەیـەکیش لای "نادیا" بوو. ئەو کاتانەی کە لەلای مـن بـوو، هـەولم دەدا لەبـەر چـاوی ئـەو کـار و فەرمانـەکانی نـاو مـاڵ نەکـەم، بـۆ ئـەوەی نـەزانیٚ کـە چـەند کارەکـانم گرانـە، دەنـا لــە خەفەتا دلی دەوەستا. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نەمدەتوانی کـە چـاوی ببەسـتم، تـاکو ئـەو کاتەش رۆژانە بە دزیەوە دەچووم ئاوم لە بیرەکان هەلدەهینجا و بە گۆزە بەسـەر سـەر دەمهینایەوە، کاتیك کە دایکم و "مۆ" لە لای مـن بـوون، لەبـەر ئـەوەی زۆر گـەرم بـوو، پیویستمان بە ئاوی زۆرتر هەبوو، دەبووایە رۆژی چەند جار خۆیان بشتایە.

ئـەو ماوەیـەی کـە دایکـم لـە لای ئیمـە بـوو، نەیدەویست بـە هیـچ لایـەکدا بچـیٚ، ئـارەزووی لـە بینینـی هیـچ شـتیٚ نـەبوو، تـەنیا ئـەوەی دەویست لـە مالـەوە لای مـــن و "نادیـا" دانیشـیٚ. کاتـیٚ کـە دایکـم لای ئیمـە بـوو، مالەکـەمان جمـەی دەهـات، خـەلکی دەهاتن بۆ سەردان، ئەو کەسانەی کە دەهاتن، هەموویان خەریکی "گات"جوویـن بـوون، بە هەموو لایەکدا تۆپەلە "گات"ی جووراویان فریدەدایە سەر زەوی. دایکم لەگەڵ ئـەو دیمەنە راهاتبوو. ئەو ژنانـەی کـە دەهـاتن، چاویـان بـە دایکـم دەکـەوت، دلـی دایکمیـان دەدایەوە، بەشداری خەمی بوون. بەو کارەی کـە بەسـەر ئیمـەدا هینـرا بـوو. "مـۆ" بـە تەواوی کەلەیی ببوو. ئەو دەیویست هەموویان بکوژیٚ. هەرەشەی کوشـتنی لـە بـاوکم و "ئەبدولکـەدا" دەکـرد. مـن دەبووایـە بـە بـەردەوامی بـۆ نـاو گونـد دابـەزم، بـۆ ئـــەوەی خواردنی تازەم بۆ دایکم و "مۆ" بکریایە. کاتیك کـە دایکـم لای مـن بـوو، "سـەلامە"ی خەسووی "نادیا" دەستی نەدەهینایە ریگای "نادیا" و مەرەخەسـی دەکـرد، ئـەو کاتانـە "نادیا"ش لەلای من بوو، بەڵام کاتـیٚ کـە دایکـم چـوو بـۆ لای "نادیـا" و لـەویٚ مایـەوە، "وەردە" ریگای بە من نەدا کە لەگەلیاندا بچم. ئەو ماوەیە لای "نادیا" بمینمەوە.

لەو ماوەی دوو هەفتەیەدا دایکم بە تەواوی وەرس ببوو، بە دەست میش و مەگەز و میشوولەوە، هەر وەك چۆن یەکەمجار من و "نادیا" هاتین بۆ ئیرە و خەریك بوو لـە پیستی خۆمان بچینە دەرەوە، بەڵام ئیستا ئیمە لە ماوەی ئەو پینـج سالەدا لەگـەڵ ئـەو وەرس بوونە راهاتبووین.

ئـەو ژووره نوێیـەی کـە دروسـتمان کردبـوو، تـەواو ببــوو. دایکــم و "مــۆ" لــەوێ دەخــەوتن، مــن وام دەزانــی لــەو ژوورەدا مێشــووله دەمیــان نایگاتــێ، بــەڵام مێشــووله لــە هەموو شوێنێکدا گیز و ووڕیان بوو. دایکـم تەندروسـتی بـاش نـەبوو، "مـۆ"ش هـەموو لەشـی ببـوو بـە لـیر و هـەر هـەڵێدەکڕاند. پـاش ئـەو دوو هەفتەیـە مـن و "نادیـا" نـەمانتوانی لـەوە پـتر دایکمـان گلدەینـەوە، لەبـەر ئـەوە بـە دایکـم گـوت: "بگەڕێنــەوە، خـەمی ئێمــە مــەخۆن، ئێمــە ئــەوە مــاوەی پێنــج ســاڵە لــێرەین، ماوەیــەکی تریــش رایدەکێشین و ئارام دەگرین، تا ئەو کاتەی ئێره جێدەهێڵین."

دایکـم دەیگـوت: "زۆر هەسـت بـە بێدەسـەڵاتی دەکـەم، لـە کـاتێکدا کـە هیچـم بــۆ ناکرێ." بەڵام دایکم لەو بڕوایەدا بوو، کاتێ کـە بـۆ "ئنگلانـد" بگەڕێتـەوە، پـەیوەندی بە زۆر لایەنەوە دەکا.

جێپێێکمان بـۆ دایکـم پـەیدا کـرد، بـە هـۆی زاواکـەی "ئامینـە"وە بـۆ بەیانیەکـەی جێپەکە لەسەر ڕێگای ناوگوند چاوەڕێی دەکردین، دایکم و "مۆ"م بردە خوارەوە بــەڵام "نادیـا" نـەهات، لەبـەر ئـەوە هـەر ئێـوارێ ماڵئـاوایی لـە دایکـم و "مـۆ" کـرد. "نادیـا" گوتی: "بەرگەی ئەوە ناگرم و خۆم بۆ ڕاناگیرێ، کاتێ دایکم و "مۆ" ببینـم کـە جێمـان دێڵن." کاتێك کە هاتینە خوارەوە، بۆ ئەوەی دایکـم و "مـۆ" ڕەوانـە بکـەم، دایکـم پێـی گـوتم: " "زانـا" ئـەوەندە گوێـی مـەدەرێ و خـەم مـەخۆ، مـن ئـەو کاسـێتە دەگەیەنمــە شوێنی خۆی." کاتێ کە دایکم و "مۆ" سواری ئۆتۆمۆبیلەکە بوون ماڵئاواییان لێکردم و ڕۆیشـتن. منیـش بـە چیاکـەدا بـەرەو مــاڵ هەڵگــەڕام. لــەو کاتانــەدا نــەمتوانی تــەنیا ئاوڕێکیش بۆ دواوە بدەمەوە و سەیری ئەو ئۆتۆمبیلە بکەم کە دایکم و "مـۆ"ی بـەرەو بیابـان کێـش دەکـرد، لـەو بڕوایـەدا بـووم بـە ئاوڕدانەوەیــەك بــۆ دواوە و بــە بینینــی ئۆتۆمۆبیلەکە، دڵم لە داخاندا یەکاڵا بێتەوە.

کـاتێك گەیشـتمە نـاو ژوورەکـەی خـۆم، بـە تـەواوی هـێزم لەبـەر بڕابــوو. لەســەر جێگاکەم ڕاکشام، هەموو گیانم تێك شکابوو بەدەم لوشکە لوشکی گریانــەوە، چـین چـین ئارەقم دەردەدا.

"ئەبدولکەدا" دڵنیا بوو لەوە، کە ئیتر ناتوانێ متمانە بە ئێمە بکا، لەبەر ئەوە بە پرتاو لە "ئارەبی سەئودی"ەوە گەڕایەوە، بۆ ئەوەی کە بزانێ ئایا گۆڕانکاریەك ڕوویداوە. ئەو وا بیری دەکردەوە کە دایکم بۆ ماوەی چەند مانگێك لە لامان دەمێنێتەوە، بەڵام کاتێ کە ئەو پیاوە دەگاتەوە شاری "تایز"، هەواڵ دەزانێت کە دایکم لە گوند نەماوەو بەرەو شاری "تایز" گەڕاوەتەوە، بۆ ئەوەی بەرەو "ئنگلاند" هەڵفڕێ، هەر چۆنێ دەبێ دایکم دەدۆزێتەوە. دەزانێ دایکم بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە مشوورێکی ئازادکردن و دەربازکردنی ئێمە بخوا. لەبەر ئەوە بە دایکم دەڵێ: "واز لەو نیازەی خۆت بێنە و لە بیری خۆتی بەرەوە، هیچ کارێکت بۆ ناکرێ، واز لە کچەکان بێنە و سەر یان لێمەشێوێنە. "بەڵام دایکم گوێ بەو ڕاوێژانەی ئەو نادا.

بۆ ئێوارەی ئەو ڕۆژە "ئەبدولکەدا" لەگەڵ "مهەمەد"ی کوڕیدا بەرەو گوند گەڕانەوە، چاوەکانی شەڕیان لێدەباری، ئەو دەیزانی کە ئێمە لە هەوڵدانی خۆ دەرباز کردنداین. ئەو دەیویست کوتومت دەربارەی ئەو شتانە بزانێ کە چی ڕوویداوە، لە کاتێکدا کە دایکم لێرە بووە، چیمان گوتووە و چیمان بڕیارداوە.

لە وەڵامی پرسیارەکانی "ئەبدولکەدا" دا پێم گوت: "هیچ شتێ لە ئارادا نیە" هەر کە ئاوام وەڵامدایەوە بەسەرما روخا، بە تووڕەییەوە گوتی: "تۆ جێگای بڕوانی."

من ئەوەم دەزانی کە پێویست ناکا دەمە دەمێی لەگەڵدا بکەم، دڵنیا بووم لەوەی کە ئێمە لەم وڵاتە دەرباز دەبین. لەگەڵ ئەوەشدا خۆم بۆ ڕانەگیرا، پێم گوت: "من لێرە نامێنم بۆ وڵاتی خۆم دەگەڕێمەوە." هەر کە گوێی لەمە بوو، بەبێ راوەستان بە دەموچاومدا کێشای و گوتی: "خوا بتکا بە قوربانی سکەکەت، دەنا دەمزانی چۆن بیرازێکم دەکردی" بە تووڕەییەوە گوتی: "ئەگەر دایکت دەیەوێ بتباتەوە، هەروەك چۆن ئێمە بە دراو تۆمان کڕیوە، پێویستە دایکیشت ئەو دراوەمان بۆ بگەڕێنێتەوە، ئەوە یاسای ئەم وڵاتەی ئێمەیە." بایەخم بە وتەکانی نەدا، بەڵام ئەوان لە هەڕەشەو چەنەبازی خۆیان نەدەکەوتن.

کاتی منداڵ بوونەکەم نزیك بۆوە، من ئەوەم دەزانی کە "ئەبدولکەدا" ڕێگام پێنادا بۆ "ئنگلاند" بگەڕێمەوە و لەوێ منداڵەکەم ببێ. بە تایبەتی پاش ئەو

سەردانەی دایکم بە تەواوی "ئەبدولکەدا" بڕوای پێم نەمابوو و باوەڕی پێ نەدەکردم. من لەبەردەم ئەو ترسە مەزنەی منداڵ بووندا مامەوە، کە دەبێ، منداڵەکەم لە ناو ئەم گوندەدا ببێت هەروەك چۆن "نادیا" و "بەکالە" منداڵەکانیان بوو.

دوو ڕۆژ پاش ئەوە، "سەراوی منداڵبوون" چۆڕایە خوارەوە، ئەو کاتە بە تەنیا لە ماڵەوە بووم، ترس دایگرتم، جلەکانم گۆڕی و ئاوەڵکراسی تازەم لە پێکرد، جلوبەرگەکانم برد لە بانیژگەکە شتمن. وردە وردە پشتم دایە ئازار، ئەو ئاوەڵکراسە خاوێنەی کە تۆزێك لەوەوبەر لە پێم کردبوو، ئەویش تەڕ بوو. من لە بارەی ئەو ئاو چۆڕانەوە هیچم نەدەزانی، کەچی بکەم و چی روودەدا. بەڵام ئەوەم دەزانی کە تانکیەکانی سەربان پێویستیان بە پڕکردنەوەی ئاو هەیە و ئاومان پێویستە. لەبەر ئەوە بۆ سەر بیرەکە چووم بۆ ئاو کێشان. کاتێ کە گۆزە ئاوەکەم بەسەر سەرەوە بوو، هەستم بە ئازارێکی زۆر کرد، ناچار بەرەو بانیژگەکە چووم، تۆزێك پشوو بدەم.

"وەردە" هاتە سەرەوە، کە زانی بەتەنیا دانیشتووم، پرسیاری ئەوەی کرد کە چی روویداوە، منیش بەسەرهاتەکەم بۆ گێڕایەوە و باسی ئاو دادانەکەم بۆ کرد. ئەویش بانگی "ئەبدولکەدا" ی کرد، بە هەردووکیان پەلیان گرتم و بردیانمە ژوورەکەی خۆم. ترسێکی زۆر دایگرتبووم، دەبێ چی رووبدا..؟ هەر چەندە ئازارەکەم ئەوەندە نەبوو، ئەگەر پیاو بەراوردی بکا بەو ئازارەی کە لە ماوەی ئەو چەند ساڵەدا لە "یەمەن" چێشتبووم.

ئازار لەگەڵ پێچ هێدی هێدی پترتر دەبوون، لە بێدەسەڵاتیدا دەگریام. "سەیدە" ی دایکی "ئەبدولکەدا" ش هاتە ژوورەکەم، بۆ ئەوەی نەختێ هێمنم کاتەوە، "وەردە" ش لە ژوورەکەی لای من بوو، وەك ماخۆلان بە ژوورەکەدا هاتوچۆم دەکرد و جێگام بە خۆم نەدەگرت. کاژمێر نزیکەی دەی شەو بوو، پێویست بوو چرا نەوتیەکە داگیرسێنین، لە نیوەی شەودا بە تەواوی پەکم کەوت، نەمتوانی هاتوچۆ بکەم، لەسەر زەوی ژوورەکە یەکتەختە لێی پاڵکەوتم، کاژمێر دووی سەرلەبەیانی، ژانەکەم بە تەواوی بە سۆ بوو. "وەردە" بێخەم لێی خەوت بوو. "وەردە" م لە خەو هەستان پێم گوت:"منداڵەکە بەرێوەیە." ئەو ئاوا وەڵامی دامەوە:"کچێ نابێ ئەوەندە شێت

نەبی...؟ منداڵەکە پاش رۆژێکی تـر دەبـێ، بەسـە ئـەوەندە شـەڕە دەنـووك مەکـە."مـن دەمزانی، هەسـتم بـە گیـانی خـۆم دەکـرد، کـە "وەردە" راسـت ناکـا. بـەڵام مـن درێـژەم پێنەدا، هەوڵمدا کە خـۆم چـارەی خـۆم بکـەم، پـانتۆڵ و ئاوەڵکراسـەکەم داکـەند، هـێزم دایە بەر خۆم. کە "وەردە" گوێی لە هاوار و هەناسە برکێکەم بوو، زانی کە بەڕاسـتمە. ئیتر ئەویش بەڕاست وەریگـرت. لـە خـەو هەسـتا و بـە ژوورەکـەدا دەسـتی بـە هـاتوچۆ دەکـرد، جارجـارە هـەردوو لنگمـی دەگـرت و سـەیرێکی زایینگـەمی دەکـرد، تـا بزانـێ گەیشـتوومەتە کوێ و چـی روویـداوە. "سـەیدە" گوریسـێکی لـە پەنجەرەکـە بەسـت، سـەرەکەی تـری دایـە دەسـتم، لەبـەر ئـازار هـەردوو لنگـم جـووت دەکـردن، "وەردە" بەسەرمدا زریکاندی و لێم تووڕە بوو."ناوگەڵ بکەرەوە."

کاتێك کە سەری منداڵەکە هاتـە دەرەوە، ئـازار لـە کەڵەموسـتی پێمـەوە تـا تـەپڵی سـەرمی گرتـەوە. "وەردە" خـەریکی منداڵەکـە بـوو، لەبـەر خۆیـەوە گوتـی:"منداڵێکـی جوانیکەلە دیارە." منیش چاوەڕێی ئەوە بووم، "وەردە" دەریهێنێ و ناوکەکـەی بـبڕێت و بیداتە دەستم، هەروەك چۆن ئەو کـارەی لەگـەڵ "بەکالـە" دا کـرد. بـەڵام هیـچ دیـار نەبوو دەستی لەناو گەڵ و زاینگەمدا خنەی دەهـات، نـەمدەزانی چـی دەکـا. ئـەو بـانگی "ئەبدولکەدا" ی کرد، داوای لایتێکی کرد کـە بـۆی بێنـێ و بـۆی بگـرێ، تـاکو بـە باشـی چاوی لێبێ، کە چی دەکا. لەبەر ئـەوەی چـرا نەوتیەکـە رووناکـایی کـەم بـوو بـە باشـی نەیدەبینی و کارەکەی بۆ نەدەکرا.

هاوارم لێهەستا و گوتم:"ئەوە چی دەکەی...؟"

"وەردە" وەڵامی دامەوە گوتی:"پشتێنەی ناوکەکەی" لـە ملیـەوە ئـاڵاوە، خـەریکم لـە ملـی دەردێنـم."چـەند چرکەیـەکی بـرد، نـاوکی منداڵەکـەی بـڕی و پاشـان بـەرزی کردەوە، منداڵەکە دەستی بە گریان کرد. "وەردە" گوتی:"کوڕە، کوڕ."

"ئەبدولکەدا" بەو هەواڵە زۆر خەنی بوو، بە پێکەنینـەوە گوتـی:" ئـەئاوا، ئێسـتا ئێمە خاوەنی منداڵی خۆمانین." من دەمزانی تەنیا مەبەسـتی ئـەو پیـاوە لـەو گوتەیـە ئازاردانی من بوو. بە پێکەنینەوە درێژەی پێدا، گوتـی:"ئێسـتا دەتوانـی بـۆ "ئنگلانـد" بگەڕێیتەوە." ئەو پیاوە تا ئەو دەمەش مەبەستی پاك نەبوو، نیازی نەبوو کە رەوانـەم

بکاتەوە. ئەگەر دەمزانی کە ئەو راست دەبێژێ بۆ "ئینگلاند" بگەڕێمەوە، یەك و دووم لە گەڕانەوەم نەدەکرد.

"وەردە" لەسەر زەویەکە جاجمێکی دا بەسەر لەشمدا، نەمدەتوانی خۆم ببزوێنم، لەبەر ئەوەی "هاوەڵ منداڵ" ەکە "وێلاش" نەهاتبووە دەرێ. من لەو بارەیەوە هیچم نەدەزانی. دنیا بووبە کازیوە، "وەردە" داوای لێکردم نەختێ خۆم وەچەرخێنم، پاشان پەتێکی بەست بە پاشماوەی پشتێنەی ناوکەکەوە، تا ئەو دەمەش نە هاتبووە دەرەوە، سەرێکی پەتەکەشی بەست بە ڕانمەوە، دوایی بەوەم زانی، ئەو پەتەیان بۆ ئەوە لە پشتێنەی ناوکەکە بەست، بۆ ئەوەی کە جارێکی تر ئەو پشتێنەیە نەچێتەوە ناوەوە، دەنا"هاوەڵ منداڵ" ەکە نایەتە دەرەوە.

بە هەموویان بەرزیان کردمەوە و لەسەر پێ رایان وەستاندم، بۆ ئەوەی کە "هاوەڵ منداڵ" ەکە راکێشێتە دەرەوە، هەموو جومگەکانی لەشم دەیانزریکاند و سەرم گێژی دەخوارد، لەناکاودا بەلادا کەوتم. بەڵام جارێکی تریش زۆریان لێکردم بە پێوە رایان وەستاندمەوە. لە کۆتاییدا توانام لەبەر بڕا، نەمتوانی چیدی بەسەر پێوە خۆ بگرم، یەکتەختە لەسەر زەوی لێیڕاکشام. "وەردە" بە پرتاو بەرەو ناو گوند بەڕێکەوت و چووە خوارێ، ژنێکی لە ناو گوندەوە هێنا کە یارمەتیم بدا و "هاوەڵ منداڵ" ەکە دەرهێنێ، ئەو کاتەش "ئامینە و خەولە" هاتنە سەرەوە یارمەتیم بدەن.

دوای ئەوەی کە ژنەکە هات، ئەویش داوای لێکردم کە بە پێوە راوەستم، بە هەموو هێزی دەستی بە گوشینی سکم کرد. زوو زووش پەنجەکانی رەت دەکرد و لە ناوەوە هەوڵی ئەوەی بوو کە "هاوەڵ منداڵ" کە راکێشێتە دەرەوە، کاتێك کە پەنجەکانی لە ناوەوە دەگێڕا، لەبەر ئازار خەریك بوو گیانم دەرچێ، ئەم ئازارە لە ئازاری منداڵ بوونەکە ناخۆشتر بوو، ئەو ژنە لەوە سەرسام بوو کە بۆچی ئەو "هاوەڵ منداڵ"ە نایەتە دەرەوە، منیش لە ترساندا زراوم چوو بوو. ئەم بەزمە نیو کاژێرێکی برد، لە ئەنجامدا خۆشبەختانە "هاوەڵ منداڵ" ەکە هاتە دەرەوە. بە هاتنە دەرەوەی "هاوەڵ منداڵ" ەکە تەواو لەشم سووك بوو، هەستم کرد ئێستا پاك بوومەتەوە. پاش ئەوە ئەو ژنە، من و منداڵەکەی شت. "ئەبدولکەدا" ش خواردنی بۆ دروستکردم و بۆی هێنام،

بەڵام توانای نانخواردنم نەبوو، خەو دایگرتم، هۆشم لێبڕا، خەوتم ئاگام لە هیچ نەما. تا ئەو دەمە کە "وەردە" لە خەو هەڵیساندم، پێی گوتم:"هەستە نەختێ مەمك بە کوڕەکە بدە."هێندە شیر لە مەمکەکانمدا نەبوو کە بیدەمێ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەو شیرەی کە تیایاندا هەبوو دامێ و چۆڕبڕم کرد.

لەو ماوەی چەند رۆژەدا "وەردە" لە بارەی هیچ شتێکەوە یارمەتی نەدام، تەنانەت ناو ژوورەکەشی پاك نەکردەوە و گەسك نەدا. لە ماوەی سێ رۆژدا ژوورەکەم لە تەپوتۆزدا رۆچوو بوو، لەبەر ئەوە ناچار بووم، کە خۆم ئەو کارە بکەم. جگە لەوەش کارەکانی تریش راپەڕێنم. بەخێوکردنی منداڵ لەو گوند و شوێنانەدا کارێکی گەلێك گران و دژوارە، بە تایبەتی کە هیچ پێویستیەکی مۆدێرن و بەخێوکردنی منداڵ نیە. بۆ نموونە لە کاتێکدا کە میزو پیسایی بە خۆیدا دەکا، پێویستە دەستبەجێ بشۆرێ. کاتێ کە منداڵان لەم گوندانەدا کە لە دایك دەبن، پێویستە خواردنی "چاپاتیس" یان بۆ ورد بکەی و بیکەیتە ناو شیرەوە و بیخوسێنی وەك تریت و بیاندەیتێ. جاروبار "ئەبدولکەدا" کە لە "سەئودی" یەوە دەگەڕایەوە، هەندێك خواردنی ناو پاکەت و قوتوی بۆ دەهێنام.

بەخێوکردن و پەروەردە کردنی منداڵ لە هەموو جێگایەکی ئەم جیهانەدا کارێکی گرانە. بەڵام کارەکە هێندەی تر گران دەبێ، کاتێك کە مرۆ بە تەنیا ئەرکی بەخێوکردنی منداڵی دەکەوێتە ئەستۆوە. لە هەمانکاتدا نەبوونی کەلوپەل و پێویستیەکانی منداڵیش کۆڵی پیاو دەکوتێت، ئەوە جگە لەوە کە ئەرکی بەخێوکردنی منداڵ کراوە بە موڵکی ژن. ژن بە تەنیا بەرپرسیاری بەخێوکردنە. ئەوان دەیانویست کوڕەکەم ناوی "مهەمەد" ی بنێن، بەڵام من دەمویست ناوێکی "ئنگلیز" ی بنێم، هەر لەو دەمەوە کە لە دایك بوو و خستیانە ئامێزمەوە، بە "مارکۆس" بانگم کرد. لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەوەم چاك دەزانی کە رۆژێ دێ، کە بەرەو "ئنگلاند" دەگەڕێمەوە، دەبێ ئەوسا بە ناچاری جێیهێڵم، ئەوەم باش دەزانی کە ئەوان بە هیچ جۆرێ ئەو رێگایەم پێنادەن، کە کوڕەکەم بۆ وڵاتی خۆم بەرم، من هەرگیز نەمدەتوانی ئەو منداڵەی خۆم خۆشنەوێ. بەڵام ئەوەم دەزانی کە "مارکۆس" هەرگیز نابێتە کوڕی دایکی خۆی.

# بەشی دوازدە
# ئێمە بە تەواوی لە بیر نەکراین

"مارکۆس" لە 8ی ئاپریلی 1986 لە دایک بوو. لەوە دەچوو ئەو منداڵە هەستی بەوە کردبێ، کە ڕۆژێ دێ بە ناچاری جێی دەهێڵم. هەمیشە دەیویست لە باوەشمدا بێ، گەلێك هۆگرم ببوو. لەبەر ئەوەی لە ماڵەکەدا کەسی تری شك نەدەبرد، تەنیا "وەردە" و ئەو ژن و پیاوە پیرە، لە ماڵەوە بوون، ئەوانیش مەیلێکی وایان بە "مارکۆس" نەدەدا، لەبەر ئەوە هەموو کاتەکان لەگەڵ خۆمدا بوو. من بە هەموو توانایەکمەوە بەخێوم دەکرد و نازم دەکێشا، هەوڵم دەدا دایکێکی باشبم. "مارکۆس" منداڵێکی ژیر بوو زۆر بە کەمی دەگریا، بە تایبەتی ئەو کاتانەی کە لە خۆمەوە نزیك و لە تەکمدا بوو.

هەفتەیەك دوای لە دایك بوونی "مارکۆس" شیری مەمکەکانم وشکیان کرد. "ئەبدولکەدا" لە شاری "تایز"وە لەگەڵ خۆیدا پاکەتە شیری وشکی بۆ دەهێنام. لە سەرەتاوە کە ئەو شیرەم دەدایە، بۆ ماوەی چەند ڕۆژێك تووشی نەخۆشیەکی گران هات، هێڵنجی دەدا و دەڕشایەوە، لە کۆتاییدا لەگەڵ ئەو شیرەدا راهات.

"ئەبدولکەدا" هەر لە یەکەم ساتی لە دایك بوونی "مارکۆس"ەوە، کوڕەزاکەی خۆی خۆشدەویست، هەمیشە لە "سەئودی"ەوە جلوبەرگی بۆ دەناردەوە. ئەو پیاوە وای هەست دەکرد لە کارەکەیدا سەرکەوتنی بە دەست هێناوە. بە لەدایك بوونی ئەو منداڵە ئیتر من دەست و پام بەستراوەتەوە، ئیتر بڕای بڕای بۆ وڵاتەکەم ناگەڕێمەوە. بەڵام من بڕیاری خۆم دابوو، دەبێ هەر بگەڕێمەوە. ئەوەش بۆ من ئاسانتر بوو، کە منداڵەکەم کوڕ بوو. دەمزانی کە کاتێ کە جێی هێڵم ژیانی تاڵوکە نابێ. ئەگەر بێ و

کچ بووایە، دەبووایە هەمیشە لە دڵە راوکەدا بوومایە و بیرم لێبکردایەتەوە کە چارەنووسی چی بەسەر دێ، بە تایبەتی کە خۆم لە نزیکیەوە نەبم و بەرگری لێکەم.

نزیکەی دوای مانگێ کە "مارکۆس" لە دایك بوو، ڕۆژێکیان نامەیەکم لە "ئنگلاند"ەوە بۆ هات لە زەرفێکی گەورەدا بوو، بە گەورەیی لەسەر زەرفەکە نووسرا بوو، "ڕۆژی لە دایك بوونی پیرۆز بێ." یەکسەر زانیم ئەو نامەیە لەلای دایکمەوە هاتووە. پێش ئەوەی کە زەرفەکە بکەمەوە، ناردم بە دوای "نادیا" دا کاتێ کە "نادیا" هات زەرفەکەمان کردەوە دوو "داخوازینامە"ی تێدا بوو، بۆ وەرگرتنی پەساپۆرتی "بەریتانی" پڕیان بکەینەوە. ئێمە نەماندەزانی کە دایکم چ جۆرە پلانێکی هەیە، بەڵام "داخوازینامە" کانمان پڕکردەوە. دایکم لەگەڵ ئەو نامەیەدا زەرفێکی گەورەی نامە نووسینی بۆ ناردبووین، ئێمەش "داخوازینامەکان" و نامەی خۆشمان خستە ناو ئەو زەرفەوە، لەسەر زەرفەکە نووسیمان، "شازدەهەمین ساڵە ڕۆژی لە دایك بوون پیرۆز بێ." نامەکەمان بە ئەدرێسی ماڵی "ئاشیا"ی خوشکم نووسی، ئەم نامەیەمان لە ڕێگای دکتۆرەوە ڕەوانە کرد. کاتێ کە من و "نادیا" خەریکی پڕکردنەوەی "داخوازینامە"کانمان بووین، لە خۆشیاندا پێدەکەنین و دەخەنین. بۆ ئێمە سەرەتای ڕوودانێ بوو.

دایکم لە نامەکەدا بۆی نووسی بووین، هەموو شتێ بە باشی دەڕوا، ئەو "داخوازینامانە"م بۆ ڕەوانە کردن و پڕی بکەنەوە، لەوە دەچێ کە بە ئەنجامێکی باش بگەین. هەروەها دایکم داوای وێنەی خۆمانی لێکردبووین، کە بۆی ڕەوانە کەین، لەبەر ئەوەی پەساپۆرتەکان پێویستە وێنەی لەسەر بێ، دایکم پرسیاری ئەوەی لێکردبووین، "ئایا دەتوانین بۆ شاری "تایز" بچین وێنەی خۆمان بگرین و بۆی ڕەوانە بکەین..؟" نازانم دایکم بە چ بڕوایەکەوە هاتبوو بە مێشکیدا، کە ئێمە دەتوانین بۆ شاری "تایز" بچین..؟ لە کاتێکدا ئەم خێزانانە بۆ چاو تروکانێکیش ئەو بوارەمان پێنادەن بستێ لەم گوندانە دوور کەوینەوە. ئەو کاتانەی کە دایکم خۆی لێرە بوو هەموو شتێکی دەزانی، کە چۆن ژیانێك لەم گوندانەدا بەسەر دەبەین.! ئەم داواکردن و بۆچوونانە بەوە دەچوو کە هەر هەوڵ و کۆششێکمان داوە بە فیڕۆ ڕۆیشتووە و هیچ ئەنجامێکی نەبووە.

چەند هەفتەیەك پاش لە دایك بوونی "مارکۆس" "نادیـا" منداڵـی دووەمـی بـوو، ئەمجارەیان وەکو جاری یەکەم بە ئاسانی منداڵەکەی نەببوو. هـەر چـۆن جـاری یەکـەم ئاگاداری لە دایکبوونی منداڵەکەی نەبووم، ئەمجارەش بە هەمان شـێوە ئاگـادار نـەبووم، تا ئەو کاتەی هەموو شتێ تەواو بوو، دوای ئەوە هەواڵم زانی.

بۆ سبەینێ بەیانی زوو بـەرەو گونـدی "ئاسـهوبی" بـۆ لای "نادیـا" بـەرێ کـەوتم. کاتیك گەیشتمە ناو گوند، خۆم کـرد بـە مـاڵی "نادیـا"دا و چوومـە ژوورەوە، منداڵیکـم بینی بە شەش مانگان دەچوو، بسکیکی رەشی دریژ هەر لە یەکەم ساتدا چاوی لە چاوم بری.

پرسیارم لە "نادیا" کرد، "کوا منداڵەکە."

وەڵامی دامەوە: "ئەوەتا."

"نادیا" بەسەرهاتی منداڵ بوونەکەی بۆ گیرامەوە. کە چۆن لە ماوەی سێ رۆژدا، ئـازار دەسـتی پیکـرد. گوتـی: "بـەڵام کـەس بـەرەو گونـدی ئیـوە نـەدەهات، تـاکو ئاگادارتکەم." من وا دەمزانی "نادیا" بۆیە ئەو کارەی نەکردبوو، لەبەر ئـەوەی کـە مـن نائارام نەبم. پاشـان گوتـی: "سـەری سـێیەم رۆژە بـە تـەواوی ژان گرتمـی مـاوەی شـەش کاژێری خایاند، بەڵام منداڵەکە نەدەهاتە پیشێ." دریـژەی پیـدا و گوتـی: "لـەو مـاوەی شـەش کـاژێردا هینـدە ژانم هـەبوو، لەسـەر سـەر دەخولامـەوە. ئـەو ژنانـەی کـە لـیرە خەریکی یارمەتیدانم بوون، گوتیان: "بە دڵنیایەوە ئەم ژنە دەمرێ،" کەسێ لـەو ژنانـە لەو بروایەدا نەبووە کە بتوانم ژیان دەربازکەم. خەم و پەژارە ئەو ژنانەی داگرت بـوو. پاش شەش کاژێرەکە، پیرەژنێ لە ناو گوندەوە هات بۆ یارمەتیدانم. ئەو پیرەژنـە کـاری خەتەنە کردنی کیژە منداڵەکانیشی دەکرد. کـە چـاوی پیـم دەکـەوێ، چـەند نائـارام و پەریشـانم، دەسـتی دایــە گویزانیـك کـە لـە تەنیشـتمەوە کـەوت بـوو. بـەبێ ئـەوەی گویزانەکە بشوات، دەستی کرد بە برینی "کەناڵی دەرچـەی" زایینگـەم، دوای وچـانیکی کەم و پاش هەڵدرینەکە، من و منداڵەکەشی لە مەرگ رزگار کـرد و منداڵەکـەی خسـتە ئامیزمەوە." دوای ئەوە ئەو مامانە بە ژنەکانی تری گوت: "ناچاری بوو، پیویسـت بـوو ئەو کارە بکەم، دەنا ئەم ژنە بەسەر ئەو منداڵەوە گیانی لە دەست دەدا." لـە "نادیـا"م

پرسی، "چۆن ئەو ژنە توانی ئاوا بەو ئازایەتیەوە ئەو کارە بکا، لە کاتیکدا ئەو ژنە نە رشتەی پزیشکی، نە دەرمانسازی خویندووە...؟" پیش ئەوەی کە ئەم ژنە مامانە بەو نەشتەرگەرییە هەستێ، هەندێ لە ژنەکان کە دەزانن کارەکە ترسناکە و "نادیا" بەرەو مردن راپیچ دەبێ، لەو ناوچەیە دکتۆرێ شك دەبەن دەچن بیهینن، کاتێ کە دکتۆرەکە دەهینن، ژنە مامانەکە کارەکەی مەیسەر کردبوو.

ئەو دکتۆرەی یارمەتی من و "نادیا"ی دەدا و نامەمان لە ریگای ئەوەوە بۆ دایکم دەنارد، دەیتوانی بەو کارە هەستێ لە کاتی مندالْ بوونەکەی "نادیا" دا بە هانایەوە بێ. بەلام ژنان ئەوەیان پەسەند نەدەکرد، لەبەر ئەوەی دکتۆری پیاو بۆ کاریکی ئاوا نابیت و ناشیاوە.

ژنیك لە گوندەکەمان هەبوو، ئامۆزای ئەو دکتۆرە پیاوە بوو، بۆی گیرامەوە کە جاریکیان بەسەر مندالْ بوونەوە کەوتە تەنگاسی و نائارامیەوە. لە ئەنجامدا مندالەکە لە ناو سکیدا مرد، ئەو مندالە تەنیا پییەکی دیتە دەرەوە. خەلکی چووبوون بە شوین ئەو دکتۆرەدا، کاتێ کە دکتۆر بە راکردن دەگاتە مالەکە، کار لە کار ترازابوو. دکتۆرەکە بە ئامۆزاکەی خۆی و بە ژنەکانی تری گوتبوو: "بۆچی زووتر نەهاتوون ئاگادارم کەن..؟ ئەگەر لە کاتی خۆیدا بووایە، دەمتوانی ژیانی مندالەکە لە مردن رزگار بکەم." ئەو ژنانەش لە وەلامی ئەو دکتۆرەدا دەلین: "راستیەکەی ئیمە شەرممان دەکرد. کە دکتۆریکی پیاو بۆ ئەو جۆرە کارانە بانگ کەین."

من هەر کاتیك کە دەچووم بۆ لای ئەو دکتۆرە هەندیك پرسیارم لیدەکرد، بەلام ئەو هەمیشە هەولی دەدا بە ریزەوە وەلامی پرسیارەکانم بداتەوە. ئەو دکتۆرە کوریکی زۆر شەرمنۆك بوو، لەگەلْ ئەوەدا رانەهاتبوو لەگەلْ ژنانی ناو گونددا لەو جۆرە گفتوگۆیانە بکا، بە تایبەتی دەربارەی ئەو شتانەی کە پەیوەندیان بە خودی کەسیەوە هەبوو، من پرسیارم لیدەکرد، کە هۆی چیە ژان لە مەمکمدا هەیە.؟ ئەو وەلامی دەدامەوە، هۆی ئەوەیە کە نائارامی.

کچە بچکۆلەکەی "نادیا"، "تینا" لە تەمەنی چوار رۆژیدا خەتەنە کرا. ئەمە بەسەر کیژانەوە دابوونەریتی کۆمەلْ بوو. کورە مندالەکان لە پاش هەفت رۆژی لە

دایك بوونیان خەتەنە دەكران، بەمەرجێ ئەگەر ئەو كورە منداله بە خۆ و تەندروست باش بووایە.

ماوەیەكی زۆری نەبرد، "ماركۆس" نەخۆش كەوت، بە شەو و بە رۆژ ئارامی نەبوو هەر دەگریا. بە بەردەوامی دەرشایەوە و خواردنی نەدەخوارد، نەمدەزانی چی بكەم، دكتۆرەكان دووره دەست بوون، دوو شەو و دوو رۆژی تەواو ئەو منداله زریكاندی، هەمیشە بە باوەشمەوە بوو، كەسیك نەبوو كە مشوور خۆرمان بێ و لایەكمان لیبكاتەوە. شەوانە "وەردە" دەهات و دەستی دەكرد بە بۆلە بۆڵ دەیگوت: "مەهیله بخەوێ، با ماندوو بێ.!" منیش هەر ئەوەندەم پیدەگوت: "لە ژوورەكەم برۆ دەرەوە، ژیانمان هیندەی تر لیتاڵ مەكە. "تەنیا شتێ كە لە دەستم دەهات ئەوە بوو، كە هەمیشە لە باوەشی بگرم و رایژەنم. سات دوای سات ماندوو و لە ژیانی "ماركۆس" دوو دڵ دەبووم.

ماوەی دوو رۆژ خەو نەچووە چاوانم، سەری سییەم رۆژ خۆم بە پیوە نەدەگرت، "ئەبدولنور"ی برای "ئەبدولكەدا" ئەو دەمە لە مالەوە بوو. چووم بۆ لای و بەسەر هاتەكەم بۆ گیرایەوە، داوام لیكرد پیویستە "ماركۆس" بگەیەنمە نەخۆشخانە. پیم گوت: "ئەگەر بیت و یارمەتیم نەدەی، ناچارم ئۆتۆمبیلێ بگرم، بە تەنیا خۆم بیگەیەنمە نەخۆشخانە." لەراستیدا ئەوەم باش دەزانی، كە كەس ناتوانێ سەربەخۆ كاریكی ئاوا بكا، من و "ماركۆس" بگەیەنیتە نەخۆشخانە. سەرەرای ئەوەش پیم گوت: "ئەوە بزانە بە هەر شیوەیە بێ ئەو كارە دەكەم." ئەو پیاوە بە راست شتەكەی وەرگرت، دەیزانی كە من ئەو كارە دەكەم و دەست هەلناگرم. لە ئەنجامدا پەیمانی دامێ كە خۆی لە تەكماندا دێ.

رۆژی داهاتوو بۆ بەیانی زوو، ریگای "تایز" مان گرتە بەر، "ماركۆس" تا ئەو رۆژەش هەر نائارام بوو و دەگریا. كاتێ كە گەیشتینە شار، "ئەبدولنور" نەخۆشخانەی مندالانی دەزانی، یەكسەر بەرەو ئەوێ چووین. كە چووینە ناو نەخۆشخانەكەوە، گویمان لە دەنگی مندالان بوو دەگریان و نووزەیان دەهات. لەسەر كورسیەكان بە ریزە باوكان و دایكان دانیشتبوون بە خۆیان و مندالەكانیانەوە چاوەریی سەرەی چوونە لای

دکتۆریان دەکرد. ئیمەش وەکو ئەوانی تر لەسەر کورسی دانیشتین و چاوەریمان کرد. هەندێ منداڵ بە رووداوی ئۆتۆمۆبیل خویناوی و بریندار بوون، یان بە ئاگر و ئاوی گەرم سووتا بوون. خۆ کەسێ نەبوو بە هانای ئەو منداڵانەوە بێ پیش ئەوەی کە سەرەیان بگەیشتایەتە سەر. من و "مارکۆس" ماوەی چەند کاژیرێ دانیشتین و چاوەروانمان کرد، بەڵام "ئەبدولنور" بە ناو نەخۆشخانەکەدا دەسورایەوە، بە مەبەستی ئەوەی کە یەکێ پەیدا بکا و یارمەتیمان بدا. بە دریژایی ئەو ماوەیە "مارکۆس" لە گریان نەکەوت. من لەو بروایەدا نەبووم کە بتوانین بچینە ژوورەوە و کەسێ هەبێ یارمەتیمان بدا.

لە کۆتاییدا چووینە ژوورەوە بۆ لای دکتۆر و بەسەرهاتەکەم بۆ گیرایەوە. ئەو دکتۆرە لەو بارەیەوە هیچی پێ نەگوتم، تەنیا ئەوە نەبێ کە یەکسەر دەرمانی دامێ و گوتی: "ئەوەی بدەرێ با بیخواتەوە." لەوە پتر هیچ شتیکی ترم لینەبیست. ئەو دکتۆرە کاتی ئەوەی نەبوو،دەیویست بە خیرایی نەخۆشیکی تر بیتە ژوورەوە، بە ناچاری ژوورەکەمان جیهیشت و یەکسەر سواری ئۆتۆمۆبیل بووین بەرەو گوند گەراینەوە.

ئەو دەرمانەی کە دکتۆرەکە بە "مارکۆس"ی دابوو دەرخواردم دا نەختێ ئارامی کردەوە و زریکە و گریانەکەی نەما. بەڵام دوای چاکبوونەوەی لەو نەخۆشیەش هەر منداڵیکی ناتەندروست و کەمخۆر و لاواز و رەنگزەرد بوو. "وەردە" هەمیشە دەیگوت: "مارکۆس، هەر بە باوکی دەچێ، باوکیشی هەمان تەندروستی هەبوو." منیش هەمیشە خەمم بەوە دەخوارد کە "مارکۆس" هەمان دەردی "ئەبدوڵا"ی باوکی هەبیت.

چەند مانگیك پیش ئەوەی کە "تینا"ی کچی "نادیا" لە دایك بیت ئەو دەنگە بڵاو بوو، کە "سەلامە"ی خەسووی "نادیا" بۆ لای "جەواد"ی میردی دەچێ. "جەواد" لە ماوەی دوو سالی رابردوودا بۆ ژنەکەی خەریکی ڤیزە وەرگرتن بوو. تەندروستی باش نەبوو، لەبەر ئەوە پیویستی بەوە بوو بۆ چارەسەری نەخۆشیەکەی بۆ "ئنگلاند" بەریکەوێ. "سەلامە" ئەو سەردانەی بەلاوە گرنگ بوو بیکا. ئەو هەمیشە دەیگوت: "زۆر بیری "جەواد" دەکا و ماوەی چوار سالە نەیبینیوە." ئەوەشی دەگوت: "نامەوێ

"نادیـا" بــه تــەنیا جیــهێلم. هــەر کـــاتیکیش گەیشـــتمە "ئنگلانـــد" و چارەســـەری نەخۆشیەکەم کرا، ئەو دەم بـە زووتریـن کـات دەگەڕیمـەوە. "ئەمـە لـە سـەرەتاوە هـەر دەنگێ بوو، لە ناکاو بوو بە راستی و "سەلامە" ریگای "ئنگلاند"ی گرتەبەر، "جـەواد" نامەیەکی بۆ "نادیا" نووسی بوو، لە نامەکەیدا بە "نادیا" ی گوتبـوو، بـە هیـچ جـۆرێ خەم نەخۆی "سەلامە" بەو زووانە دەگەڕیتـەوە. لەگـەڵ ئەمانەشـدا "نادیـا" سـکی بـە "تینـا" پـڕ بـوو، دەبووایـە چـاوی لـە "هـانی" و دوو منداڵـەکانی "سـەلامە"ش بـێ و خزمەتیان بکا. ئەو دوو منداڵە یەکیکیان تەمەنی چوار ساڵ و ئەویتریان نۆ سـاڵ بـوو. "نادیا" گەلێ بە باشی ئەو منداڵانەی پەروەردە دەکـرد و دەلاوانـدنـەوە، بـەڵام کـاریکی گران و بە ئەرکی کەوتبووە سەرشان. ژنەکانی ناو گوند بە پیی توانا یارمـەتی "نادیـا" یان دەدا، جاروبار چاویان لە منداڵەکان دەبوو. بـەڵام لەگـەڵ ئەمانەشـدا "نادیـا" خـۆی هەموو کارەکانی رادەپەراند. کچە بچکۆلەکەی "سەلامە" کە نـاوی "مـاجیدە" بـوو زۆر ژیکەلە و بیدەنگ بوو، بەڵام کورە تەمەن نـۆ سـالەکە "سیهاب" بەرامبـەر بـە "نادیـا" زۆر نالەبار بوو، هەرگیز بە گویی نەدەکرد. یان هیـچ کاتـێ یارمـەتی "نادیـا"ی نـەدەدا کە ئاگای لـە منداڵـەکان بـێ، هـەرگیز لـە ماڵـەوە تویتکـەی نـەدەگرت، لەگـەڵ ئەوەشـدا شەرانگیز بوو. کاتێ کە "نادیا" بۆلە و خورتـەی بەسـەردا دەکـرد، پـەلاماری "نادیـا"ی دەدا و شوینیکی "نادیا"ی دەگەزی.

ئـەو کاتانـە بـە دلخۆشـیەوە دەمویســت یارمــەتی "نادیــا" بــدەم، بــەڵام "وەردە" کـەمجار ریگـای دەدام، هەمیشـە ریگـە گـرم بـوو، دەیگـوت: "تـۆ فریـای کارەکـانی خــۆت بکەوە."

هەر شتیکم بکردایە کە ئەو بـە دلـی نەبووایـە، بـە نامـە "ئەبدولکـەدا"ی ئاگـادار دەکردەوە. کاتی وا هەبوو ماوەی چەند مانگیك نەمدەتوانی هاتوچۆی "ئاسهوبی" بکەم و سەر لە "نادیا" بدەم. "ئەبدولکەدا" هەمیشە لە نامەکانیدا هەرەشەی بـۆ دەنـاردم و دەیگوت: "نابێ لە فەرمانەکان دەرچی." من هەمیشـە ئـەو ترسـەم لـە دلـدا بـوو، کاتـێ ئەو پیاوە بگەڕیتەوە تووشی لیدان و سزادان دەبم، زۆریش شەرمم دەکرد، خەلکانی تر بەوە بزانن کە ئەو پیاوە لیمدەدا.

تەنیا ئەو کاتانە چاوم بە "نادیا" دەکەوت، کە دەهات و سەردانی دەکردم. لەگەڵ ئەوەشدا "نادیا"ش هاتوچۆی کەم بۆوە، چونکە ئەویش گەلێ کاروباری کەوتبووە سەرشان، بەخێوکردنی چوار منداڵی سەروپیچکەش لەو لاوە بوەستێ. لە کۆتاییدا "ئەبدولکەدا" بە نامەیەکی تر ئاگاداری کردم کە دەتوانم مانگی جارێ سەر لە "نادیا" بدەم. بەو شێوەیەش نەمدەتوانی بە هیچ جۆرێك یارمەتیەکی "نادیا" بدەم. ئێمە هەمیشە کار و ئەرکەکانمان لە کار و ئەرکی خەڵکانی تر جودا و گرانتر بوو، خۆمان لە پلەی ژێر کۆیلەوە دەبینیەوە. تاکو ئەم کاتانەش ژیانمان هیچ گۆڕانکاریەکی بەسەردا نەهاتبوو، هەر وەکو ئەوەی کە دایکیشم بۆ لامان نەهاتبێ و سەردانی نەکردبین. تا ئەو دەمەش دەستەوسان و بەندکراو بووین.

"جەواد" لە بارەی "سەلامە"ی ژنیەوە نامەی بۆ "نادیا" دەنووسی و دەیگوت: " "سەلامە" بەو زووانە بۆ "یەمەن" دەگەڕێتەوە، تۆ و "مهەمەد" و منداڵەکان بۆ "ئنگلاند" وەرن." چەند مانگیکی بەسەردا ڕۆیشت شتەکان هەمووی هەڵگەرایەوە. پاشان بە نامە "نادیا"ی ئاگادار کردەوە، کە "سەلامە" لە "ئنگلاند" دەمێنیتەوە. "نادیا" و منداڵەکانیش دەبێت لە ناو گوندا بمیننەوە. "مهەمەد"ی مێردی "نادیا"ش هەر بە ڕیگەی "یەمەن" و "سەئودی"ەوە لە هاتوچۆدا بوو. "مهەمەد" ساڵیکی خشت لە "سەئودی"ە مایەوە. دوای ئەوە بۆ ماوەی چەند مانگێ بۆ "یەمەن" گەڕایەوە. کاتێ ئەو چەند مانگە لە ماڵەوە بوو، دەستی بەسەر برا بچکۆلەکەیەوە بوو. کە ئەمەش پتر لە هەموو شتەکانی تر بۆ "نادیا" یارمەتییەکی پیویست بوو. پاش ئەو چەند مانگە دیسان "مهەمەد" بۆ "سەئودی" گەڕایەوە.

لە سەرەتادا "نادیا" بڕوای بەو گفتانەی "جەواد" هەبوو، کە گوایا دەتوانێ لەگەڵ منداڵەکانی بۆ "ئنگلاند" بگەڕێتەوە. بەڵام لە دواییدا تیگەیشت کە نیازی "سەلامە و جەواد" چی بووە، تەنیا بۆ مەبەستی خۆیان ئەویان دەسخەرۆ و هەڵخەڵەتاندووە، من دەمزانی کە "جەواد" لە کنەی ئەوەدایە پەساپۆرتی "بەریتانی" بۆ "سەلامە"ی ژنی وەرگرێ. ئەو سەردەمەی کە "جەواد" ئەو پەیمانانەی بە "نادیا" دەدا، ئەو کاتانە بوو کە "سەلامە" لە گوند دەژیا. "سەلامە"ش ئاوا خۆی نیشان دەدا

كه له "نادیا" وه زۆر نزیكه. له دواجاردا مه‌به‌ستی "سه‌لامه"ش ده‌ركه‌وت كه بۆچی به‌و شیوه‌یه هه‌لسوكه‌وتی له‌گه‌ڵ "نادیا" ده‌كرد. له‌به‌ر ئه‌وه "نادیا" به هه‌موو توانایه‌كیه‌وه ركوكینی به‌رامبه‌ر به‌و ژن و میرده په‌یدا كرد بوو.

"نادیا" هه‌میشه گیرفان و كیسه‌كه‌ی سارد و بێ دراو بوو، هه‌ر كاتێ كه یه‌كتریمان ده‌بینی، ده‌ستی به گریان ده‌كرد، ده‌یگوت: "نه میرده‌كه‌ی نه "جه‌واد" دراوی بۆ نانیرن خواردنی پیبكرێ." "نادیا" نه‌یده‌زانی چی بكات و سه‌ر به چ كونیكا بكا. له كۆتاییدا ناچار بوو به گوندا بگه‌رێ و وام (قه‌رز) له‌م و له‌و بكات تاكو بتوانن بژین. من پیم ده‌گوت: "ئه‌و شتانه‌ی كه له دووكانه‌كان ده‌یانكری، به ناوی "جه‌واد" و كوره‌كه‌یه‌وه" وامی بكه، با ئه‌وان باییه‌كه‌ی بده‌ن." به‌لام "نادیا" نه‌یده‌ویست ئه‌وه بكا. به‌لام له كۆتاییدا ناچار بوو، له دووكانه‌كان به وام كه‌لوپه‌ل و خوارده‌مه‌نی به ناوی "جه‌واد"ه‌وه بهینێ، دووكانداره‌كان لاریان له‌وه نه‌بوو، ره‌وشی "نادیا"یان ده‌زانی. پاش ئه‌مانه "نادیا" ناچار بوو، ده‌ست به كاری به‌رگدروون بۆ گوندیه‌كان بكا. به‌و هیوایه‌ی كه له‌و ریگایه‌وه بژیوی خۆیان مه‌یسه‌ر بكا، "نادیا" هینده ئه‌ركی به‌سه‌ردا كه‌وتبوو، ته‌نانه‌ت بۆ چركه‌یه‌كیش پشووی نه‌ده‌دا.

ئه‌و كه‌سانه‌ی كه له گونده‌وه بۆ "سه‌ئودی" ده‌گه‌رانه‌وه هاوریی "مه‌حمه‌د" بوون، گله‌یی‌و گازنده‌یان لیكرد بوو، كه بۆچی به‌و جۆره ژنه‌كه‌ی پشتگوێ خستووه و یارمه‌تی بۆ نانیریته‌وه. له كۆتاییدا "مه‌حمه‌د" ده‌ستی به دراو ناردنه‌وه كرد. له لایه‌كی تریشه‌وه "مه‌حمه‌د"ش هیچی له ده‌ست نه‌ده‌هات، نه‌یده‌توانی زۆر له دایكی بكا كه بگه‌ریته‌وه، یان نه‌یده‌توانی كاریگه‌ری له‌سه‌ر باوكی هه‌بێ، بۆ ئه‌وه‌ی باری شانی "نادیا" سووكتر كا.

"مه‌حمه‌د پیاویكی باشتر و باوكیكی باشتر بوو، وه‌ك له "ئه‌بدولا"ی به‌ناو میردم، كاتێ "ئه‌بدولا" بۆ یه‌كه‌مجار له "سه‌ئودی" گه‌رایه‌وه، كه چاوی به "ماركۆس" كه‌وت، هیچ جۆره كامه‌رانیه‌كی پیشان نه‌دا. له‌وانه‌یه كه ئه‌و كوره‌ش هه‌ستی وا كردبێ، كه له دایك بوونی "ماركۆس" به خواستی خۆی نه‌بووبێ. هه‌ر چۆن منیش به‌و شیوه‌یه هه‌ستم ده‌كرد. "ئه‌بدولا" زۆر به كه‌می ده‌كه‌وته ماله‌وه، هه‌رگیز له‌لای من و

"مارکۆس" نەدەمایەوە و دانەدەنیشت. ئەو هەمیشە دەیویست کاتەکانی خۆی لە دەرەوە بکوژێ. "ئەبدولا" هەلسوکەوتی مندالانە بوو، لەبەر ئەوەنا، کە نەدەکەوتە مالەوە و لەتەکماندا نەبوو. بە پیچەوانەوە ئەو کاتانەی کە لە ئیمەوە دوور بوو، پتر هەستم بە کامەرانی دەکرد. کاتێ کە لە مالیشەوە دەبوو. من گویم پینەدەدا و پشتگویم دەخست، بەلام لەگەلٚ ئەمانەشدا ناچار بووم لەگەلیدا بخەوم لەبەر ئەوەی کە زۆری لیدەکردم سیکسی لەگەلدا بکەم.

"مارکۆس" نزیکەی یەك سالان بوو، کە "ئەهمەد"ی برام لە "مەرایس"ەوە سەردانیکی کوتوپری کردین. ئەمە بۆ یەکەمجار بوو "ئەهمەد" سەردانم بکا، من لە سەرەتای هاتنمدا سەردانی "ئەهمەد" و باپیرەم کرد، ئەو دەمە "نادیا" لە "ئنگلاند" بوو. ئەو رۆژەی کە "ئەهمەد" سەردانی کردم نە "ئەبدولکەدا" نە "ئەبدولا" لە مالەوە نەبوون. لە ژوورەکەی خۆم دانیشتبووم، کە "وەردە" بانگی کردم، کاتێ کە چوومە دەرەوە چاوم بە پیاوێ کەوت، لەگەلٚ "وەردە" راوەستابوو، بەلام نەمناسی ئەو پیاوە کییە.

ئەو پیاوە پیی گوتم: "رۆژباش من "ئەهمەد"ی براتم."

ئەو کاتەی کە چاکوچۆنیم لە تەکیدا کرد، هیچ هەستیکم بەرامبەری نەدەبزوا، بەلام لە ئامیزم گرت، بۆ ئەوەی نیشانی بدەم، کە بە بینینی و بە هاتنی دلشادم. داوام لیکرد کە بچینە ژوورەوە، جانتا و کەلوپەلی لەگەلٚ خۆی نەهینا بوو، تەنیا کراسێ نەبێ، کاتێ کە چووینە ژوورەوە، دانیشتین و کەوتینە پرسیار کردن لە یەکتری، من هەموو بەسەرهاتەکەی خۆمانم بۆ گیرایەوە، ئەو مچورکە بە لەشیدا دەهات. "ئەهمەد" گوتی: "ئەو کاتەی کە بۆ یەکەمجار یەکتریمان بینی بە هیچ جۆرێ لەو بارەیەوە ئاگادار نەبووم دەنا لە لاوە هەولیکم دەدا." پاشان بۆم گیرایەوە کە چەند ژیانیکی چەرمەسەریمان هەیە، ئەویش بە بیستنی ئەو کارەسات و ژیانە کە تووشی بووین، فرمیسکی هەلدەرشت و دەگریا. لە بارەی "لەیلا" شەوە هەندێ شتی بۆ گیرامەوە.

هەروەها بەسەرهاتی خۆیانی گیرایەوە، کاتی خۆی کە باوکم لە "یەمـەن" جییـان دەهیلێ و خۆی بۆ "ئنگلاند" دەگەریتەوە، چۆن ئەو و "لەیلا" پیکڤە دەژیـن و گـەورە دەبن. کاتێ کە "لەیلا" تەمەنی دەگاتە دە ساڵان بە شووی دەدەن. "ئەهمەد" گیرایەوە گوتـی: " "لـەیلا" میردەکـەی خـۆی خۆشدەویست، ماوەیـەکیش لـەلای مـن لـە گونـد مانەوە، پاشان میردەکـەی بـانگکرا بـۆ سـەربازی، لـە شـەریکدا کـوژرا. خـیزانی کورەکـە زۆریان لە "لەیلا" کـرد، کـە دەبـێ شـوو بـە پیـاوێ بکاتـەوە کـە بۆیـان دیـاری کردبـوو. "لەیلا" ئەو پیـاوەی خۆشنەدەویست، ئـەو پیـاوە بەرامبـەر بـە "لـەیلا" زۆر نالـەبار و توندوتیژ بوو، زۆر جاریش لییدەدا. لە کۆتاییدا پەلی "لەیلا"ی گرت و بەرەو "ئەدەن" بردی. ئیستا "لـەیلا" سێ مندالی هەیـە و چوارەمیـان بەریوەیـە." "ئەهمـەد" مـاوەی چەند سالێ "لەیلا"ی نەبینی بوو، بەڵام بـە هـۆی کەسـانی تـرەوە هـەوالی دەزانـێ. لـە دلی خۆمدا دەمگوت: "ئەو دەردەسەریەی کە بەسـەر مـن هـاتووە، بەسـەر "لـەیلا"شـدا هاتووە. لەوانەیە ئەوە میراتی دایکمان بێ بۆمان مابیتەوە."

"ئەهمـەد" گوتـی: "لـە "ئـــەدەن" ئەگــەر ژنــان لــە لایــەن میردەکانیانـــەوە دەستدریژیان بکریتە سەر، بۆیان هەیە میردەکانیان راپیچی دادگا کـەن. "لـەیلا" ئـەو کارەی بەرامبەر بە میردەکەی کرد، دادگا بریاری ئەوەیاندا بەسەر میردەکەیدا، ئەگـەر بیت و خۆی چاك و هەلسوکەوت باش نەکا لەگەڵ ژنەکەیدا، ئەو دەمە ناچاری دەکـەن کە دەست لە "لـەیلا" هـەلگرێ. بـەڵام پـاش ئـەوە میردەکـەی بـەخۆیدا هاتـەوە. ئیسـتا نیوانیان گەلـێ کۆك و ژیانیان بەختەوەرە."

لەو کاتەدا کە پیکڤـە دانیشـتبووین و دەپـەیڤین، "ئەهمـەد" هینـدە مـاندوو بـوو خەوی لیکەوت. لای ئیوارێ لە خەو هەستا، منیش نـانوخواردنم بـۆ دروسـتکرد. پاشـان لە بارەی دایکمەوە دەستمان بە ئاخافتن کرد. ئەو بە هیــچ جـۆرێ دایکمـی نەدەهاتـەوە یاد، هیچ جۆرە وینەیەکی دایکم و خوشك و براکانی لەلا نەبوو، هینـدەی لـەو وینانـەم نیشاندا کە دایکم بۆی هینا بووم. کە هاتینە سەر باوکم "ئەهمەد" بەرامبەر بە باوکم زۆر بـە داخ و خـەمبار بـوو، کـە ئـاوا کارەسـاتی بەسـەر مندالـەکانی خۆیـدا هینـاوە. "ئەهمەد" نامەی لە باوکمەوە پیگەیشت بوو، بەڵام ئـەم وەڵامـی نـەدابۆوە. "ئەهمـەد"

ئەو پرسیارەی لیکردم،" ئایا دەزانم کە بۆچی باوکم بەو شیوەیە منداڵەکانی خۆی بەو دەردە بردووە..؟" بەڵام من هیچ وەڵامم نەبوو، ئەو گوتی: "ئەگەر ئەو سەربازیەم لە کۆڵ ببوایەتەوە ئەم وڵاتەم جیدەهیشت."

من لە "ئەهمەد" بە گومان بووم. لەبەر ئەوە هەر پاش ڕۆشتنەوەی دایکم ئاوا لە ناکاو دەرکەوت، من وای بۆ دەچووم کە "ئەبدولکەدا" و باوکم رایان سپاردبێ کە بیانەوێ ئەوە بزانن ئیمە و دایکم چیمان بریارداوە و چیمان لە ژیر سەردایە. لەبەر ئەو گومانە هەموو شتیکم بۆ نەدەگیرایەوە و باس نەدەکرد. من ئەوەندە مارانگەز بووم، بروام بە هەموو کەس نەدەکرد. ئەوەی کە تەنیا جیگای باوەرم بوو، "نادیا" و دایکم بوو، کە هەموو شتیکیان لەلا بدرکینم.

"ئەهمەد" بۆ ماوەی سێ ڕۆژ لەلای من مایەوە، شتیکی خۆشە کە مرۆڤیکی ئاسایی هاودەمی ناو ماڵ بێ "نادیا"ش هات. بۆ یەکەمجار "ئەهمەد"ی برای بینی، "ئەهمەد" خەریك بوو شیت دەبوو، کە چۆن من و "نادیا" ئەو ژیانە پر لە ئەرکە بەزۆر بە سەرماندا سەپینراوە. ئەو گوتی: "ئەو جۆرە ئەرك و کارەی کە ئیوە دەیکەن، لە هیچ جیگایە باوی نەماوەو کۆنە، لەو بروایەدام کە ئیستا کەس بەو شیوەیەی ئیوە ئەو جۆرە کارانە ناکا. "ئەو لە بارەی باپیرەمانەوە دەدوا. گوتی: "ئەو ڕۆژەم هەر لە یادماوە کە باوکم من و "لەیلا"ی جیهیشت و ئیمەش بە دوای باوکمدا دەمانزریکاند و دەگریاین." هەروەها باسی ئەوەی بۆ کردین کە چۆن باپیرەم ژنی تازەی هیناوەتەوە و چەند منداڵیکی لەو ژنە نوییە بووە. ئەو ژنە بەرامبەر بە "ئەهمەد و لەیلا" تا بڵیی ناهەموار و دلرەش دەبێ.

"ئەهمەد لەو بروایەدا بوو، لەبەر ئەوەی باپیرەم چارەی باوکمی نەدەویست و کینی لیی بوو، ئەوا هەرچی کین و داخی خۆی هەبوو بە "ئەهمەد"ی رشتبوو.

بەڵام من ئەو پیاوە پیرە کۆماوە سەرسپیەم لە ڕۆژگاریکی تردا بینی وام دەزانی کە فریشتەیە.

"ئەهمەد" ماوەی چەند ڕۆژیکیش لای "نادیا"ش مایەوە، بەڵام گوندیەکان لە "ئەهمەد" کەوتنە گومانەوە، کە بۆچی هاتووە و چی لە ژیر سەردایە. ئەوان وای بۆ

دەچوون "ئەهمەد" بۆ ئەوە هاتووە، کە من و "نادیا" دەربازکا. بەڵام من دەمزانی کە "ئەهمەد" لەو رووەوە ناتوانێ هیچ جۆرە یارمەتیەکمان بدا، ئەویش وەکو ئیمە لە وڵاتی "یەمەن"دا دیلیکی بەندکراوە. "ئەبدولکەدا" ئەوەی بیستەوە کە "ئەهمەد" سەردانی کردووین، بەوە نائارام بوو. لەبەر ئەوە نامەی بۆ من و بۆ "ئەهمەد"یش نارد و ئاگاداری کردینەوە، کە بە هیچ کاریك هەڵنەستین.

"ئەهمەد" شەرم گرتبووی کە لە شارەوە خواردن و شتی لەگەڵ خۆیدا نەهینابوو، ئەو سەردەمەش لە لای ئیمە لە گوند میوە دەست نەدەکەوت، ماوەیەکی زۆر بوو نە پرتەقال نە سیوم خواردبوو، "ئەهمەد" پەیمانیدا کە پاش چەند هەفتەیەکی تر سەردانم دەکاتەوە و لەگەڵ خۆیدا میوە دەهینێ. ئەو کاتەی کە "ئەهمەد" لەلای "نادیا" بوو، ژنێ لە گوندەکەی "نادیا"وە هات بۆ ماڵەوە و پیی راگەیاندم کە دایکم جاریکی تر لەگەڵ چەند کەسیکی "ئنگلیز"دا بۆ سەردانمان گەراوەتەوە. بەو هەواڵە دلم خورپەیەکی کرد، "مارکۆس"م هەلگرت و خۆم گەیاندە دەرکی دەرەوە، "وەردە" هاواری لیهەستا: "چی دەکەی...؟"

وەڵامم دایەوە: دەچم بۆ لای خوشکەکەم."

بە روویەکی مۆنەوە گوتی: "نابێ بچی، دەنا چاوت بە خۆت دەکەویتەوە."

پیم گوت: "چی دەکەی بیکە، هەر دەرۆم. "لەگەڵ ژنەکەدا لە چیا هاتینە خوارەوە بەرەو گوندی "نادیا" بچین. کاتی کە گەیشتینە ئەوێ ژن و پیاوێ لەوێ بوون لە "ئنگلاند"ەوە هاتبوون. ئەو دوو کەسە بە گەشتکار دەچوون، کامیرایان پیبوو بەڵام دایکم لە تەکیاندا نەبوو، مالی "نادیا" پر ببوو لە گوندی، دەیانویست بزانن کە چی لە ئارادایە. کاتیك کە زانیم دایکم لە تەکیاندا نیە زۆر دلتەنگ بووم. "نادیا" بەرەو رووم هات و بە گویمدا چرپاندی، "ئەمانە رۆژنامەوانن لە "ئنگلاند"ەوە هاتوون ئیمە لەگەڵ خۆیاندا بەرن."

من وام هەست کرد کە رزگارمان بوو، وای بۆ چووم کە ئەم پیاو و ژنە لە لایەن بەریز "کانتویلس"وە بەرپرسیاری ریکخراوی جنیفەوە هاتبن و ئیمە لە تەك خۆیاندا دەبەن، بە خۆم دەگوت: "ئەوە دەزگای راگەیاندنی "بەریتانیا"یە کە لەوێوە شادیان

کـردم و گیـانم پیدەبەخشن." لـە هـەمانکاتدا بـە خـۆم دەگـوت: "دەربــاز بوونمــان لــە "یەمەن" هۆکەی ئەوە نیە کە لە "ئنگلاند"ەوە دەستی پیکردبێ، بەلکو بەرهەمی ئـەو هەوڵ و تیکۆشانانەیە کە دایکم کردوویەتی. ئیستاش لەوانەیە دایکـم گەیشـتبیتە ئـەو ئەنجامەی کە بە شیوەیەك لە شیوەکان دەربازمان بکا."

# بەشی سیازدە
# ئەرکیکی ترسناك

ژنەکە ناوی "ئیلین ماکدۆنالّ" و رۆژنامەوانی، رۆژنامەیەکی شاری "لەندەن" بوو. پیاوەکەش، ناوی "بین گیبسۆن" وینەگر بوو، ئەم دووانە بەو ئەرکە ترسناکە هەستا بوون. لەگەلّ خۆشیاندا ژنیکی وەرگیریان هینا بوو، ئەم ژنە وەرگیرە بوو ژنە گوندەکان وایان زانی بوو کە دایکمە. هەروەها شۆفیریکیشیان لە تەکدابوو، ئەم پیاوە شۆفیرە ترس بە روویەوە دیار بوو، دەمانچەیەکی بە بەرکەوە بەستبوو. هەندیّ لە پیاوانی گوندەکەش بۆ مالی "نادیا" هاتبوون ئەوانیش تفەنگیان پیبوو.

کاتیك کە گەیشتمە ئەویّ، یەکسەر بەرەو رووی "ئیلین" چووم، لە تەکیدا دەستم بە پەیڤین کرد، پیم گوت،"ئیمە چاوەریی ئیوەمان دەکرد، هاتوون لەتەك خۆتاندا بمانبەن...؟. لەراستیدا من ئاوای بۆ دەچم کە ئیوە هاتوون ئازادمانکەن."ئەو ژنە زۆر لەسەر خۆو هوشیار بوو، پیم گوت:"ئاگات لە شیوەی گفتوگۆ و دەربرینەکان بیّ، زۆربەی ئەم پیاوانەی لیرەن" ئنگلیز"ی دەزانن.

"ئیلین" رووی کردە شۆفیرەکە و گوتی:"لەو بروایەدای کە بتوانین ئەو دووکچە و مندالەکانیان لەگەلّ خۆماندا بە جیپەکە بۆ شاری "تایز" بەرین...؟"

شۆفیرەکە نائارام دیار بوو، ئەم پیاوە ئەوانی بە جیپیکیunicef هینابوو. ئەو وای زانی بوو، کە ئەمانە دکتۆرن و هاوریی دایکمن و گەریدەن، دەیانەویّ سەردانی ئیمە بکەن. لە سەرەتاوە ئەم "ئنگلیز"انە بە شۆفیرەکەیان نەگووتبوو کە رۆژنامەوانن. ئەو جیپە سپیە لە ناو گوندیەکاندا ناسراو بوو، ئەو جیپە زۆر جار دەرمانی دەهینا بۆ ئەو

نەخۆشخانە بچکۆلەیەی کە لە "مۆکبانە" بوو. ئەو کەسانەی کە بەو جیپە هاتوچۆی ئەم ناوچانەیان دەکرد هیچ کاتێ لەلایەن گوندیەکانەوە دەست نەدەهینرایە ریگایان. "ئەهمەد"ی برام هەموو بەسەرهاتی ئیمەی بۆ شۆفیرەکە گیرایەوە. لەو کاتەشدا من و "نادیا" لەگەڵ "ئیلین" خەریکی هەڤپەیڤین بووین. ئەو شۆفیرە دەیخواست یارمەتیمان بدا. بەڵام دەترسا و دلنیا نەبوو کە چارەنووسی بە کوێ دەگات ئەگەر ئەو کارە بکا. "ئیلین و بین" لەسەرەتاوە بە شۆفیرەکەیان گوتبوو، لە مالەوە هەندێ دیاریان بۆ ئەو دوو کچە هیناوە، شۆفیرەکە سەری بادەدا و بە دەنگیکی نزم بە ژنە وەرگیرەکەی دەگوت:"من ناتوانم ئەم دوو کچە لیرە دەرکەم، هەموو ناوچەکە من دەناسن، ئەگەر بیت و ئەو کارە بکەم، پیاوانی ئەم ناوچەیە شوینم دەکەون، تاکو نەمکوژن واز ناهینن. ئەم خەلکانە هەموویان دەزانن کە من لە نەخۆشخانەی "تایز" کاردەکەم. بۆ ئەوان گەلی ئاسانە کە بمدۆزنەوە، داوای ئەم "ئنگلیز"انە بە مانای کوشتنی هەموومان دێ ئەگەر ئەو کچانە بەو شیوەیە لەگەڵ خۆمان بەرین. ئەم گوندیانە هەرگیز ئەو ریگایەمان پینادەن و بە ئاسانی لەم کیوانە دەستبەردارمان ئەکەن و رزگارمان نابێ."

پیاوەکان کەوتنە هەرەشەو گورەشە. هەندیکیان دەستی هەرەشەیان بەرز دەکردەوە، شۆفیرەکە دەستی لەسەر دەمانچەکەی دانا بوو، وەرگیرەکە بە "ئیلین و بین"ی گوت، پیاوەکان شیتگیر بوون و خەریکە رەوشەکە تالوکە دەبێ و کار لە کار دەترازێ. ژنە وەرگیرەکە هەندێ "گات"ی لەگەڵ خۆی هینا بوو، "ئیلین" پیشنیازی کرد، ئەو "گات" ەی کە لەگەڵ خۆیدا هیناویتی بە ناو پیاوەکاندا بیگیرێ و فەرموو لە هەموویان بکا "ئیلین" زوو ئاوی بە ئاگرەکەدا کرد، "گات"ەکەیان بە ناو پیاوەکاندا گیرا، پیاوەکان کەوتنە جووینی "گات" و هیمن بوونەوە.

"ئیلین" پرسیاری لە من کرد:"ئایا شوینێ هەیە کە بە تەنیا دانیشین و نەختێ پیکڤە بپەیڤین...؟"

وەڵامم دایەوە:"وەرە لەگەلم با برۆین." من و "نادیا،ئیلین و بین" لە ژوورەوە هاتینە دەرێ و لەسەر کلکەی چیاکە لە پشت خانوویەکی تــرەوە دانیشتین. کەس نەیدەتوانی گویی لە هەڤپەیڤینمان بێ.

من بە "ئیلین و بین" م گوت:"وامدەزانی کە ئیمە لە بیر کراوین، ئیمە لە ماوەی هەفت سالدا هەر چاوەریی ئەوە بووین کە ئیوە رزگارمان کەن."

"ئیلین" زۆر بەتەنگ رزگار بوونمانەوە بوو، بەو ژیانەی ئیمە نائارام بوو، کە گیرۆدەی ببووین. لەراستیا "ئیلین" ژنیکی جەربەزە بوو، کە توانی بووی ئەو ریگا دوورە ببرێ و ئیمە بدۆزیتەوە."

ئیلین گوتی:"بەداخەوە، لەو بروایەدا نیم کە ئەمە کاریکی ئاسان بێ، مەبەست لەم سەردانەمان تەنیا ئەوە بوو کە چاومان پیتان بکەوێ و لەگەلتاندا بدویین، دەنا نەهاتووین بۆ ئەوەی لەگەلْ خۆمانتان بەرین و دەربازتان کەین. لەبەر ئەوە پیم وایە، کە دەبێ بە زووترین کات بگەریینەوە و یارمەتی فەرمی (رەسمی) پەیدا بکەین."

"ئیلین" بۆی گیرامەوە، ئەو کەسانەی کە لە شاری "تایز" بینیویانن، راویژی ئەوەیان کردوون کە بۆ ناو ئەو گوندە چیانیشینانەی "مۆکبانە" نەچن، ئەو کەسانە پییان گوتبوون، خەلکانی ئەو کیوانە ئەو کەسە بیانیانە دەکوژن کە بەو ناوچانەدا دەسوورینەوە و سنووری ئەوان دەشکینن. هەروەها ئەوەیان پیگوتبوون، چەند سالێ لەمەوبەر سەر ژمیری سەرانسەری لە "یەمەن" دا کرا، بەلاّم ئەو کەسانەی کە بۆ ئەو مەبەستە چووبوون بۆ ئەو ناوچە چیایانە، هەموویان سەرەونگون کران، کەس ئەوانی نەبینیەوە. "ئیلین و بین" ئەوەیان پیگوترا بوو، هیچ کەسێ بە زیندوویەتی ناگاتە ئەو ناوچە چیاییانە، بە تفەنگ دەیکوژن، ئەگەر چی مەبەستی ئەو کەسانە تەنیا بینینی ئەو ناوچانەش بێ.

"ئیلین" دەیگوت:"زۆر گرانە کەسێ لەم ناوچانە بدۆزیتەوە و بزانی ئەو گوندەی کە لیی دەژی کەوتۆتە کویوە. لە هەمانکاتدا دەبێ ئەو ریگا ناخۆش و نالەبارەش ببری."هەرچەندە ئەوان بە جیپی "لاندرۆڤیر" هاتبوون، بەلاّم لەبەر کەندوکۆسپ و

نالەباری ڕیگاکە، شۆفیرەکە نەیتوانی بوو(دە) کیلۆمەتر لە کاژیریکدا خیراتر جیپەکە بهاژووێ.

ئەو گوتی:"سروشتی ئەم وڵاتە شتیکی سەیرە و چەند جودا و لەیەك نەچووە، یەکەمجار بە شوینیکی ئاوەدانی و سەوزایی و چەمی پڕ لە ماسیدا تیپەڕین، بەڵام ئەوەندەی نەبرد لە ناوچەیەکی چیایی و وشك و برنگدا خۆمان بینیەوە."

کاتێ ئەوان بەرەو ناوچەی کیوەکان بۆ لای ئیمە بەریوە دەبن، لە ڕیگا تووشی زۆر کەس هاتبوون، کە لە بارەی ئیمەوە دووا بوون. ئەو خەلکانە بە "ئیلین" یان گوتبوو، ئەو دوو کچەمان ناو ناوە،"دوو خوشکە بەستەزمانە بیبەختەکەی "مۆکبانە". لەبەر ئەوەی پیشە و کاری ئەو دوو خوشکە هەر گریانە. ئەو دوو خوشکە دەیانەویت بۆ وڵاتی خۆیان بگەڕینەوە، بەڵام پیاوەکانیان هەرگیز ئەو ڕیگایەیان پینادەن."هەموو کەسیك لەو ناوچانە ئەم چیرۆکەی ئیمەیان دەزانی. کاتیك ئەوان لەگەڵ ئەو گوندیانەدا دووابوون، ئەوانەی کە ئیمەیان ناسیوە، ناونیشانی گوندەکەی "نادیا" و خانووەکەی "نادیا" یان بۆ هەڵ دەدەن کە دەرگاو پەنجەرەکانی خانووەکە بۆیەی زەرد کراوە. هەرچەندە "ئیلین و بین" لەو بڕوایەدا نەبوون کە ئیمە بدۆزنەوە.

بەڵام ئەو گوندیانە ئەوەیان پیدەلین، کە هەرگیز ناشێ بتوانن ئیمە بدۆزنەوە. بەڵام "ئیلین" ورەی بەرنەدا بوو، بڕوای بەوە هەبووە کە دەبێ لەو کارەدا سەربکەوێ. لە کۆتاییدا ئیمەی دۆزیەوە. هەرچەندە لەو سەردانەدا ئەوەی بۆ نەچووە سەر کە لەگەڵ خۆیدا دەربازمان بکا، بەڵام ئەو ڕاستیەی بۆ دەرکەوت بوو کە ئەگەر لەو کارەشدا سەرکەوتوو بووایە، ئەو کاتە پاسەوانەکانی سەر ڕیگا دەیان وەستانین و داوای ناسنامە و رووخسەتیان لیدەکردین. نە من نە "نادیا" ش هیچ جۆرە ناسنامەیەکمان نەبوو. خۆ ئەگەر ئەوەیان بزانیایە کە ئەمانە هاتوون ئیمە ڕزگارکەن، ئەوا بەبێ یەك و دوو بە دلنیاییەوە پیش ئەوەی لە ڕیگای چیا دەرباز ببین و بگەینە ڕیگای گشتی بەرەو شار، دەیانداینە بەر ڕیژنەی گوللە و دەیانکوشتین، "ئیلین" ئەوەی باش دەزانی. دلنیا بوو، ئەو بازگە سەربازیەی کە هیندە لە گوندەکەوە دوور نەبوو لە هاتنی ئەم ڕۆژنامەوانانە ئاگادار کرابوون، کەسیکی بە ئەمەك ئەوەی بە "ئیلین" ڕاگەیاند بوو،

که سەربازەکان لەو کارە ئاگادار کراونەتەوە، دەبێ لەوە دلنیابێ کە ئەو سەربازانە لە پێشدا دەستڕێژتان لێدەکەن پاشان پرسیارتان لێدەکەن.

ئێمە لە گەرمەی ئاخافتندا بووین، ئاگاداری هیچ شتێ نەبووین، کە "جەواد" تەلەفۆنی بۆ سەرۆکی پۆلیسی ئەو ناوچەیە کردووە و ئاگاداری کرد بوو، کە دوو رۆژنامەوانی بیانی بۆ کاری سیخوری هاتوونەتە ناوچەی "مۆکبانە"."جەواد" هەولی ئەوەی دابوو، کە ئاژاوە و نائارامی دروست بکا. سەرۆکی پۆلیس، بە "جەواد" دەلێ:"مەرج بێ لە کارەکە دەکۆلمەوە." "جەواد" داوا دەکا کە هەر ئەو نیوەرۆژە دەستەیە پۆلیس بنێرێ بۆ ناو چیا و ئەو دوو رۆژنامەوانە دەستگیر کەن. بەلام سەرۆکی پۆلیس ئاوا وەلامی "جەواد" دەداتەوە،" ئێستا درەنگە، ئەگەر لای بەیانی بووایە دەمتوانی دەستەیە پۆلیس بنێرم." ئەگەر "جەواد" رۆژێ پێش ئەوە ئاگاداری پۆلیسی بکردایەتەوە. ئەو کاتە "ئیلین و بین" پێیان بە تەلەکەوە دەبوو.

لە "ئنگلاند" رۆژنامەکان لە بارەی ئێمەوە نووسی بوویان، رۆژنامەی "بیرمینگهام پۆست" لەژێر سەردێری (هیوایەکی کەم بۆ یارمەتیدانی دوو خوشکی یەمەنی). راپۆرتێکیش لەسەر کۆبوونەوەی بەریز، "رۆیهاتیرسلی" ئەندامی پەرلەمانی "بەریتانی" لە ناوچەی "بیرمینگهام و بالیۆزی "یەمەن"ی لە "بەریتانیا".

لەناو بێدەنگی ئەو چیا نامۆیانەدا، ئەم بەرەوپێش چوونانە روویاندا، "ئیلین" بە بۆمبای پرسیار دایگرتینەوە، ئەو هەولی دەدا لە بارەی ئێمەوە هەموو شتێ بزانێ و ئاگادار بێ، کە پێش ئەوەی یەکێ بگاتە سەرمان و دانیشتنەکەمان لێتێکدەن. ئەوەی کە لە توانامانداا هەبوو و هاتەوە یادمان بۆ "ئیلین" مان گێرایەوە. "ئیلین" لەگەل خۆیدا نامەیەکی دایکمی هێنا بوو، دایکم ئەوەی بۆ نووسیبووین کە چی کردووە. دەربارەی کاسێتەکەی کە بەدەنگی خۆم تۆمارمکرد بوو، نووسی بووی، کە کاسێتەکە دەستبەجێ لە راپۆرتدا بلاو کراوەتەوە. هەروەها ناردووشیانە بۆ رادیۆ، ئەوانیش بلاویان کردەوە.

ئەوەی کە دایکم بۆی نەنووسی بووم، ئەوە بوو، کە لە پاشاندا زانیم، زۆربەی رۆژنامەکان، وتەکانی ناو کاسێتەکەیان گەلەکیش کرد بوو، بە شێوەی جودا جودا، هەریەکەیان لەژێر ناونیشانێکدا، بۆ نموونە لە رۆژنامەیەکدا لە ژێر ناوی ئەم

سەردیرە.(دوو خوشـك كۆیلـەی سـیكس كـراون) لـەو بارەیـەوە ئـەو رۆژنامەیـە نووسـی بووی كە چۆن ئەم دوو خوشـكە زۆریـان لیكـراوە كـە لـە ژیـر "ئـەبدولا و مهەمـەد" دا پالكەون. دایكم بەو شتە گەلیك نائارام ببوو.

یەكەم پەیوەندی دایكم لـە بـەریتانیا، بـە پیاویكـەوە بـەریز:"ئـالف دیكینـس" وە بـووە. لـە ریگـای ئـەم بـەریزەوە، دایكـم رۆژنامـــەوان"تـۆم كویـرك" ی لـە رۆژنامــەی "بیرمینگهام پۆست" ناسیوە. كاتێ ئەم رۆژنامەوانە گـوێ لـە كاسیتەكە دەگـرێ كـە بـە دەنگی خۆم تۆمارم كردبوو، هەروەها ئەو نامەیەش دەخوینیتەوە كە نووسی بووم، ئەو رۆژنامەوانـە ئـەو شـتانە بـە باشـترین هـەوالّ دەزانـێ كـە تـاكو ئیسـتا رۆژنامەكـەی كارەساتیكی ئاوا زیندوو و بە بەلگەی پینەگەیشتووە و بلاونەكردۆتەوە.

ئـەو رۆژنامەوانـە دەچیتـە لای بـاوكم، بـۆ ئـەوەی باشـتر لـە بەسـەرهاتەكە بگـات، بـاوكم وا وەلام دەداتـەوە، كـە گوایـا ئـەو لـە "ئنگلانـــد" هەلسـوكەوتی ئیمـەی بـە دلّ نەبووە، لەبەر ئەوە ئیمەی بۆ "یەمەن" ناردووە، بۆ ئەوەی كە ئیمە لە بارەی نەریت و كولتـوری "یەمـــەن" و "ئیسـلام"ەوە خۆمـان فیركـەین. مافنـاس و زانكـۆ ناسـەكانی رۆژنامەكـە، هیمـا بـۆ ئـەوە دەكـەن كـە ئـەو پیـاوە كچەكانی فرۆشـتووە. لـە رووپـەری یەكەمی رۆژنامەكەدا ئەوە دەنووسـن، (ئـەو كچانـە بـە شـیوەیەكی نـەهینی و پـلان بـۆ كراو دیار نەماون.)

یەكـەم رۆژ كـە دەنگوبـاس و سـەردیرەكان لـە رۆژنامـەدا بلاودەكرینـەوە، بـــەریز: "ئالف دیكینس" و دایكم میزگریەكی رۆژنامەگەری دەبەستن، ئەو رۆژنامەوانانـەی كـە دەچن بۆ ئەوێ، بروا بە دایكم ناكەن. بـەلام "تـۆم كویـك" و "ئیلـین" توانیبوویـان لـە بنی دەهۆلەكە بدەن و چیرۆكەكە شی بكەنەوە.

ئەو كاتانەی كە "ئیلین و بین" هاتن بۆ لامان، لەو بروایەدا نەبووم كە ئەوان ئاوا بە كەساسی جیمان هیلن و دەسـبەردارمان دەبـن، بۆیـە سـوور بـووم لەسـەر ئـەوەی كـە ئیمەش لەگەلیاندا بچین. بە "ئیلین"م گوت: باشە ناتوانن بەم پیاوانـە بلیـن:"ئـەم دوو كچـە دایكیـان هـاتووە و ئیسـتا لـە شـاری "توزلـە" لـە نەخۆشـخانە كـەوتووە، خـۆی

نەیتوانیوە بۆ ئەم ناوچانە بێ، لەبەر ئــەوە ئیمـەی نـاردووە، دەیـەوێ کچەکانی ببینـێ پێش ئەوەی کە بمرێ...؟"

هەرچەندە ئیمە لەو رەوشە لێك دابراو و ناخۆشەدا بووین، لەو هەسـتە دەروونـی و ئازارەدا، هەستم دەکرد کە بەشـیوەیەك دەتوانـین ئـەم وڵاتـە جیـهیلین، لەبـەر ئـەوە بریارماندا کە هەر بـەردەوام بـین و کۆڵنـەدەین لـە رزگاربوونمـان. وردە وردە پیاوەکـان هاتنە دەرەوە و لە چواردەوری ئیمە کۆبوونەوە و گوییان لیدەگرتـین، مـن و "نادیـا"ش پیما ن راگەیاندن کە ئیستا دایکمان نەخۆشە و لە نەخۆشخانە کەوتووە.

یـەکێ لـە پیاوەکـان کـە لـە هـەموویان بـە تەمـەنتر بـوو، چەناگــەی هەڵتــەکاند و گوتــی:"پیــش هــەموو شــتێ پیــاوێ بــۆ نەخۆشــخانەی "تــایز" دەنــیرین، بزانــین نەخۆشیەکەی دایکت چیە، ئەگەر ئەوە راست بوو، ئەوا ئەو پیاوە دەگەریتەوە و لەگەڵ خۆیدا دەتانبا، بەو شیوەیە دەتوانن سەر لە دایکتان بدەن."

ئیمە دەبوو بە خیرایی بیر بکەینەوە و پلان داریژیــن. بـە "ئیلـین" م گوت:"ئایـا بەریوەبەرانی رۆژنامەکەتان ناتوانن کـاریکی وا بکـەن دایکـم بـۆ نەخۆشـخانەی "تـایز" بگەیەنن..؟" هەر چەندە دەمزانی، کە ئەوە کاریکی سانا نیە. پاشان "ئەهمەد"یش بـە خۆی و کۆمەڵێ بیری شیتانەوە پیشنیازی ئەوەی کرد، کە گوایا ئەو دەتوانێ بگەریتەوە و کۆمـەڵێ لـە هـاورێ سـەربازەکانی بـە چەکەکانیانـەوە بـهینێ و بیکـا بـە شـەرە تەقــە لەگەڵ ئەم پیاوانەدا، ئەو کاتە دەتوانین ریگای خۆمان بگرینە بەر و بۆی دەرچین. مــن دەمزانی کە کاریکی لەو جۆرە ناکرێ، بەڵام هیوادار بووم کە شـتیکی لـەو بابەتـە رووی بدایە. من هەستم دەکرد، کە ئیمە لیرە گیرمان خواردووە و دەرباز بوونمان ئاسان نیە. ئەو کەسانەی کـە هـاتبوون بـە هاوارمانـەوە بـە تـەنیا بـەبێ ئیمـە گەرانـەوە. "ئیلـین" بەلینی دامێ هەر کە گەیشتە شاری "سەنئا" بــەرەو بالیۆزخانـەی "بـەریتانی" دەچـێ. ئـەو پـەیمانی ئـەوەی داینـێ بـە زووترین کـات یارمـەتیمان دەدا، بـەڵام ئیمـەش لــەلای خۆمانەوە پیویستە ئارام و دان بە خۆماندا بگرین.

منیش دەستبەجێ وەڵامم دایەوە: "چۆن هەست دەکەی..؟ ئیمە ماوەی چوار سالە ئارام و دانمان بە خۆماندا گرتووە. لەو بارەیەوە خاتر جەمبن."

"ئیلین" گوتی: "خەمتان نەبیت و گوێ مەدەنێ. هەمووی چەند هەفتەیە دەبا، لەم وڵاتە دەردەچن و دەگەڕینەوە".

کابرای وەرگیر چرپانی بە گویمدا.هیندە لەبەردەمی ئەم پیاوانەدا لە بارەی جیهیشتنی ئەم وڵاتەوە مەدوێ با شیتگیر نەبن. ئەگەر ئیوە ئەم وتانە لەبەردەمی ئەمانەدا بلین، لەوانەیە لەم گوندانە بتانگویزنەوە بۆ شوین و جیگایەکی نادیار، ئەو کاتەش کەس دەستی پیاتاندا ناگا و نادۆزرینەوە".

منیش بە توورەییەوە گوتم: "ئیمە ناتوانین لەوە بیدەنگ بین کە دەمانەوێ ئەم وڵاتە جیهیلین، ئەوە تەنیا شتیکە کە ئیمە لە بارەیەوە بدویین و خەوی پیوە دەبینین. ئەوە ئاواتیکمانە دووبارە و چەند بارەی دەکەینەوە، ئیمە بەو ئاواتەوە دەژین، ئیمە نامانەویت لەم وڵاتە شیت و کەللەیی بژین".

کاتیك کە "ئیلین و بین" گوندیان جیهیشت، خەلکی گوند هەموویان لەوێ بوون، منداڵانی گوندەکە لە پیشەوە، "ئیلین و بین"ش لە دواوە بەسەر خرکە بەردەکاندا بەرەو جیپەکە دەچوون. بە رۆیشتنی ئەوان، من و "نادیا" دەستمان بە گریان کرد. ئەو چەند کاژیرە کە پیکەوە بووین، نەمانزانی کە چۆن ئاوا بە زوویی ئەو کاتەمان لیرۆیشت.

پاش ئەوەی کە ئەوان رۆیشتن دوای ماوەیەك دوور و دریژ زانیم کە لە ریگا دووجار "ئیلین و بین" وەستینراون لە لایەن چەند پیاویکی چەکدارەوە، کە دەیانەویت بزانن لەو ناوچەیە چیان کردووە، هەروەها ناو جیپەکەشیان پشکنی بوو، بە دوای شتدا گەرابوون، نەکا ئەم رۆژنامەوانانە ئیمەیان لە ناو جیپەکەدا شاردبیتەوە و بیانەوێ دەربازمان کەن. کاتێ کە "ئیلین و بین" ئەو سەردانەی ئیمەیان کرد دوو دلی ناوێ کە ژیانیان لە مەترسیدا بوو. "ئیلین" بۆ ئیمە وەك فریشتەیەك وابوو کە لە ئاسمانەوە هاتبێ، هەرچەندە کە نەمانتوانی لە تەکیاندا برۆین، بەڵام هەستمان بە گەشبینی و پاشەرۆژیکی رووناك دەکرد، لەراستیدا وا هەستمان دەکرد کە درەختی چانسمان چرۆی کردووە.

پاش ئـەوە "ئەهمـەد" بـەرەو شـاری "تـایز" گەرایـەوە، لـەوێ "هیلـین و بیـن" ی بینی بوو، چووبوون بۆ لای بەریوەبەری نەخۆشخانە، ئـەو بەریوەبـەرەی کـە شـۆفیر و جیپەکـەی لـە تـەکیاندا نـاردبوو، ئـەو پیـاوە پـەیوەندی بـە "موهسین ئەلیوسـف" ەوە "پاریزگار"ی شاری "تایز"ەوە کردبوو، بەلام "پاریزگار" بۆ پایتەخت چووبوو. تا ئـەو دەمەش کـە "ئیلین و بین" گەرابوونەوە بۆ "تایز"، ئەو پیاوە هیشتا نەگەرابۆوە.

بەریوبـەری نەخۆشـخانەی "توزلـە" پیـی گوتبـوون:"مـن پـەیمانتان دەدەمـێ هـەر کاتێ پاریزگار هاتەوە، ئەو دەمە کچەکان بهیننە ئیرە و پرسیاریان لیکەن." ئەو پیـاوە بە گوتـەکانی دریـژە دەدا و دەلـێ :" ئەگـەر "پاریزگـار" ی شـار بخـوازێ، لـە ماوەیـەکی کەمدا ئەو کچانە بە دایکیان شاد دەبنەوە، خـۆ ئەگـەر بخـوازێ گـوێ لـە پیاوەکانیشـیان بگرێ، دەتوانێ بەزووترین کات لە "سەئودی"ەوە گالیان بکاتەوە بۆ شاری "تایز" و بـە دادگایـان بـدا ئـەو دەمـە پیویسـتە کچـەکان داوای جیابوونــەوە کـەن، بــەلام ئەمــەیان دراویکـی زۆر و کـاتیکی زۆر دەخـوازێ، لەوانەیـە پینـج سـالێ بخایـەنێ. هــەموو یــەکێ بەرتیلی دەوێ، تەنانەت بۆ ئەو سەربازانەش کە دەبێ بچنە "مۆکبانـە" و کورەکـان بـۆ بەردەمی دادگا بینن. پاش ئەم وتوویـژە، "ئیلـین و بیـن" بـە سـواری فرۆکـە بـۆ شـاری "سەنئا"هەلدەفرن. پیش ئەوەی کە سواری فرۆکە بن و هەلفرن، پەیوەندی بـە "جیـم هـالیی" کۆنسـۆلی نویـی بالیۆزخانـەی "بــەریتانی"ەوە دەکـەن. لــە ســەرەتاوە کــە بــۆ "یەمەن" یش هاتبوون، "جیم" یارمەتی دابوون. ئەو کۆنسۆلە خـۆی دەچـێ بـۆ فرگـە بۆ پیشوازی کردنیان. کاتێ کە لــە فرۆکەکـە دادەبـەزن لەتـەك خۆیـدا سـواری جیپیکـی گوللە نەبریان دەکا و بۆ بالیۆزخانەی "بەریتانیا"یان دەبا.

کە دەگەنە بەر دیوارە بەربەستە ئاسنیەکەی بالیۆزخانە، پاسەوانیکی چەکدار لـە دەرگایەکی بچکۆلەوە دیتە دەرێ و دەیانپشکنێ، دوای ئەوە ریگایان پیدەدا و بەرەو نـاو بالیۆزخانە پیچ دەکەنەوە.

"ئیلین"ش بە وینەی من رك ئەسـتوور بـوو بەرامبـەر بـەو مرۆڤانـە. پـاش ئـەوە "ئیلین" لەگەل بالیۆزی "بـەریتانی" لـە بـارەی گـیروگرفتی ئیمـەوە دەدوێ، بـالیۆزیش دەلێ:"پیویستە کە کەسایەتیە "یەمەن" یەکان لە کاروباری دەولەتدا ببینینـەوە و لـەو

بارەیەوە لە تەکیاندا بدوێین. "هیلین وبین" نائارامی ئەوە بوون کە هێزی ئاسایشی دەولەتی بە دوویاندا دەگەڕین. لەبەر ئەوە داوایان لە بالیۆز کرد بوو، کە ئەو شەوە لە بالیۆزخانەدا بمیننەوە. "بین" پێویست بوو ئەو وێنانەی ئێمە کە گرتبووی بگەیەنێتە "بەریتانیا" و بنکەی رۆژنامەکە، راپۆرتەکەی "ئیلین"یش بگەیەنێ، پاش ئەوەی ئەو شەوە لە بالیۆزخانە دەمیننەوە "ئیلین" ئەو شەوە ناخەوێ تاکو راپۆرتەکەی بە تەواوی ئامادە دەکا. بۆ بەیانی زوو "بین" "یەمەن" جێدەهێلێ و دەگەڕێتەوە.

بالیۆز و "کۆنسۆل" وا بەباش دەزانن کە پێش ئەوەی ئەو سەردان و بەسەرهاتە لە رۆژنامەکان لە "ئنگلاند" بلاوبکرێتەوە و بەر دەستی خوێنەران بکەوێ. "ئیلین"یش بە زووترین کات دەبێ "یەمەن" جێبێلێ، ئەوان وا بیردەکەنەوە ئەگەر "هیلین" تا ئەو کاتە لە "یەمەن" بمێنیتەوە، ئەوا زۆر بە ئاسانی لە لایەن کاربەدەستانی دەولەتی "یەمەن" ەوە تووشی کێشە و گیروگرفت و سزای بەندکردن دەبێ، لە کۆتاییدا هەولدەدەن لە شەوی شەممەدا لە فرۆکەیەکدا جێگایە بۆ "ئیلین" پەیداکەن ئەویش "یەمەن" جێبێلێ. بەلێ لە ژمارەی رۆژی یەك شەممەی رۆژنامەکەدا راپۆرتەکە و وێنەکان بلاودەکرێتەوە.

کاتێ "ئیلین" دەگاتە فرگەی "هاسرۆ"لە "لەندەن" لە فرۆکە دادەبەزێ "پاول" ی هاوسەری لە فرگە چاوەروانی دەکا، یەکێ لەو رۆژنامانە لەگەڵ خۆی بۆ "ئیلین" دەهێنێ. راپۆرتەکەی "ئیلین" لە رووپەری یەکەمی رۆژنامەکەدا لەگەڵ وێنەیەك لە وێنەکانی "نادیا و تینا"ی کچی کە لە باوەشیدا دەبێ بلاوکرابۆوە. بەو شێوەیە ئێمە ناسراین و ناومان کەوتە ناو ناوانەوە.

# بەشی چواردە
# بەدەنگەوە هاتن

هەر دوای ئەوەی کە "ئیلین و بین"،"مۆکبانە" یان جیهیشت. سەردانەکەیان کەوتە سەر زمانی خەلکی گوندەکان. ئەم گوندیانە هەموویان لەوە تیگەیشت بوون، کە ئەو دوو کەسە رۆژنامەوان بوون. بەلام بە ناوی سەردان و گەشتکردنەوە، مەبەستی خۆیان پیکا. کاتێ گوندیەکان بەم راستیەیان زانی، ئەوان ولاتی "یەمەن" یان جیهیشت بوو. ئەگەر ئەوان بە دیل بگیرانایە، ئەوە نازانم کە چارەنووسیان چی لیدەهات، ئەگەر لەم کیوانە بمانایەتەوە. بە دلنیاییەوە بەر ریژنەی گوللە دەدران، خۆ ئەگەر لە "تایز" یان لە "سەنئا"ش دەستگیر بکرانایە، لە پیشدا بە سزای زیندانی خەلات دەکران، بە تاوانی ئەوەی کە ویستویانە ئیمە بفرینن. گومان لەوەدا نیە لە کۆتاییدا سزای مەرگ بدرانایە.

ئەو کاتەی کە "ئیلین و بین" ئیمەیان جیهیشت، ئیتر من و "نادیا" لەوە ئاگادار و دلنیا نەبووین، کە ئەوان لە "یەمەن" ماونەتەوە یان نا..؟ ئیمە لەوە دەترساین، کە ئەوان لە "یەمەن" گیریان خواردبێ و دەرباز نەبووبن. تەنانەت ئیمە ئاگاداری ئەوە نەبووین کە لە "تایز" چی روویداوە. لە بارەی "سەنئا" و "لەندەن" یشەوە هیچ هەوالیکمان نەدەزانی. تاکو ئەو کاتە ئاگاداری "ئیلین و بین" بووین کە ئیمەیان جیهیشت، ئیتر پاش ئەوە نەماندەزانی لە ریگا چیان بەسەر هاتووە.

ئیمە بەو شیوەیە بەبێ هەواڵ ماینەوە، تا ئەو دەمەی لە دایکمەوە نامەیەکم بە دەست گەیشت. لە نامەکەدا ئەوەی نووسی بوو، لەو کاتەوەی کە "ئیلین" بۆ ئنگلاند

گەراوەتەوە، بەسەرهاتەکەی ئێوەی لە رۆژنامەدا بڵاو کردۆتەوە و هەموو دنیا پێیان زانیوە. "ئیلین" راپۆرتێکی دەربارەی بینینی ئێوە و دانیشتن و گفتوگۆکانتان بڵاوکردۆتەوە، کە خەلکی تامەزرۆی زانینی ئەو کارەساتەن. لە ژێر کاریگەری ئەو هەواڵانەدا دەسەڵاتدارانی "بەریتانیا" فشاریان بۆ هاتووە، ئیستا ناچارن گوێ بدەنە ئەو بەسەرهاتە و بەدەنگتانەوە بین.

ئیمە لەماوەی هەفت سالدا بە تەنیا لە تاریکیدا دەگریاین، بەلام ئیستا بەسەرهاتەکەمان کەوتە سەر زمانی هەموو کەسێکی ئەم جیهانە و تیشك دەخریتە سەر رووداوەکەمان. لەگەڵ ئەوەشدا لای ئیمە لە "مۆکبانە" هیچ شتێ نەگۆرا بوو، ئەو شتانەی کە روویان دەدا، لە دەمی خەلکیەوە دەمانزانی کە روویانداوە.

ئەو هەواڵانەی کە دایکم دابووی، وەك پەیوەندی کردن بە بەریز، "رۆی هاتیرسلیی" ئەندامی پەرلەمان لە ناوچەی "بیرمینگهام" و "شالیاری ناوخۆ"، بە مەبەستی یارمەتیدانمان. لە سەرەتای هەولەکانی دایکم لەگەڵ "شالیار" دا هیچ شتێکی بەرچاو روویان نەدابوو. بەلام دایکم بۆ جاریکی تریش پەیوەندی بەو ئەندامەی پەرلەمانەوە دەکاتەوە، ئەم جارە ئەو بەریزە گرفت و رووداوەکە دەخاتە بەردەمی رژیم و لەگەڵ شالیاری ناوخۆی "سیر جفری هاو"دا لەو بارەیەوە ئارا دەگۆرنەوە، لە سەرەتای کارەساتەکەمانەوە دەولەتی "بەریتانی" بە هەموو شێوەیەك بیدەنگیان لە شتەکە کرد بوو، بە هیچ شێوەیە نەیاندەویست هەلویست وەرگرن و پەیوەندی "بەریتانی" لەگەڵ "یەمەن"دا ناخۆش بێ. بەلام ئیستا رژیمی "بەریتانی" ناکارێ کە لەو بەسەرهاتە بیدەنگ بێ، پاش ئەوەی کە هەموو جیهان ئەو کارەساتەی ئیمەیان زانی لە ریگای گەواهیدەر و رۆژنامەوان و وینە فۆتۆگرافیەکانەوە. بەلگەی راستی ئەو کارەساتە خرایە پیش چاویان، کە چی بەسەر ئیمەدا هینراوە.

"ئەبدولکەدا" هەرچەندە لە "سەئودی" بوو بەلام لە پیش هەموو کەسێکی ترەوە ئاگاداری رووداوەکان بوو، ئەو لە چاو تروکاندنیکدا زانیاری لە بارەی ئەو شتانەوە وەردەگرت، کە روویان دەدا، لەوە دەچوو کە پیوەندی باشی بە زۆر شوین و کەسانەوە هەبێ و دەستبەجێ ئاگاداری کەنەوە لەو شتانەی کە لە "یەمەن" و

"ئنگلاند" رووده‌ده‌ن. پیاوه "یه‌مه‌ن"یه‌کان به ئاسانی رووداوه‌کان و هه‌واڵه‌کانیان به هه‌موو لایه‌کدا له وڵاتیکه‌وه بۆ وڵاتیکی تر بڵاو ده‌که‌رده‌وه. چونکه ئه‌م پیاوانه هه‌میشه به ریگای هاتوچۆی وڵاتانه‌وه بوون و به هه‌موو لایه‌کدا بڵاو ببوونه‌وه. "ئه‌بدولکه‌دا" له نامه‌یه‌کدا که بۆی ره‌وانه کردم، گوتبووی ئاگاداری ئه‌وه‌یه که رۆژنامه‌وان بۆ لامان هاتوون، به‌ڵام ئه‌و دلنیای کردم، که ئه‌وانه هیچ شتیکیان بۆ ناکریّ. ئه‌وه‌شی نووسی بوو، که ئه‌و خوای له پشته و یارمه‌تیده‌ریه‌تی، هه‌ره‌شه‌ی ئه‌وه‌شی کردبوو، که به کاری نابه‌جیّ هه‌لنه‌ستین. به‌ڵام ئه‌مه بۆ یه‌که‌مجار بوو که له هه‌ره‌شه‌ی "ئه‌بدولکه‌دا" نه‌ترسم و نه‌سله‌میمه‌وه. هینده به خۆمدا راده‌په‌رموو که ئه‌و جۆره هه‌ره‌شانه پشتگویّ بخه‌م. ئه‌و شته‌ی که ته‌نیا بیرم لیده‌کرده‌وه ئازادی بوو، دلنیا بووم که ئه‌مرۆ یان سبه‌ی به‌و ئازادیه ده‌گه‌م.

"ئه‌همه‌د"ی برامان چه‌ند رۆژیك رووخسه‌تی وه‌رگرتبوو، بۆ جاریکی تر هات و سه‌ردانی کردین، به‌ڵام ئه‌مجاره‌یان گوندیه‌کان له لای پۆلیس گیروگرفتیان بۆ نابۆوه و بوختانیان بۆ هه‌لبه‌ست بوو، که گوایا ئه‌و پیاویکی شه‌رانی و دزه، ئه‌وه‌شیان بۆ هه‌لبه‌ست بوو که له کاتی سه‌ردانه‌که‌ی پیشوویدا چه‌ند شتیان له ناو ئاواییدا دیار نه‌ماوه. ئه‌و گوندیانه له هه‌موو که‌سیّ به گومان بوون که سه‌ردانی ئیمه‌یان ده‌کرد، ئه‌وان وایان ده‌زانی که ئه‌و که‌سانه به هانای ده‌ربازکردنمانه‌وه دین، ئه‌و گوندیانه زۆریان هه‌ولدا بوو که پیش به‌و هاتنه‌ی "ئه‌همه‌د" بگرن و نه‌هیلن سه‌ردانمان بکا، "ئه‌همه‌د" له یه‌که‌مجاردا دیته "ئاسهوبی"، پیاوه‌کانی ئه‌م گونده گفتوگۆیان له ته‌کدا کرد بوو، پییان گوتبوو، "ئه‌بدولکه‌دا" ئه‌وه‌ی زانیوه که تۆ بۆ ئه‌م گونده به‌ریوه‌ی، له‌به‌ر ئه‌وه بروسکه‌ی ناردووه که ده‌بیّ به‌لین بده‌ی، هه‌ر دوای ئه‌وه‌ی که سه‌ردانی خوشکه‌کانت کرد و چاوت پییان که‌وت یه‌کسه‌ر به‌بیّ راوه‌ستان ئه‌م ناوچه‌یه جیبهیلی. ئه‌وه‌شیان پیگوت بوو، ئه‌گه‌ر ئاوا نه‌که‌ی ئه‌وه تووشی ئازار ده‌بی. خۆ ئه‌گه‌ر نیازت ئه‌وه‌یه که یارمه‌تی ئه‌و کچانه بده‌ی، ئه‌وا به‌بیّ ئاره‌ق ده‌رناچی. کاتیّ که "ئه‌همه‌د" گه‌یشته ماڵه‌وه بۆ لای من ده‌ستی به گریان کرد.

ئەو کاتە "ئەبدولنور"ی برای "ئەبدولکەدا" لە ماڵەوە بوو، ئەو کە زانی بووی "ئەهمەد" هاتووە، هاتە سەرەوە، دەیویست لەو بارەیەوە لەگەڵ "ئەهمەد"دا بدوێ. ئەو پیاوە گەلێ لە "ئەبدولکەدا"ی برای نەرمتر و باشتر بوو، بەڵام ئەمیش سەرنەویی فەرمانی براکەی بوو. ئەو دەیویست بزانێ کە "ئەهمەد" بۆچی هاتووە، بۆ ئەوە هاتووە کە یارمەتی دەربازبوونی ئیمە بدا..؟ من بە "ئەبدولنور"م گوت: " "ئەهمەد" بۆ ئەوە نەهاتووە کە خۆی تیکەڵاوی کیشەی ئیمە بکا." داوام لیکرد کە وازی لیبینن چەند رۆژێ لای من بمینیتەوە، ئەو پیاوە بڕوای پیکردم، داخوازییەکەمی نەدایە دوواوە.

چەند رۆژێ دوای ئەوە، "ئەبدولنور" بۆ سەرەوە هاتەوە، نامەیەك و کاسیتیکی بۆ هینام کە "ئەبدولکەدا" بۆی ناردبووم. لە پیشدا نامەکەم خویندەوە، لە نامەکەدا نووسی بووی، پیاوێ ئەم نووسراوەی لە "ئنگلاند"ەوە بۆ کۆپی کردووم و بۆ ناردووم. ئەو نووسراوە کۆپییە بوو لەو راپۆرتەی کە "ئیلین" لە رۆژنامەدا بڵاوی کردبۆوە، داوای ئەوەشی لیکردبووم کە گوێ لە کاسیتەکە بگرم. منیش چووم بە "تیپ"ەکە (مسەجەل) گویم لە کاسیتەکە گرت، کە بە دەنگی خۆی پری کردبۆوە، "ئەبدولکەدا" پر بە پری بلندگۆکان دەینەراند.

لە کاسیتەکەدا، دەیگوت: "باش بیر لەوە بکەرەوە، من چیم بۆ تۆ نەکرد، لەگەڵ ئەوانەشدا تۆ سوپاسی ئەو دلسۆزیەم ناکەی، من وام دەزانی کە تۆ بەوە دلشاد دەبی و خیزانە کۆنەکەت لە یاد چۆتەوە. ئاوام دەزانی، کە تۆ ریزت لەوە گرتووە، ئیستا تۆ ژنیکی بە شووی. ئەگەر دەتەوێ سەر لە دایك و باوکت بدەیتەوە، دەتوانی پیم بلییت، کەی دەخوازی سەردانیان بکە، ئارەزووی خۆتە و کەس دەست ناهینیتە ریگات. بەڵام ئەو کاتە پیویستە کە کورەکەت لای ئیمە دانییت، دایکت ژنیکی یەکجار بە توانا و جەسوورە، من ئەوە تیدەگەم کە دایکت چ هەولیکی لە پیناوی منداڵەکانیدا داوە. کەی دەخوازی دەتوانی ئەو سەردانە بکەی."

من دەمزانی کە "ئەبدولکەدا" تاکو ئەو کاتەش بڕوای نەدەکرد، کە "مارکۆس" جیهیلم. ئەو وایدەزانی ئەگەر بەو شیوەیە خۆی نیشان دا، کە گوایا دژی سەردانەکەم

نیه، ئیتر منیش ناچار دەبم کە واز لە ئـازادی و خـۆ دەربـازکردن بـهێنم. لـەوە دەچـوو ئـەو پیـاوە میشـکی تیکچووبـێ، هـەر جـارەی بـە شـیوەیە دەدوا. جـاریك دەیگـوت: "راپۆرتەکەی رۆژنامەکەی "ئیلین" کار لە من ناکا و زۆرشـتی ئـاوام بینیـوە." جاریکی تـر دەیگـوت: " "زانـا" کـەی دەخـوازی، دەتوانـی سـەردانی دایکـت بکـەی." جـاریکیش هەرەشە و دژایەتی دەکردم، بەلاّم من گەلیك بەوە دلشاد بووم کە لە دەنگی ئەو پیاوەدا گۆران پەیدا ببوو. من گەیشتمە ئەو راستیەی کە رەوشی ئیمـە لـە گۆراندایـە، ئەمـەش سەرەتای نەمانی دەسـەلاّت و کۆنـترۆلّ کردنـی ئـەم پیاوانەیـە بەسـەرمانەوە. کاتـێ کـە گویـم لـە کاسـیتەکە گـرت و تـەواو بـوو، "ئـەبدولنور" لـە "تیـپ"ەکـەی دەرهینـا و خستیەوە گیرفانی.

پرسیارم لیکرد، پیم گوت: "ئەتوانم ئەو کاسیتە گل بدەمەوە...؟"

ئـەو بـە سـەربادانێ وەلاّمـی دامـەوە، پاشـان گوتـی: "نـا"... تـەنیا دەتوانـی گویـی لیگری."

ئیتر بۆ جاریکی تر ئەو کاسیتەم نەبینیەوە.

من دەمزانی کە ئەو پیاوە چاوەریی ئـەوە دەکات کـە وەلاّمـی نامەکـەی بدەمـەوە. دلنیا بووم لـەوە کـە ئـەو دەیویسـت بـەم جـۆرە وەلاّمـی بدەمـەوە و بلیـم: دەمـەوێ لای "مـارکۆس" بمینمـەوە و جیـی نـاهیلم. بـەلاّم مـن لـە نامەکـەدا بـۆم نووسـی، دەمـەوێ سـەردانی دایکـم بکـەم، پرسـیاری ئـەوەم لیکـرد، کـەی دەتـوانم ئـەو سـەردانە بکـەم..؟ دەمزانی کە ئەو پیاوە مل بەو داوایەم نادا و ریگـای ئـەو سـەردانەم لیدەگـرێ، ئـەویش سوور دەیزانی کە من ئەو کارە دەکەم.

پاش ئەوە لە چیا دابەزیم بەرەو گوندەکەی "نادیـا" کەوتمـە ریگـا، بـۆ ئـەوەی لـە مەر کاسیتەکەی "ئەبدولکەدا" وە هەوالەکان بۆ "نادیا" بگیرمەوە. وا دەردەکـەوت کـە "نادیا" وەرەی رووخا بێ، هیچ شـتێ نـەیبزوینێ. "ئیلـین" کـە بـۆ یەکـەمجار "نادیـا"ی بینی، لە راپۆرەکـەیدا کـە لـە رۆژنامـەدا بـلاّوی کردبـۆوە، چاوەکـانی "نادیـا"ی بـە دوو چاوی بیـهیوا پەسـن کردبـوو. دەروون و نـاخی "نادیـا" بـەو شـیوەیەی لیـهاتبوو. ئــەو دەیویست بۆ ئنگلاند بگەریتەوە، بەلاّم ئەوەشی باش دەزانی ئەگەر ئەو کارە بکات، ئەو

کاتە ناچاری دەکەن کە مندالەکانی جیهیلێ. بەلاّم من دەمزانی کە دلی "نادیا" بەرگەی ئەوە ناگرێ و شیت دەبێ. دلنیا بووم لەوە کە "نادیا" زۆر دلی بە گەرانەوەوە نەمابوو و گویی نەدەدایە. ئەو ژیانی خۆی وەك "ZOMBI"ی و کۆیلە رادەهینا، کە تەنیا لە خەودا، خەو بە ئازادیەوە ببینێ.

بەو جۆرە ئەو خیزانە توانی بوویان، لە هەولەکانیاندا بەسەر "نادیا"دا سەرکەوتووبن و هەموو ئەو خەندە و ئاواتانەی "نادیا" بکوژن کە لە کاتی کچینیدا هەیبوو.

من و "نادیا" ریککەوتین لەسەر ئەوە، هەر کەسیکمان لە پیشدا چانسی دەرباز بوونی بۆ رەخسا و بۆ "ئنگلاند" گەراینەوە، ئەوا ئەو کاتە مندالەکان دەبەینە لای ئەوی ترمان، بەو شیوەیە ئەوەی ترمان لە "ئنگلاند"دەوە بۆ دەربازبوونی ئەوی ترمان کۆشش بکا. من هیوادار بووم کە یەکەمجار "نادیا" ئیرە جیبهیلێ. ئەوەم چاك دەزانی، ئەگەر من لە "یەمەن"دا بمینمەوە، ئەو کاتە بە هەموو شیوەیە بیرانەوە تییان دەسرەوینم، بەلاّم ئەگەر "نادیا" بە تەنیا لیرە بمینیتەوە، یارمەتی و گەرمکردنی من نەبێ، ئەو کاتە بە ئاسانی خۆی بە دەستەوە دەدا و تاجی کۆیلەیەتی لەسەر دەکا.

رۆژی دوای ئەوە لە مالەوە بووم، "ئەبدولنور" بانگی لیکردم، کە بۆ مالی ئەوان دابەزم. کاتێ کە چووم، لەبەر دەرگا چاوەریی دەکردم، رایگرتم و گوتی: "کەسێ بۆ ئیرە هاتووە دەیەوێ بتبینێ."

پرسیارم کرد: "ئەو کەسە کییە..؟"

ئەو گوتی: "ئەبدولوەلی، بەریوەبەری پۆلیس، پیاویکی بە دەسەلاّتە، کە چاوت پییکەوت، زۆر ریزی لیبگرە. دەولەت لە "تایز"ەوە ناردوویانە، بۆ ئەوەی لە رەوشی تۆ بکۆلیتەوە."

پرسیارم کرد: "لە کوییە..؟"

"ئەبدولنور" وەلاّمی دامەوە: "لەو خانووەیە، ئەوە خانووی باوکی ژنەکەیەتی."

من پیشتر ناوی ئەو پیاوەم بیستبوو، دەمزانی کە پیاویکی بە دەسەڵاتە. بەڵام پیشتر نەمبینی بوو.

پرسیارم لە "ئەبدولنور" کرد: "ئەو پیاوە چی لە من دەوێ، با بزانم، تاکو خۆم بۆ پرسیارەکانی ئامادەکەم.؟"

"ئەبدولنور" وەڵامی دامەوە: "ئەو لە بارەی تۆوە شتی پیگوتراوە و رایان سپاردووە، رۆژنامە "ئنگلیزی"ەکان گەیشتوونەتە "لیبیا" و سەئودی"یە، دەولەت بەمەی زانیوە، دەیانەویت بزانن چی لە ئارادایە. لەبەر ئەوە ئەم پیاوە کراوە بە بەرپرسیار و ناردوویانە لە شتەکە بکۆلیتەوە."

ئیمە چووین بۆ ئەو خانووەی کە "ئەبدولوەلی"ی لیبوو، ئەو سەردەمە کە بچوومایە بۆ شوینێ سەرپۆش و پەچەم دەگرتەوە، لەبەر ئەوەی پیاوانی تر رووم نەبینن. پیاوان بەو ناوەدا بلاو ببوونەوە، بە ئۆتۆمۆبیل بەملاو ئەولادا فرکەیان دەهات. منیش هەولی ئەوەمدا کە بە دەموچاویکی گرژ و دەروونی ئالۆزەوە خۆم بە ژووردا نەکەم. کاتیك کە چووینە ناو خانووەکەوە، ژوورەکان پربوون لە پیاو، "ئەبدولنور" گوتی: "ئەوە ژووری ژنانە، بۆ ئەو ژوورە بچۆ، کاتێ کە "ئەبدولوەلی" داوای کردی من بە شوینتا دیم."

کە چوومە ژوورەوە ژنان دانیشتبوون و چاوەرییان دەکرد. ژنەکان هەموویان تامەزرۆی ئەوە بوون، کە بزانن چی لە ئارادا هەیە، لە کاتیکدا کە پیاویکی ئاوا بە دەسەڵات هاتووە و دەیەوێ من ببینێ. هەموو ژنەکان دەربارەی نووسینی رۆژنامەکان ئاگادار بوون. ئەو رۆژنامانە ببوون بە کۆمەلێ پرسیار و لییان دەکردم. من لە وەڵامی پرسیارەکانی ئەو ژنانەدا دەمگوت: واز لەوە بینن. زۆر هەولمدا میشکم سارد بێ و خۆم نەشەمزینم و بتوانم وەڵامی ئەو پیاوە بە دەسەڵاتە بە شیوەیەکی گونجاو بدەمەوە، بە هیوای ئەوەی کە بتوانێ ئازادمان بکات. لە هەمانکاتدا دەمویست لەگەڵ ئەو ژنانەدا کراوە و رووخۆشبم هەر لەبەر ئەوە، کە ئەوەندە پرسیارم لینەکەن.

چەند چرکەیەکی برد "ئەبدولنور" بە شوینمدا هات، ژووریکی نیشاندام، لە سووچیکی ژوورەکە پیاوێ بە تەنیا دانیشت بوو، سەرینیکی خستبووە ژیر رانیەوە، بە

وینــەی پیــاوە "ســەئودی"ەكـان كراسـیكی سـپی ئاودامـانی لەبـەردا بـوو، ســەرپیچەكەی داكـەند بـوو لـە لای خۆیـەوە داینـابوو. لەسـەر میزەكـەی بـەردەمیدا، هـەندیك پـەرە و كاغـەز دانرابـوون. پیـاویكی كورتـە بنـەی بـەخۆوە بـوو، قژیكـی رەشـی لـوولی پیوەبـوو، تەمەنی سی ساڵ دەبوو، بە سەرو سەكوتیا زرنگ و هوشیار دیار بوو.

كە چاوی بە من كەوت، بە ریزەوە گوتی: "رۆژباش."

منیش وەڵامم دایەوە: "رۆژباش."

ئەمجارە بەریزەوە هیمای بۆ زەویەكە كرد، "فەرمووو لەوێ دانیشە."

پاشان رووی كردە "ئەبدولنور" بە یارمـەتی، تـۆ جیمـان بیلـە." چاوەروانی كـرد تاكو ئەو چووە دەرێ.

سەرەتا بەوە دەستی پیكرد گوتی: "من هیچ دەربارەی ئــەوە نـازانم، كـە ئیـوە لـەو گوندەدا چۆن مامەلەتان لـە تـەكدا كـراوە، ئـەتوانی لـەو رووەوە هـەندێ شـتم بـۆ بـاس بكەی...؟"

منیـش بـەبی پیچـوو پـەنا و هەلبەسـتن، لـە نووكـەوە چیرۆكەكـەم بـۆ گیرایــەوە. كاتیك لە وتەكانی خۆم بوومەوە، ئەویش هەلویستی دەولەت و كاربەدەسـتانی باسـكرد، پرسیاری ئــەوەی لیكـردم، گوتـی: "ئایـا تـۆ جـارێ لـە جـاران بـیرت لـەوە كردۆتـەوە لای "ئەبدولا" بمینیتەوە و جیی نەهیلی..؟ یان رۆژێ لە رۆژان لە ماوەی ئەو چەند سالەی پیكەوەن ئەو كورەت خۆشویستووە..؟"

بەبێ راوەستان وەڵامم دایەوە: "نا".. هیچ كاتیكیش ئەو پیاوەم خۆشنەویســتووە، بـە پیچەوانـەوە كینـم لیـی دەبیتـەوە." لـە ناكــاودا دەســتم بــە گریــان كــرد، ئــازار و هەستەكانم كاریگەریان لەسەر ئەویش دانا.

ئـەو گوتـی: "ئـەمرۆ لای "نادیـا"ی خوشـكت بـووم، چـاوم بــەویش كــەوت و لــەو بارەیەوە دووایـن." ئەم پرسیارانەی كە لـە تـۆی دەكـەم لـە تـەك ئەویشـدا هـەر هـەمان شتمان باسكرد، ئەویش بە هەمان هەستی تۆ وەڵامـی دایـەوە، ئـەویش بەختـەوەر نیـە، دەیەوێ ئەم وڵاتە جیهیلێ و بۆ "ئنگلاند" بگەریتەوە، بەڵام ئەو دەخوازێ زارۆكـەكانی و میردەكەی لە تەك خۆیدا بەرێ. تۆ چۆن ئەوە هەلدەسەنگینی..؟"

من دەمزانی کە "نادیا" ئەوەی گوتووە، ئەوە تــەنیا تروسکەی هیوایــەك بــوو، کــە بتوانــێ زارۆکەکانی لــە تــەك خۆیــدا بــەرێ، ئــەو دەیزانــی ئەگــەر "مهەمــەد"ی مــیردی جیهیلێ، ئەوە بە ئۆتۆماتیکی منداڵەکانیان بە "مهەمەد"دەدا. بەڵام ئەوەندە دەزانم کە "نادیا" چەند کینی لە "جەواد" بوو، هیندەش کینی لــە "مهەمــەد" دەبــۆوە. هــەروەك چۆن مــن رکوکینــم لــە "ئەبدولکــەدا و ئــەبدوڵا"ی کوری دەبــۆوە. بــەڵام "نادیــا" لــەوە دەترسا کە بە ئاشکرا لە لای کەسانی تر ئەو هەستە دەربڕێ، نەکا منداڵەکانی لیدابڕن. ئــەو پیاوانــە بــەو شــیوە "نادیــا" یــان دەســتەمۆ کــرد، کــە مەبەســتیان بــوو. بــەڵام مــن نەمدەتوانی هەستەکانم بە وینەی "نادیا" بشارمەوە.

ئــەو پیــاوە بــۆ مــاوەی چــەند خولــەکێ بیدەنــگ و بــیری دەکــردەوە. منیــش بــەو شیوەیە ریــزم لیگــرت کــە "ئــەبدولنور" پیــی گــوتم. لــە کۆتــاییدا گوتــی: "باشــە، ئیســتا دەتوانی برۆی."

منیش ژوورەکەم جیهیشت و هاتمە دەرەوە، بەڵام ئەو پیاوە هیچ شتیکی لە بارەی پلانەکەیەوە پینەگوتم، من دلنیــا بــووم لــەوە، کــە چــی روودەدا، دەمزانــی کاتــێ کــە بــۆ شاری "تایز" دەگەریتەوە، بەسەرهاتەکە بۆ بەرپرسانی میری دەگیریتەوە. ئــەوەیان بــۆ دەسەلمینێ کە راپۆرتی ناو رۆژنامەکان کــە بڵاوکراونەتــەوە راســتن، دوای ئــەوە ئیمــەش لەم گوندانە رزگارمان دەبێ. ئیستا نزیکەی هــەفت ســالە کــە هینراوینەتــە "یەمــەن" و لیرە دەژین. بەهەر شیوەیە بێ دەتوانین ماوەیەکی تریش چاوەروان کــەین. لەراســتیدا شتیکی خۆشە، کە دەتوانم لەگەڵ مرۆڤەکانی تردا بپــەیڤم بــەبێ پیــچ و پــەنا ســووربم لەسەر داخوازیەکانم، بە تایبەتی ئەو کەسانەی کە هیز و دەسەڵاتیان لە "ئەبدولکــەدا" و لەو پیاوە گوندیانە زۆرترە.

سەرپۆشــەکەم بەســەرمدا دایــەوە و ئــەو ماڵــەم جیهیشــت، بــەرەو مــاڵ گەرامــەوە. کــاتیك کــە بــە بــەردەمی مــالی "ئامینــە"دا تیدەپــەریم، "ئامینـــە" پرســیاری لیکــردم، دەیویست بزانێ کە چی بووە، بــە دەم رۆیشــتنەوە وەڵامــم دایــەوە، کــە ئــەوە کــاری ئــەو نیە. هەستم دەکرد، کە ئیســتا هاتوومەتــەوە ســەرخۆم و بــاریکی گرانیــان لەســەر شــانم

لابردووه. لەراستیدا دەبوو، هەر لە میژەوە ئەم هەلویستانەم هەبووایە، لەلای هەموو کەسێ گرفتەکانم بدرکانایە.

کاتێ گەیشتمە مالەوە "وەردە" و ژن و پیاوە پیرەکەش لەو بارەیەوە هیچ پرسیاریکیان لینەکردم. دەمزانی کە لەو رووەوە هیچیان بۆ ناکرێ، ناتوانن کۆنترۆلی شتەکە بکەن و لە دەستیان دەرچووە، ببووم بە تانە و مایەی شەرمەزار کردنیان. لەبەر ئەوە بەرامبەرم بیدەنگ بوون. بیگومان لە ناو خۆیاندا گەلێ لەو بارەیەوە دوواون.

لە ماوەی ئەو چەند سالەی کە لەوێ بووم، دایکی "ئەبدولکەدا" بەرامبەرم ژنیکی باش بوو ئاگاداری ئەوە بوو، کە چۆن ئازارم دەدەن و کاری گرانم پیدەکەن. هەموو جارێ ئەو پیرەژنە پیی دەگوتم: "کچم خۆت خەمبار مەکە، خوا لەگەلّ تۆیە، ئەو دەزانێ کە تۆ بیگوناهی و کاری نابەجیت لەگەلدا دەکەن، رۆژێ دێ، کە هەموو شتەکان بە دلی خۆت و بە چاکە بۆت دەگیرێ." من هاتمە سەر ئەو رایە، کە لەوانەیە ئەو پیرەژنە راست بیژێ.

سەردانیکی "نادیا"م کرد، هەردووکمان لە بارەی چاوپیکەوتنەکەمان لەگەلّ "ئەبدولوەلی" دووایـن "نادیا" ئەوەی بۆ روونکردمەوە، بۆچی بە "ئەبدولوەلی" گوتووە، کە دەیەوێ لەگەلّ "مەهمەد"ی میردی بۆ "ئنگلاند" پیکەوە برۆن. ئەو شتەی کە من لیی دەترسام و دەسلەمیمەوە. راستیەکەی ئەوە بوو، کە "هانی و تینا" بۆ "نادیا" هەموو شتیك بوون. من لەوە دەترسام، ئەگەر ئەو مندالانەی لیزەوت بکەن چی بەسەر دێ. بەلام من لەلای خۆمەوە لەسەر بریاری خۆم سوور بووم، کە "مارکۆس" جیبهیلم. من لەگەلّ ئەو ناچاریەدا خۆم راهینابوو، تەنیا دوو ریگام لەبەر بوو، ریگای سییەم نەبوو. ئەوە شتێ نەبوو کە بیری لیکەمەوە.

"هانی" کوری "نادیا" هیندە گەورە ببوو، دەوروپشتی خۆی دەبینی، هەموو جارێ پرسیاری لە دایکی دەکرد و دەیگوت: "دایە دەتەوێ من جیبهیلی..؟" کاتێ کە گویم لەو پرسیارە دەبوو، هەستم دەکرد، دلم خەریکە دەپچرێ. بە خۆم دەگوت، ئەو پرسیارە دەبێ چۆن کارێ لە "نادیا" بکا.

دوو رۆژ دوای ئەوە "ئەبدولنور" هاتە سەرەوە، بۆ ئەوەی پیکەوە هەندێ گفتوگـۆ بکەین. لە ئەنجامدا گوتی "راسپیردراوم کە تۆ و "نادیا" بۆ شاری "تـایز" بـەرم، ئیمـە دەبێ بەیانی زوو دەربچین، خۆتان ئامادەکەن."

پرسیارم لیکرد: "بۆچی...؟"

گوتی: "کەسێ دەیەوێ چاوی پیتان بکەوێ."

گوتم: "هەمووماں سواری یەك ئۆتۆمۆبیل دەبین..؟"

گوتی: "ئا".

مـن بروام بەوە نەدەکرد، ئەمە راستە، کە من و "نادیا" بـۆ شـوینێ پیکڤـە بچـین، بەبێ ئەوەی کە ریگرمان هەبێ، ئەوە هەفت سالە پیکـەوە بـە هیـچ لایـەکدا نـەچووین، ئەمە شتیکی سەمەرەیە.

پرسـیارم لیکــرد: "ئــەی مندالەکــەم. "گوتــی: نــا"... بــەیانی دەچــین و ئیــوارە دەگەرییینەوە، ئەو لیرە جیهیلە، بەیانی کاتژمیری پینـج وەرە خـوارەوە، لـە مـالی ئیمـە ئامادەبە، چاوەروان دەکەم."

منیش گوتم: "باشە وادەکەم."

ئەو شەوە بەدەم بیرکردنـەوەوە خـەو لـە چاوانم نەکـەوت، هـەر لـە بـیری ئـەوەدا بووم، کە چی روویداوە. "وەردە" بەیانی زوو هاتە ژوورەکەم بۆ ئەوەی "مـارکۆس" بـۆ لای خۆی بەرێ، لە هەمانکاتدا یارمەتی ئەو جلوبەرگانەم بدا کە بۆ نـاو شـار لەبـەریان دەکەم، کولەنجەیەکی رەش و سەرپۆشێ، کولەنجەکە تا سەر کەمەرم دریژ بوو، هەروەها تەنوورەیەکی رەشی دریژ لە زەوی دەخشا. لـە ژیـر ئـەو تەنوورەیـەوە پـانتۆلی دریـژی "ئارەب"یم لە پیکرد. "ئەبدولکەدا" ئەو جلوبەرگانەی لـە "سـەئودی" بـۆ بـە دوورپـن دابووم. "نادیا"ش هەمان جلوبەرگی هەبوو، بەلام ئەو خۆی لە مالەوە درووبوونی. لەو ولاتە گەرمەدا بەو جلوبەرگانە راهاتبووین. جووتێ پاپووجی نـایلۆنم لـە پـێ کـرد، لـە زۆربەی ئەم ناوچانە ئەم جۆرە پیلاوانە بەکاردینن. ڤایشی ئەم پیلاوانە بە بەردەوامی دەپچـران، دەبووایـە مـانگی جـارێ بـە شـیوەیەکی بـاش بیـان دوورینــەوە و چاکیـان کەینەوە.

بۆ بـەیانی زوو ئـەو بەرگانـەم لەبـەرکرد، بـەو تاریکاییـــە لــە چیـا بــەرەو مــالی "ئەبدولنور" هاتمـە خـوارەوە. "ئـەبدولنور" لەسـەر بانیژگـەی خانووەکـەیان راوەسـتا بوو، بە لایتیکـەوە ریگاکـەی بـۆ رووناك دەکردمـەوە. لـەوە دەترسـام کـە هـەلنووتیم و بکەوم، هەر چەندە شارەزای ئەو تولە ریگایە بـووم، بـە رۆژ هـاتوچۆی زۆرم پیـادا کـرد بوو. "ئەبدولنور" بەرەو رووم هات، لە خـوارەوە یـەکمان گرتـەوە، لـە دیـوی پشـتەوەی خانووەکەیانەوە بەرەو خوارەوە چووین، جیپەکە لەویَ چاوەریی دەکردین. ئـەو جیپـە جیگای دوازدە کەسی تیادا دەبۆوە، بەلام ئەو بەیانیە تەنیا ئیمە سواری دەبووین کەسی تر لە تەکماندا نەدەهات.

جیپەکە بەرەو گونـدی "ئاسـهوبی" بەریکـەوت، دەبـوو بچـین "نادیـا"ش بـهینین. ئەویش لە تاریکدا وەستا بـوو چـاوەریی دەکردیـن ئـەویش لەگـەلمان سـوار بـوو. مـن و "نادیا" لای یەکەوە دانیشتین، من بەوە گەلیَ بەختەوەر و دلخۆش بووم، ئیستا لەگـەلَ "نادیـا" پیکڤـەین. کـەسمان بروامـان نـەدەکرد، کـە ئەمـە راسـتی بـیَ، بـە خـەو بینـــین دەچوو.

رووم کردە "نادیا" و گوتم: "بروا ناکەم، ئیمە بەرەو هیچ شوینیَ بچین، تەنها بـۆ ماوەی چەند خولـەکیَ لـەم جیپـەدا دادەنیشـین. تۆزیکـی تـر یـەکیَ دیَ و پیمـان دەلـیَ، دابەزن، پیویستە بۆ ناو گوند بگەرینەوە. ئیستا هـەموو شـتیکمان لیتیـك دەدەن، بـەلام کـەس نـەهات کـەس دەسـتی نەهینایـە ریگامـان، "لاندرۆڤـەر" بینـی خـواردەوە بـــەرەو بیابـان گرمـەی دەهـات، تیشـکی لایتــەکانی بــە تــاریکیدا بلاوبـۆوە. کاتـیَ کـە نزیکـی "تایز"بووینەوە خۆر هەلهات.

# بەشی پازدە
# زیندانی لە شوینێ

کـە گەیشـتینە نـاو شـاری "تـایز"، بـەرەو شـوینیکی نادیـار دەیانــبردین، لــە "ئەبدولنور"م پرسی: "بەرەوە کوێ دەچین..؟"

ئـەو وەڵامـی دامـەوە: "بـۆ ماڵێ دەچـین و سـەر لـە کەسـێ دەدەیـن، ئــەو مرۆڤــە کەسایەتیەکی گرنگە."

ئەوە تـەنیا شـتیك بـوو کـە ئـەو پیـاوە لـەو ماوەیـەدا پیـی گوتـین. ئۆتۆمۆبیلەکـە بەسەر شەقامە پیس و بە بەردەم دووکان و کۆگا بیدەنگەکانی ناو شاردا وژەی دەهـات. پیاوەکان نەیاندەویست ئەو نەهینیە بە ئیمە بلیـن، کـە بـەرەو کـوێ دەچـین. ئـەوان وا بیریان دەکردەوە، بەو نهینی نەدرکانە دەسەڵاتیان بەسەر ئیمەی مییینەدا هەیە.

ئیستا ئیمە لە شاری "تایز"ین، بـەڵام نـازانین لـە کـام شـوینین. لـە نـاو جەرگـەی شاردا لە ژیر خۆرەتاو و دەنگە دەنگی خەڵك و تەپوتۆزدا خۆمان بینیەوە، چیایەك بـە خانووە سەر تۆپەکانیەوە دەبینین، قەڵایەکمان لیدیارە بە ریگایـەکی پیچاو پیچا بـۆی سەردەکەوی. چیاکە بیدەنگ و هیمن دیـار بـوو، شـۆفیرەکە ئۆتۆمۆبیلەکـەی بـەو ریگـا بەرتەسکانەدا بەرەو چیاکە دەهاژووت، لەسەر چیاکە خۆمان بینیەوە، لەویندەریوە ناو شارمان لیدیار بوو.

لەناوچیاکـەدا ریگاکـان تــەخت و دیمەنــەکانیش تـاکو دەهـات جوانــتر و جوانــتر دەبوون، خانووەکانی سەر چیاکە مۆدیرن و لە رووکاری دەرەوە جـوان دیـار بـوون. ئـەم ناوچەیە جودا بوو لەگەڵ بەشەکەی تری شاردا، ئەگەر بـەراورد بکرایـە لەگـەڵ ناوچـە

چیاکانی "مۆکبانە"دا بــەوە دەچـوو کـە ئەسـتیرەیەکی تـر بـێ. ئۆتۆمۆبیلەکـەمان بـەو ریگا پیچاوپیچانەدا لـە پیچکردنـەوەدا بـوو، بـە بـەردەم ئـەو دیـوارە بـەرزەی قەلاکـەدا تیپەری، ئەو ناوچەیە بە باخچەی خۆش رازابـۆوە، خـانووە گـەورە جوانـەکان یـەك لـە دوای یەك دەردەکەوتن. لە کۆتاییدا ئۆتۆمۆبیلەکە بەرەو ریگایەکی تـر پیچی کـردەوە، خانوویەکی جوانمان لیدەرکەوت، لە هەموو خانووەکـانی تـری ئـەم ئەسـتیرەیە جوانـتر بوو، خانووەکە پشتی دابوو بە چیاکەوە و بە دیواریکی بەرز دەورە درابوو، دیوارەکـانی بۆیەی سوور کرابوو، رەنگی پەنجەرەکان پەلکەزیرینەیی بوون، کە گەیشتینە بـەردەمی خانووەکە لە بەردەم دیواریکی بە ئاسن دروستکراودا راوەستاین.

"ئـەبدولنور" لـە ئۆتۆمۆبیلەکـە دابـەزی خـۆی بـە پاسـەوانە پۆلیسـەکان ناسـاند، ئـەوانیش دەرگـا ئاسـنەکەیان بـۆ کردینـەوە، ئۆتۆمۆبیلەکـە چـووە ژوورەوە، بـۆ نـاو باخچەی خانووەکە و لەوێ رایانگرت، من و "نادیا" دابەزین و بـە پیپلیکەدا بردیـانین بۆ سەرەوە، بۆ بەردەم دەرگایـەکی گـەورەی سـپی لـە تەختـە دروسـتکراو. ژنـێ دەسـتێ بەرگی "ئارەب"ی هەروەك بەرگەکانی ئیمەی لەبەردا بوو، دەرگاکەی لیکردینەوە. کاتێ کە لە دەرگاکە چووینە ژوورەوە، بەرەو لای راست بە بەردەم دەرگایەکی تردا تیپـەرین، وادەزانم ئەو ژوورە ژووری دانیشتن بوو، لە بەرامبـەرمان دەرگـای ژووریکـی تـر هـەبوو بەرەو ئەو دەرگایە ملمان نا، ژووریکی زۆر گەورە بوو، ئەو ژوورە پر بـوو لـە مۆبیلـە و کورسی. پەنجەرەی ژوورەکان پـەردەیان پیوەبـوو، دیوارەکـانیش لـە بـری گـەچکاری بـە کاغـەزی جـوان هیلمسـاو کرابـوون. لـە سـووچی ژوورەکــەدا مـیزی بچـوك دانرابـوون، TVیـەکی رەنگـاو رەنگیـش لـە سـووچیکی ژوورەکـەدا بـە دەنــگ بـراوی داگیرسـا بـوو، "چلچـرا"یـە لـە ژوورەکـەدا هەلواسـرا بـوو، تـا ئـەو سـاتە شـتی ئـاوا ئـەنتیك و جـوانم نەبینی بوو.

کـە گەیشـتینە ژوورەکـە دانیشـتین، سەرپۆشـەکانمان لـە سـەرمان کـردەوە. ژنەکـە پرسیاری لیکردین: "قاوە یان چـا، کامیـان دەخۆینـەوە..؟" ئیمـە داوای سـاردیمان کـرد. ئـەو ژنـە پـاش ئـەوە خـۆی پیناسـاندین کـە یەکیکـە لـە ژنـەکانی "ئــەبدولوەلی". ئـەم خانووەش خانووی یەکێ لە ژنەکانیەتی. لەگەڵ ئەوەشدا کـە ئـەو ژنـە خـەلکی گونـدی

"هۆکایل"ی لای ئیمه بوو. من لەوەوبەر هەرگیز ئەم ژنەم نەبینی بـوو، ژنیکی کورتـە بالاّ، بەرزی بالاّی نزیکەی سەد و پەنجا سانتین دەبوو، جلی جوانی گران بەهای لەبەردا بـوو، بـەلاّم زۆر ژیکەلـە و نەشمیلـە بـوو. کاتـێ کـە خواردنەوەکـەی بـۆ هینـاین، پاشـان دەرگای ژوورەکەی لیداخستین و لییدا رۆیشت.

پاش کەمیّ یەکیّ لە دەرگاکـەی دا، "ئـەبدولوەلی" هاتـە ژوورەوە. هـەر بـە هـەمان جلوبەرگەوە کە بۆ یەکـەمجار لـە گوندەکـەی لای خۆمـان لـە مالەکـەی خـۆی کـە چـاوم پییکەوت. "ئەبدولنور"یش دوابەدوای ئەو هاتە ژوورەوە.

"ئـەبدولوەلی" بـە زەردەخەنـە و ریـزەوە سـلاّوی کـرد: "رۆژتـان بـاش.. لەوانەیــە پرسـیار بکـەن کـە چـی لـە ئـارادا هەیـە، لەراسـتیدا مـن بەسـەرهاتەکەم بـۆ پاریزگـاری "تـایز" گیرایـەوە، ئــەویش پیشـنیازی ئــەوەی کــرد، کــە ئیــوە بــۆ ئــیرە بیــن، تــاکو چارەسەریکی گرفتەکەتان بکەین."

من ئەو ساتە هیچ پرسیاریکم نەبوو کە بیکەم، بە بیدەنگی چاوەریی ئـەوە بـووم کە ئەم شتە بە کویّ دەگا. پاش ئەم هەواله، پیاوەکان رۆیشـتن، ژنەکـەی "ئـەبدولوەلی" بۆ لامان گەرایەوە، ماوەی چەند کـاژیریّ پیکـەوە بووین، کـوره مندالەکـەی لـەلای ژنـە گچکەکـەی "ئـەبدولوەلی" دانـابوو. ئــەو ژنــە دەربــارەی پۆلیســەکان دەدوا ئــەوەی بــۆ دەگیرایـنـەوە، کـە چــۆن ئــەو پۆلیسـانە بــە رۆژ "گــات" دەجــوون. پاشــان دەربــارەی میردەکەی دووا، کە چۆن هەمیشە خەریکی کارە و زۆر بە کەمی مالــەوە دەکـەویّ. ئـەو ژنە پرسیاری ئەوەی لیکردم، ئایا لە ناو گونددا، کەسـیّ لـە خیزانەکـەی دەناسـم، بـەلاّم من کەسیانم نەدەناسی. تەنیا جاریّ مالەکەیان چوو بــووم، ئـەویش ئـەو جـارە بـوو کـە "ئەبدولوەلی" ویستی بمبینیّ. ئەو ژنە دەیویست هەوالی مالی باوکی بزانیّ. ئـەوەی کـە من دەمزانی ئەوە بوو، کە مالی باوکی باشن و هیچ هەوالیکی ناخۆش لە ئارادا نیە.

ئەو ژنە بۆ ماوەیەکی کەم من و "نادیا"ی جیهیشـت، پاشـان ئـەمجارە لەگـەلّ ژنـە بچکۆلەکـەی "ئـەبدولوەلی"دا بـۆ لامـان گەرایـەوە لـە هــەمان ژووردا سـفرەی خوانیـان داخست و دەفر و کەوچك و چەتالیان هینا و لەسەر سفرەکە خواردنیان رازانــدەوە. لـە ژیانمدا بەو شیوەیە هیندە چیشت و خواردنم نەبینی بوو، برنـج، گۆشـتی گـا، مریشك،

نان و کەرە، شۆربا، میوە، هەروەها چەندان جۆر کیك و کاری هەویر. من لەوەوبەر زۆربەی ئەو خواردنانەم نەخواردبوو. هەموومان پێکڤە بۆ نانخواردن دانیشتین و نانمان خوارد، پاش نانخواردن ئیمەش لە تەك ئەو ژنانەدا لە کۆکردنەوەی سفرە و خواردنەکان یارمەتیمان دان. ئەو رۆژە دانیشتین و پشوماندا تاکو بوولیلە و پیاوەکان بۆ لامان گەرانەوە.

"ئەبدولوەلی" گوتی: "ئیوە شەو لیرە دەمیننەوە."

"نادیا" گوتی: "ئەی مندالەکانمان." من ئەوەم دەزانی کە "نادیا" مندالەکانی لای دراوسییەکی جیهیشتووە. ئەو دراوسییە جیگای بروای "نادیا" بوو.

"ئەبدولوەلی" گوتی: "خەمی مندالەکانتان نەبێ، ئیوە ئەم شەو لیرە دەمیننەوە."

ئیمە چاوەروانی ئەوە بووین، کە ئەو رۆژە بگەرێینەوە. لە هەلسوکەوتی ئەو پیاوەدا شتێ هەبوو. کە ئیمە بروای پیبکەین. ئەو شەوە تا کاتی خەوتن بە دیار TV وە دانیشتین. من و "نادیا" وا هەستمان دەکرد لە بەهەشتدا دەژین. پاش ئەوە "ئەبدولوەلی" بەرەو ژووریکی گەورەتر فەرمووی کردین. پیموابوو ئەو ژوورە ژووری تایبەتی خۆی بوو، تەلەفۆنێ لەسەر میزێ دانرابوو، لە ماوەی هەفت سالی رابردوودا ئەوە بۆ یەکەمجار بوو کە تەلەفۆن ببینم.

کاتێ کە چاوم بە تەلەفۆنەکە کەوت، بە دەست خۆم نەبوو ئەو پرسیارەم کرد: "ئەوە تەلەفۆنی راستیە...؟ مرۆ دەتوانێ بۆ هەر کوییە کە بیەوێ، لەگەڵ کەسانی تردا ئاخافتنی پیبکا..؟"

"ئەبدولوەلی" بە خەندەیەکەوە سەیریکی کردم گوتی: "ئا تەلەفۆنی راستیە."

لەو کاتەدا هیچ شتیکم لە یاد نەما، تەنیا ئەوە نەبێ، کە تەلەفۆنێ بۆ دایکم بکەم. "ئەبدولوەلی" ماوەیە بە ئاخافتن لە ژوورەوە لە تەکماندا مایەوە، بەلام هەر چاویکم لە تەلەفۆنەکە بوو. لە ماوەی وتوویژەکەماندا "ئەبدولوەلی" لە بارەی دایکمەوە دەدوا، کە دایکم چی کردووە. ئەو دەیزانی کە لە رۆژنامە "ئنگلیز"یەکاندا لە بارەی ئیمەوە چی نووسراوە.

لای ئیوارێ "ئەبدولنور" بۆ ناو گوند گەرابۆوە. بۆ ئەوەی بە "وەردە" و ئەوانی تر راگەیەنیت، کە ئیمە ئەمشەو ناگەرییینەوە. کاتێ کە بەیانی لە گوندەوە بەرەو شاری "تایز" دەرچووین، ئەو پیاوە نەیدەزانی کە ئیمە شەوێ لە "تایز" دەمینینەوە، تا ئەو کاتەی کە "ئەبدولوەلی" پیی راگەیاند بوو، "ئەبدولوەلی"ش وەك نەهینی تا ئیوارێ دەنگی نەکرد بوو.

لەو ماوە کەمەدا، کە لە ژوورەوە بووین "ئەبدولوەلی" پرسیاری لیکردم گوتی: "ئیستاش لەسەر بریاری خۆت سووری، هەر دەتەوێ بگەرییتەوە و ئەم ولاتە جیبهیلی..؟ من داوات لیدەکەم کە لەو بریارەی خۆت پەشیمان بیتەوە."

منیش وەلامم دایەوە: "نا دەمەوێ ئەم ولاتە جیهیلم، بۆ ولاتی خۆم بگەریمەوە."

ئەو هەولی دەدا جاروبار ئاخافتنەکە بگۆرێ و لەبارەی شتی ترەوە بدوێ، لە ناکاویکدا هەمان پرسیاری بە شیوەیەکی تر دووبارە دەکردەوە، دەیگوت: "ئەگەر ئیوە و مندالەکانتان لەشار بژین، هەست ناکەن کە باشتر بێ..؟"

ئەو پیاوە چەند جاریکی تر هەر هەمان پرسیاری دەکردەوە. من بەو پرسیارانە نائارام و دلتەنگ دەبووم و بە توورەییەوە پیم گوت: "تکایە ئەو پرسیارانە دووبارە مەکەرەوە، لەبەر ئەوەی من بریاری خۆم داوە، دەمەوێ بۆ ولاتی خۆم بگەریمەوە، نامەوێ لیرە بمینمەوە. من دەمەوێ. دایکم لە کارەکەیدا بەردەوام بێ، تا ئەو کاتەی کە لەم ولاتە دەربازمان دەکا."

ئەو سەریکی تیگەیشتنی بەرز و نزم کردەوە و پاش وچانێ بە ئارامیەوە، ئەوەی بۆ گیرایینەوە کە دەسەلاتدارانی "یەمەن"ی زۆر دلگرانن بەوە، کە دایکم ئەو رووداوەی بە رۆژنامەکان گەیاندووە.

بە روویەکی تریشەوە گوتم: "من بیباکم لەوە، کە دایکم کردوویەتی. ئیمە پیویستە ئەو شتە گەلەکیش بکەین، پیویستە مرۆڤەکانی ئیمە بزانن، کەچی بەسەر ئیمەدا هینراوە. ئیمە دەمانەویت بۆ ولات بگەرییینەوە، کەس ناتوانێ بە زۆر لیرە بمانهیلیتەوەو لەو ماف و دلخوازیەی خۆمانمان دابرێ. من ئەو چەند سالەم بەو

شیوەیە بەسەر بردووە، ئیستاش کۆلنادەم و ئەو خەباتەم بە رووناکایی گلۆپی نـاو شـار ناگۆڕمەوە."

ئـەو رووی کـردە "نادیـا" و پرسـیاری لیکـرد: "تـۆش وەکـو خوشـکەکەت بـیر دەکەیتەوە..؟"

"نادیا" وەڵامی دایەوە: "ئا منیش هەر وەکو ئەو بیر دەکەمەوە."

من سوور بووم لەسەر ئـەوە، نەمدەهیشت کـە ئـەو پیـاوە بـە پرسـیار و وتـەکانی ماندووم بکا و کۆلبدەم. من لـە مـاوەی ئـەو هـەفت سـالەدا ئـەوە فـیر ببـووم، کـە چـۆن ئاخافتن و گفتوگۆ و هەلچوون و داچوون لەگەڵ پیاوانی "یەمەن"یـدا بکـەم. مـن بـاش شارەزای میشکیان ببووم. دەمزانی میشکیان چی تیدایە و چۆن کار دەکـات. مـن ئامـادە نـەبووم کـە ئەوانـە بریـار و خواسـتەکانیان بەسـەرمدا بسـەپینن. ئـەو پیاوانـە هـەموو ئامانجیان ئەوە بوو، ئەوەی کە دەیانەوێ لە کۆتاییدا بەسەر مرۆڤدا بیسـەپینن. ئـەوان زۆریان بەلاوە ئاسایی بوو، کـە گـوێ لـە بەرامبەرەکـەیان نـەگرن. یـان بەرامبەرەکـەیان ترۆکـەن. مـن ئـەوەم چـاکدەزانی، کـە رزگـار بوونمـان نزیکـە، هـەرگیز بـیرم لـەوە نەدەکردەوە خۆم بە دەستەوە بدەم و کۆلبدەم. بە بینینی ئەو تەلەفۆنەی ناو ژوورەکە وەك شیتم لیهات بوو، هەستم دەکرد کە دایکم بە شیوەیەك لە شیوەکان لیمەوە نزیکە، بەڵام دەستم نایگاتێ.

ئەو شەوە من و "نادیا" لەسەر فەرشی زەویەکە خەوتین. زەوی ژوورەکـە فەرشـی نەرمی لەسەر راخرابوو. رۆژی دووابیش لەوە نەدەچوو هیچ گۆڕانێ لە ئارادا بێ، بەبێ هیچ گفتێ بە تەنیا جیهیلرا بووین. وردە وردە نـا ئـارامی دایگرتـین، پیویسـتمان بـەوە بوو کە یەکێ گویمان لیبگرێ، لە هەمان کاتدا پەروشـی منداڵـەکانمان بوویـن. کاتـێ کـە "ئەبدولوەلی" بۆ لامان هات بۆ ئەوەی لە تەکماندا بپەیڤێ. پرسیارم لیکرد: "ئایا هیـچ گۆڕانێ لە ئارادا هەیە، ئیمە چاوەریی چی بکەین..؟"

ئەو هیمنی کردینەوە گوتی: "ئیمە منداڵەکانتان بۆ ئیرە دینین."

پرسیارم کرد: کەی دەیانهینن..؟ ئیمە دەمانەوین بەزووترین کات بیانهینن."

ئەو وەڵامی دایەوە. "باشە"

جاریکی تر کەوتەوە پرسیار لیکردنم،"پەیوەندیتان لەگەڵ "وەردە" چۆنە...؟"

من وەڵامم دایەوە."نیوانمان باش نیە و دانومان پیکەوە ناکولێ، ئەو ژنە مامەلەیەکی زۆر ناهەمواری لە تەکمدا کردووە و دەیکا، هەرچی کار و ئەرکە داویەتی بەسەرمدا، لە کازیوەی بەیانیەوە، تاکو بوولیلەی ئیوارێ دەبێ کار بکەم."

ئەو پیاوە گویی لیدەگرتم و لە وتەکانم تیدەگەیشت، کە چی دەلیم. پاش ئەم گفتوگۆیە، لە ژوورەکە چووە دەرەوە. بە دریژایی ئەو رۆژە، ئەو پیاوە بە بەردەوامی جاروبار بۆ ماوەی چەند خولەکێ بۆ لامان دەهات و هەندێ پیکڤە دەپەیڤین، پاشان جیی دەهیشتین و دەرۆی بۆ لای پۆلیسەکان یان بە کاروباری خۆیەوە خەریك بوو.

بۆ رۆژی سییەم، هەولمدا، هەندێ زانیاری لیوەرگرم و لە بارەی ئەم هاتنەمانەوە پرسیاری لیکە م، بزانم بریاری چیان داوە. هەر چەندە من چاوەروانی ئەوەم دەکرد کە خۆی لە پرسیارەکانم لابدا و وەڵامم بە تەواوی نەداتەوە.

لەبەر ئەوە پیم گوت:"ئیمە نامانەوێ جاریکی تر بۆ ناو گوند بگەرییینەوە. ئیمە دەمانەوێ بۆ وڵاتی خۆمان بگەرییینەوە."

ئەو وەڵامی دامەوە:"پیویست ناکا کە جاریکی تر بۆ ئەو گوندە بگەرینەوە."

بە بیستنی ئەو وەڵامە، هەرگیز بروام نەدەکرد. بە گومانەوە پرسیارم کرد:" هەرگیز ناگەرییینەوە...؟"

بە خەندەیەکەوە گوتی: پیویست ناکا جاریکی تر بۆ ناو ئەو گوندانە بگەرینەوە، پەیمانتان دەدەمێ کە هەرگیز ناگەرینەوە."

بە وەرگرتن و بیستنی ئەو پەیمانە، خەریك بوو لە خۆشیاندا دەفریم. وا هەستم کرد، کە بە باشی گویم لەو بەلینە نەبووە، پرسیارم کرد:"بۆچی نابێ بگەرییینەوە...؟"

ئەو وەڵامی دامەوە گوتی:"لەبەر ئەوە کە پیویست ناکا ئیوە بگەرینەوە، ئیتر ئیوە لە شار دەژین."

من نەمدەتوانی کە باوەر بەو گفتە بکەم، وەکو بینینی خەویکی خۆش وابوو، چۆن لەو ئاستە نزمەی ژیانی "کەمپایس"ەوە، ژیانمان بەرەو باش بوون بچێ، کەواتا ئەگەر ئاوا بیت، هەوڵ و کۆششەکانم بەریان گرتووە و بەرەکانیان دەچنمەوە، لە

یەکەمجاردا کە من و "نادیـا" لیـك جـودا بووینـەوە، بـە زۆر لـە "نادیـا" یـان دابریـم و بردیانم لە "ریستۆرانت"دا کار بکەم، پاشان بە یەکجاری گەرامەوە و لە "نادیـا" نزیـك کەوتمەوە، ئیستاش بۆ شاری "تایز" هینراوین و لەگەڵ "نادیـا" پیکـەوەین، بریـارە لـە ژیانی ناو گوند دوور بخریینەوە. کەواتا دەبێ هـەنگاوی کۆتاییمـان ئـەوە بـێ بـۆ وڵاتـی خۆمان بگەرییینەوە.

ئیمە کاتی خۆی ئەو هەوالەمان نـەدەزانی، کـە ئـەو کەسـانەی هاوکـاری "ئیلـین و بین" یان کردووە، وەکو بەریوەبەری نەخۆشخانە و وەرگیرەکە و شۆفیرەکە، هەموویان لەلایەن پۆلیسی نەهینیەوە، بـانگ کـراون و لیکۆلینـەوەیان لـە تـەکدا ئـەنجامداون. کـە ئایا ئەم سێ کەسە بە شـیوەیە لـە شـیوەکان زانیویانـە کـە ئـەو ژن و پیـاوە "ئنگلـیز"ە رۆژنامەوان بوون. بە دلنیاییەوە هیچ کام لەم سێ کەسە ئەوەیان نەزانی بـوو، کـە ئـەو دووانە رۆژنامەوان بوون. خۆ ئەگەر ئەو سێ کەسە بیانزانیایە، کە ئەوان رۆژنامـەوانن هەرگیز پییان بەو ئاگرەدا نەدەنا، هەرگیز نەیاندەویرا یارمەتیان بدەن.

من و "نادیا" هیدی هیدی "ئەبدولوەلی" مان لەلا شیرین بوو، بە تایبەتی کە ئـاوا بە ریزەوە دەیدواندین، بە تـەرزی باوکـێ شـتەکانی بـۆ روون دەکردینـەوە، یـان ئـەوەی پیدەگوتین، کە چۆن ئەو هەست بە شتەکان دەکا، یان بۆ چوونی چیـە لەسـەریان. ئـەو رای چۆنە و ئەنجام چیە. بەو جۆرە خۆی نیشانی ئیمە دەدا، کە نایـەوێ راسـتیەکانمان لیبشاریتەوە. هەر چـەندە، ئـەو پیـاوە لـەوە دەگەیشـت کـە مـن چـی دەلیـم، بـەڵام لـەو بروایەدا نەبووم کە ئەویش بە تەواوی لە ئازار و ژان و ئەو چەند ساڵانەی ژیانمان لەو گوندانـەدا تیبگـا. ئـەو نـەیدەزانی کـە بۆچـی ئیمـــە دەمانــەوێ بــەرەو وڵاتــی خۆمــان بگەرییـنەوە و هیندەش سوورین لەسەر گەرانەوەمان. بەڵام دەنگدانەوەی کارەساتەکە و هاتنمان بۆ ئەم شارە، خۆی لە خۆیدا پاریزگاری کردنمان بـوو، لـە زۆری "ئەبدولکـەدا" و ئەوانی تریش. ئیستا چی دی ئەو پیاوانە ناتوانن هیچ شتیکی نابـەجێ بەرامبـەرمان بکـەن. بـە کورتیەکـەی دەسـەڵاتیان بەسـەرمانەوە نــەما بــوو، نــەیاندەتوانی هیچمــان لیبکەن و بریارمان بەسەردا بسەپینن. بەو شیوەیە ئیستا مەترسی ژیانمان لەسەر نیە. کەس ناتوانێ هیچ کاریکی ناهەموار بەرامبەرمان بکا، تا ئەو کاتەی کە "ئـەبدولوەلی"

بریاردەر بێ. بە لایەنی کەمەوە ئەم پیاوە خاوەن دەسەڵاتە و لیمان بەرپرسیارە. من ئەوەم دەزانی کە ئەم پیاوەش دەولەت رایسپاردووە، ئەمەی کە دەیکا بریاری کەسی خۆی نیە ئەمیش ناتوانێ بریار لەسەر چارەنووسمان بدا.

ئەو پیاوە چەند نووسراویکی بۆ هینایین، پییگوتین،"پیویستە کە پەنجەمۆری ئەم نووسراوانە بکەن، دوای ئەوە دەتوانن مندالەکانتان وەرگرنەوە."

ئیمە ئەو کارەمان کرد، ئەو نوسراوانە بە شیوەیەکی فەرمی بە ناونیشانی خۆیەوە هاتبوون، لە نووسراوەکاندا ئاوا نووسرا بوو، "کە ئیمە بە شیوەیەکی فەرمی شوومان بەو کورانە کردووە و لە تەکیاندا بەختیارین. ئیستاش لە شاری "تایز" دەژین و هەموو گرفت و ئاستەنگێ کە لەوەو بەر هەمان بوو، هەمووی چارەسەرکراون."

"ئەبدولوەلی" ئەو نووسراوانەی خستە بەر دەستمان، ئیمەش بە دەستی خۆمان پەنجەمۆرمان کردن. ئەویش گوتی:"بەو شیوەیە لە کۆتایی ئەم هەفتەیەدا مندالەکانتان وەردەگرنەوە."

پیش ئەوەی کە ئیمە بروامان بە یەکیکی تر هەبێ، بروامان بە "ئەبدولوەلی" هەبوو لەبەر ئەوە ئەو نووسراوانەمان پەنجەمۆر کرد، بۆ ئەوەی کە زارۆکەکانمان وەرگرینەوە.

ئیمە لەو ماوەی ئەو چەند رۆژەدا بە ناچاری لە مالی ئەو پیاوە ماینەوە، بەڵام دەمانتوانی بەناو خانووەکە و ژوورەکاندا بگەرییین و بچینە سەربان و هەندیك هەوای پاك هەلمژین. ئەوەی کە لە هەموو شتێ بۆ ئیمە گرنگتر بوو، ئەوە بوو، کە من و "نادیا" دەمانویست پیکڤە بین. ئیمە گویمان بەوە نەدا کە لەوەوبەر دیل و کۆیلە بووین.

لەناو ئەم خانووەدا چیشتخانەیەکی گەورەیان هەبوو، لە هەموو جۆرە ئامیریکی مۆدیرنی تیدا بوو، وەك بەستەلۆك، کەوانتیر، مەکینەی دەفرشتن، مەکینەی هەویرشیلان. ئەو شتانەی کە لەو ماوەی هەفت سالی رابردوودا نەمان دیتبوون، لەو کاتەوە کە لە ئینگلاند دەرچوو بووین.

هەندیك ئەفسەری پۆلیس هەبوون، هەریەکەیان لەگەڵ چەند پۆلیسیکدا بەو ناوەدا بلاوببوونەوە، یان لەو ژوورانە دادەنیشتن کە بەسەر باخچەی خانووەکەدا دەیانروانی. ئەم ئەفسەر و پۆلیسانە زۆربەیان دەمانچەیان بە بەرکەوە بوو، یان تفەنگ لە شان بوون. کاتێ ئەم پۆلیسانەمان دەبینی، بە کۆمەڵ لە سەربانەکە رادەوەستان، کاتێ کە گویمان لە دەنگیان دەبوو، فرەتر هەستمان بە ئازادی و دلخۆشی و ئاوەدانی دەکرد.

بۆ رۆژی چوارەم لە ژوورەوە دانیشتبووین، لە نیو خۆماندا ئاخافتنمان گەرم بوو، لەو کاتەدا "ئەبدولوەلی" لە ناکاودا خۆیکرد بەژووردا،

بە دەنگیکی لەسەرخۆ گوتی:"ئەوە زارۆکەکانتان."

کاتێ کە چاومان بە مندالەکانمان کەوت، بە دوو چاوی خۆمان بروامان نەدەکرد. مندالەکان لەگەڵ کورەکە و کچەکەی "ئەبدولنور"دا هاتبوون.

ئەوان هەرسیکیان پیویست بوو، هەر ئەو رۆژە بەرەو گوند بگەرینەوە، بەلام "مارکۆس"،"هانی" و "تینا" یان بۆ جیهیشتین، بە گەیشتنی مندالەکانمان یەکدڵ بووینەوە.

"مارکۆس" تازە فیری دارەدارە ببوو، دەستبەجێ هەلم گرت و لە ئامیزم گرت. ئەوان پییانگوتم:"لەو کاتەوەی کە تۆ بەجیت هیشتووە لە گریان بەو لاوە هیچی تری نەکردووە."

# بەشی شازدە

## لەناو شاردا

چەند رۆژێك دوای ئەوە، "ئەبدوڵاو مهەمەد" ئەو دوو کورەی کە بە ناو پیاوەکانمان بوون، بە فەرمانی دەسەڵاتدارانی دەولەت لە "سەئودی"ەوە بۆ شاری "تایز" گەراندرانەوە، بۆ ئەوەی لە گۆرانکاریەکان ئاگادار بکرینەوە. "ئەبدولوەلی" لە گەراندنەوەی ئەوان ئاگاداری کردینەوە. بەڵام پیی نەگوتین کە کام رۆژ یان چ کاتیك دەگەرینەوە. رۆژێك ئیمە لە ژووری ژنان دانیشتبووین. "ئەبدولوەلی" بۆ لامان هات و گوتی: "پیاوەکانتان لیرەن و لە ژوورەکەی ئەو دیون، دەتانەویت بین بچین بۆ لایان و بیانبینن..؟"

ئیمە بە خواستی خۆمان ئەو داخوازییەمان پەسەند کرد. کاتیك کە چووین، هەردووکیان دانیشتبوون. خەم بە روویانەوە دیار بوو. ماوەیەك بە هیمنی و بیدەنگی لە تەکیاندا دانیشتین. دوای ئەوە "ئەبدولوەلی" هەر چوارمانی بە تەنیا جیهیشت. "مهەمەد" تیکسمراو و گەورە ببوو، بەڵام "ئەبدوڵا" هەر وەکو پیشوو، زەرد و لاواز بوو.

"مهەمەد" پرسیاری کرد گوتی: "ئیمە هەموو ئەو شتانەمان بیستووە، ئاگاداری ئەوەین، کە رۆژنامەکان لە "ئنگلاند" چیان نووسیووە. ئاگاداری ئەوەشین، کە دایکتان بۆ ئیرە هاتووە. ئیستا ئیوە چیتان دەویت..؟"

لەبەر ئەوەی کە دلنیا ببووم، پیویستی بەوە نەدەکرد، کە چیدی شتەکان بشارمەوە. بروام بەو بەلینەی "ئەبدولوەلی" دەکرد، کە گوتی: "ئیوە جاریکی دی بۆ

ناو ئەو گوندانە ناگەرینەوە." بەو شێوەیە ترسم نەمابوو، هەموو شتەکانم بۆ شیکردنەوە و گوتم: "دایکم هەموو شتێك دەکات لە پێناوی ئەوەدا، کە ئیمە لەم وڵاتە دەرباز کات، ئیوە و باوکیشتان، کاری نابەجێتان بەرامبەر بە ئیمە کردووە. ئیمە هەرگیز ئەوە پەسەند ناکەین و ریزی لیناگرین. ئەوە شتەکانە و ئاوایە."

"ئەبدوڵا" دانیشتبوو، هیچی نەدەگوت و بێدەنگ بوو. کاتێك کە "ئەبدولوەلی" بۆ لامان گەرایەوە، کورەکان پرسیاری ئەوەیان لە "ئەبدولوەلی" کرد: "ئایا دەتوانین ئەو تەلەفۆنە بەکار بهێنین..؟"

"ئەبدولوەلی، وەڵامی دانەوە. "ئا دەتوانن."

ئەوان تەلەفۆنی "ئنگلاند" و "سەئودی" یان بۆ "جەواد و ئەبدولکەدا" کرد. ئەو دوو باوکە بە کورەکانیان گوت: "نابێت دەست لە ژنەکانتان هەلگرن و جیاببنەوە، نابێت بە هیچ شێوەیەك دەست لە منداڵەکان هەلگرن، نابێت ریگای ئەوەش بە ژنەکانتان بدەن بۆ "ئنگلاند" بگەرینەوە، با ئابروومان نەچێ." ئەو دوو باوکە فەرمانیان بە کورەکانیاندا." دەتوانن لەسەر ئەوە لەگەڵ ژنەکانتان ریککەون و لە شاری "تایز" بژین. تا ئەو دەمەی کە ژنەکانتان و منداڵەکانتان لە تەکتاندا دەژین."

کورانی "ئارەب" هەمیشە جلەویان لە ژێر دەستی باوکیاندایە. لەبەر ئەوە، ئەو دوو کورە نەیانتوانی لەو فەرمانانە دەرچن کە باوکەکانیان دایان بەسەریاندا، تەنانەت بۆیان نەبوو، لە بارەی شتێکی تر و ئالتەر نەتیڤیکی ترەوە بدوین.

ئیستا خۆرزگارکردن و دەرباز بوونمان نا ئارامیەکی نویی بە خۆیەوە گرت. ئیستا ئیمە بووین بە چەند کەسێك و زۆر بووین، نەماندەتوانی لە ماڵەکەی "ئەبدولوەلی" بمینینەوە. لەبەر ئەو هۆیە "ئەبدولوەلی" خانوویەکی بۆ بەکرێ گرتین، بە تاکسی نزیکەی پێنج خولەکێك لە ماڵی "ئەبدولوەلی"وە دوور بوو. ئیمە هەر چوارمان لەگەڵ منداڵەکاندا بۆ ئەو خانووە گواستمانەوە. ئەو کاتە گوێم بەوە نەدەدا کە لە کوێ دەژیم، تەنیا ئەوەندەم بەس بوو، کە لەگەڵ "نادیا" و منداڵەکانماندا پێکەوە بژین و بۆ "هۆکایل" نەگەرێینەوە. من دەمزانی تاکو ئەو دەمەی کە لە "تایز" بمینینەوە

پەیوەندیمان بە "ئەبدولوەلی"ەوە دەبێت و دەتوانین لە هەوڵ و کۆششدا بین، تا ئەو دەمەی خۆمان رزگار دەکەین.

خانووەکەمان لە گەڕەکێکی ئاسایی شاردا بوو، خانوویەکی سێ نهۆمی و کەوتبووە ناو کۆڵانێکی بەر تەسکەوە، ئیمە لە نهۆمی دووەمی خانووەکەدا دەژیاین. هۆڵیکی گەورەمان هەبوو، دوو ژووری خەوتن، دەرگای ژوورەکان کەوتبوونە سەر هۆڵەکە. هەروەها گەرماو و چیشتخانەشی تیدابوو، بالکۆنیکیش بەسەر کۆڵاندا دەیروانی.

من و "نادیا" دەمانزانی، کە دەبیت و زۆرە لە سەرمان لە باخەلی بە ناو میردەکانماندا بخەوین و سیکس بکەین. لەوە بەو لاوە هیچ چارەیەکمان نەبوو. هەرچەندە لە شاردا دەژیاین، بەلام یاسای ژن و میردایەتی و بریارەکان هەر هەمان شت بوون. دەمزانی کە ئەم ماوەیەش بەسەر دەچیت، لەبەر ئەوە نەمدەویست نائارامی و کیشمەکیش لە نیوانماندا بەرپا بکەم. "مارکۆس" لەگەڵ باوکیدا لە ژووریکدا دەخەوتن. من و "نادیا" و مندالەکان و "مەهەمەد"یش لە ژووریکدا.

ئەو کورانە پیخەفی نووستنەکانیان لە گوندەوە هینابوو، لەسەر زەویە چیمەنتۆ کراوەکەی ناو ژوورەکان بۆ خەوتن رامان دەخستن، خانووەکە هیچ جۆرە مۆبیلەیەکی تری تیدا نەبوو، تەنیا TV یەك نەبیت، بە ئەلەتریك کاری دەکرد. من "تیپ"ە (تەسجیل) کۆنەکەم هەر مابوو، جاروبار کاسیتیکم پیلیدەدا. لە چیشتخانەکەشدا کەوانتەریك و تەباخیکی بچکۆلەی گاز و رەفەیەکی تیدا بوو. هەروەها گەرماویك بە بێ ئاوی گەرم. ئەو شتانەی کە پیویست بوون هەمان بوون. من بەوە گەلیك کامەران بووم، کە هەموو رۆژەکانمان لەگەڵ "نادیا" پیکەوە بەسەر دەبرد. هەرچەندە ژیانیکی هەژارانە بوو، ئەگەر لەگەڵ ژیانی رۆژانی رابردووی "ئنگلاند" بەراوردمان بکردایە، بەلام وەکو خەویك وابوو، ئەگەر بە ژیانی گوند و هەریمی "مۆکبانە" بەراورد بکرایە. ژیانیکی گەلیك خۆش بوو، بە خەمی ئەوەوە نەبووین، کە هەر لە کازیوەی بەیانیەوە تا بوولیلەی ئیوارێ کار بکەین، رۆژانە کەی بمانخواستایە لە خەو هەلدەستاین، یان خۆمان لیپان دەکردەوە تا نیوەرۆژیکی درەنگ.

ئەو دوو کورە هەر وەکو جاران چۆن بوون، لێرەش هەر بەو شێوەیە لییان دەخوری. هەر لە بەیانی زووەوە دەچوونە دەرەوە. ئێمە هەرگیز پرسیارمان لێنەدەکردن و گوێمان نەدەدانێ، بەلامانەوە گرنگ نەبوو کەچی دەکەن و بۆ کوێ دەچن. من و "نادیا" بەوە دلشاد بووین، کە ئەو پیاوانە بە تەنیا جێیان دەهێشتین.

"مهەمەد"ی برای "ئەبدوڵا" و "بەکالە" و منداڵەکانی، تا ئەو دەمەش هەر لە شاری "تایز" دەژیان. "بەکالە" هەندێك جار دەهات و سەردانی دەکردین.

هەر لەو دەمەوە کە کێشەکەمان کەوتە دەستی دەولەت، ئیتر کەس لە بارەی گرفتەکانمانەوە پرسیاریان نەدەکرد. ئێمە نەماندەویست باسی رابردوومان بکەین، ئێستا لە خەمی داهاتوودا بووین، کە کێشەکەمان بەرەو کوێ دەچێت. من و "نادیا" هەولماندا دان بە خۆماندا بگرین، ئەو پرسیارانە لە مێشکمان دەرکەین.

لە سەرەتاوە ئێمە زۆر نەدەچووینە دەرەوە. هەستمان بە ترس، لە مرۆڤەکان، ڕێگاکان، ئۆتۆمۆبیلەکان، لە هەموو شتێك دەکرد، لە ماوەی هەفت سالی رابردوودا ژیانێکی کۆیلەیەتیمان بەسەر بردبوو. ئەو کاتانەش کە بۆ هەلخستنی جلوبەرگە شۆراوەکانمان دەچووینە بالکۆنەکەوە، سەرپۆشمان دەبەست، نەکا یەکێك لە شوێنێکەوە لە پەنجەرەیەکەوە بمانبینن. ئێمە کوتومت وەکو ژنە گوندیەکانمان لێهات بوو، بروامان بە خۆمان نەدەکرد، لەو دنیا گەورەیە دەسلەمینەوە و دەترساین. ئێمە ئەوەمان لە بیر چووبۆوە کە مرۆڤ چۆن هەلسوکەوت دەکات. ئەمانە هەموو ئەنجامی ئەو زۆرداری و کۆیلەیەتیەی ئەو سالانە بوو، ئێمە لە ئازادی خۆمان دەترساین.

پیاوەکان، کاتێك بۆ مالەوە دەهاتنەوە، لەگەڵ خۆیاندا خواردن و کەلوپەلی پێویستیان دەهێنایەوە، ئێمەش لە کونجی ژوورەوە خزا بووین.

پیاوەکان جاروبار بۆ "گات" جووین بۆ مالی "ئەبدولوەلی" دەچوون، ئێمەش لەگەلیاندا بە تاکسی دەرۆیشتین. لەوێ لە ژووری ژنان دادەنیشتین و چاومان بەو ژنانە دەکەوت کە سەردانی ئەوییان دەکرد و لەگەڵ ئەو ژنانەدا کاتمان بەسەر دەبرد. "ئەبدولوەلی" هەرگیز سەردانی ئەو خانووەی نەکردین کە بەکریمان گرتبوو.

منداڵەکانمان هەستیان بە خۆشی دەکرد و دەم بـە پیکەنین بـوون، لەبـەر ئـەوەی کە هەمیشە لەگـەڵ خۆمـاندا بـوون و لـە نزیکیانـەوە بوویـن. هـەر کـاتیك کـە مـن یـان "نادیـا" کاریکمـان دەبـوو، لـە تـەکیاندا نـەدەبووین دەسـتیان بـــە گریـان دەکـرد و بــە شوینماندا دەگەران. ئەو منداڵانە هیندە ترسا بوون، وایـان دەزانـی کـە جـاریکی تـریـش جییان دەهیلینەوە.

"هانی" لە هەموویان خراپتر بوو، هەر کە "نادیا" دەیویست بـە کـاریك هەسـتێ، خۆی بە دایکیـدا هـەلدەزنا و بـەری نـەدەدا. گـەر بـۆ وچـانیك "نادیـا" دیـار نەبووایـە، دەستی بە گریان دەکرد و پرسیاری دەکرد، دەیگوت: "کوا دایکـم..؟ دایکـم لـە کوییـە... دایکـم بـۆ کـوێ چـوو..؟" کـاتیکیش کـە ئیمـە لەگـەلیاندا دەبوویـن، بـە وازی کردنـــەوە خەریك بوون.

دەربارەی دایکم لە "ئنگلاند" هەمان پەژارەی ئیمەی هەبوو، وەك چـۆن ئیمـە لـە شـاری "تـایز" هـەمان بـوو. بـەلام "ئـالف دیکیـس" پـەیوەندی نیـوان دایکـم و "دایلـی مایل"ی دروستکردبوو. دایکم گەیشتبووە ئەو راستیەی کـە "دایلـی مـایل" دەیـەوێ بـۆ بـەرژەوەندی خـۆی دایکـم بـەکار بینـێ. خـــۆی بکاتــە خـاوەنی ئـەو هـەموو هـەوڵ و کۆششەی کە کرا بوو، لە هەمان کاتدا کیبەرکێ لەگـەڵ "ئیلیـن و بیـن"دا بکـات. دایکـم کە ئەو راستیە دەزانیت جاریکی تـر بـەلای "ئیلیـن"دا بادەداتـەوە. لـە رۆژی کرسمسـدا سەردانی مالەوەمان دەکات. ئەوان لە شاری "لـەندەن" دەژیـان. پاشـان دایکـم بـە راویـژ سەرگیژ دەکەن.

لە لایەکی تریشەوە بالیۆزی "یەمەن"ی لە "لەندەن" لە چاوپیکەوتنیکدا دەلیـت: "من ئیستا بە باشی لە کیشەی ئەو دوو کچە گەیشتووم، کە بەم شیوەیەیە. کاتی خـۆی "نادیا" و "زانا" لە "بیرمینگهام" ئەو کورانەیان بینیوەو بـە خواسـتی خۆیـان شـوویان بەو کورانە کردو وە. ئیستاش ئەو کچانە بۆ ولاتی "یەمەن" بۆ لای ئەو کورانـە چـوون، بۆ ئەوەی لەوێ ژیانی ژن و میردایەتی بەسەر بەرن. "بـالیۆز، ئەوەشـی گوتبـوو: "ئـەم شتەش کە ئاوا کراوەتە گیروگرفت، لەو کاتـەوە دەسـتی پیکـردووە، کـە دایکـی ئـەو دوو کچە، باوکی کچەکانی جیهیشتووە و جیابۆتەوە."

ئەم واتە وات و بوختانە پروپوچانە لـە میشـکی باوکمـەوە چاوگیـان گرتبـوو، بـێ بناغـە و لەراسـتیەوە دوور بـوون. لەگـەڵ ئـەو گوتانـەدا یـەکی نەدەگرتـەوە کـە بـاوکم لەوەوبەر بە ڕۆژنامەوانەکانی گوت بوو و کە دەڵێ: " "نادیا و زانا" بۆ پشووی هاوینـە بـۆ "یەمـەن" چـوون و ئـەو کورانـەیان بینیـوە، بـە نـەهینی و بـەدزی منـەوە شـوویان پیکردوون." هەروەها بالیۆزی "یەمەن"ی لە بڵاوکراوەیـەکدا ئـەوەی گوتبـوو: "ئەگـەر دایکی ئەو دوو کچە دەخوازیت، دەکـاریت بـۆ "یەمـەن" بچیـت و گـیروگرفتی کچـەکانی چارەسـەر بکـات، لـە لایـەن دەولـەتی "یەمــەن"ی و کاربەدەسـتانەوە هـەموو جـۆرە یارمەتیەکی بۆ دەرەخسینین، تاکو بتوانیت کچەکانی لەگەڵ خۆیدا بهینیتەوە."

لە شاری "تایز" ژیان بەردەوام بوو، هەر بەوە دەچوو کە هیچ ئالوگۆڕیەك بەسەر کیشەکەماندا نەهاتبێ. ژیانیکی ڕۆتینـی بـوو، جاروبـار دەچووینـە دەرەوە، چاومـان بـە خەلکی دەکەوت و لە تەکیاندا دەدوایـن، تـەنیا لەبـەر ئـەوەی کـە کاتمـان لیـبڕوات. ئـەم ژیانە لە کات کوشتن بەولاوە هیچی تر نـەبوو. لـە دەرەوە چاومـان بـە ژنـان دەکـەوت و گفتوگۆمان لەگەلیاندا دەکرد، کاتیك کە خۆمان لـە تـەك ئـەو ژنانـەدا بـەراورد دەکـرد، جوداییـەکی زۆر لـە نیوانمـاندا هـەبوو، ئیمـە بـە ژیـانی ژنـە گونـدی ڕاهـاتبووین، ئـــەو ژنانـەی کـە لـە ناوشـار دەمـانبینین و لـە تـەکیاندا وتوویژمـان دەکـرد، بـە جلوبـەرگی مۆدیرنـەوە لـە تـەك میردەکانیـاندا بـۆ نـاو بـازار دەهـاتن. هەمیشـە ئـەم ژنانـە پییـان دەگوتـین بـا پـەیوەندی و هاتوچۆمـان هـەبیت و سـەردانیان بکـەین. لەسـەر ئـەم ژنانـە پیویسـت نـەبوو کـە ڕۆژانـە لـە ژیـر ئـەرکی ئاوکیشـان و گـەنم هـاریندا بچەوسـینەوە. ئەمانە خۆیان بڕیاریان لەسەر بەرنامەی ژیانی خۆیان دەدا، دەیـانتوانی سـواری تاکسـی ببن، بەبێ سەرپۆش دەسوورانەوە، سەردانی مالـە خـزم و هاورییـان دەکـرد. بـەڵام ئـەم ژیانە لە گوندا پیچەوانە بوو. لە نـاو گونـد کـاتیك کەسـیك سـەردانی مـن و "وەردە"ی دەکرد، تەنیا بۆ وچانیکی کەم دەمتوانی دەست لە کار هەلگرم و لای میوانەکە دانیشم.

زۆر لەو ژنانەی کە دەمانبینین ئـارەزووی ئـەوەیان دەکـرد، لـە بەسـەرهاتی ژیـانی ئیمـە بزانـن. بـەڵام بـەوە دەچـوو بـەو ژنانـە ڕاگەیـەندرا بـێ، کـە لـەو بارەیـەوە ئـەو پرسیارانەمان لینەکەن. کە کەسیك ئەو جۆرە پرسیارانەی لیدەکردم، گـەلیك نائـارام و

شیتگیر دەبووم. لەبەر ئەوە ئەو کەسانە توخنی ئەو جۆرە پرسیارانە نەدەکەوتن. جاروبار ئەو پرسیارەیان لیدەکردم،" دەخوازن بۆ "ئنگلاند" بگەرینەوە. یان دایکم دیت لە تەك خۆیدا بمانباتەوە.؟"

منیش بەم شیوەیە وەلامم دەدانەوە، دەمگوت: "ئەوە پەیوەندی بە ئیوەوە نیە." ئەو ژنانە زۆربەیان بەریز و باش بوون.

ئیمە هەستمان دەکرد، کە تەندروستیمان بەرەو باشی دەچیت، لە رووی دەروونیەوە لە هەلچوون و داچووندا باشتر بووم، بە وینەی جارانیش ماندوو نەبووم.

من هەمیشە لە بیری تەلەفۆنی ناو ژوورەکەی "ئەبدولوەلی"دا بووم، بەلام هەرگیز نەمدەویرا و شەرمم دەکرد کە داخوازی ئەو تەلەفۆنە بکەم و بەکاری بینم و لەتەك دایکمدا بپەیقم. رۆژیکیان لەوە دەچوو کە یەکیکی گەورە لە کاربەدەستانی دەولەت بە "ئەبدولوەلی"ی گوتبیّ، کە ریگامان بدات تەلەفۆن بۆ دایکمان بکەین. ئەوان مەبەستیان ئەوە بوو، کە بە دایکم رابگەیەنین، لەو کاتەوەی کە لە شار دەژین و ئەو گوندانەمان جیهیشتووە ژیانمان بە باشی گۆراوە. ئەو دەسەلاتدارانە ئەوەیان دەخواست ئیمە بە دایکمان راگەیەنین، کە ئیستا لە ژیانیکی فەنتازیداین. ئەو کاتە ئەویش دەست لەو کۆشش و هەلپەیە هەلدەگریت، ئەو ئاگری شەرە دەکوژینیتەوە و پەیوەندی بە رۆژنامەوان و رۆژنامەکانەوە ناکات. ئەوە خەوە، نەیخۆن تالە، دەرباز بوونمان نزیکە و دەبیّ ببیّ. من بە کولو جۆشەوە چاوەروانی ئەو جیهیشتنە بووم. بە "ئەبدولوەلی" و ئەوانی تریشم دەگوت، کە ئیمە لیرە تەندروستیمان باشتر و دلشادترین. ئەو چەکەی ئەوان بەرامبەر بە ئیمە بەکاریان دەهینا، ئیمە هەمان چەکەکانی خۆیانمان بەرامبەریان بەکار دەهینایەوە، هەمان داربەدارمان دەکرد. ئیمەش هەمان درۆمان بۆ دەکردنەوە، وەکو ئەو درۆیانەی کە ئەوان بۆیان دەکردین. ئەوان ئاواتخوازی ئەوە بوون کە ئیتر درۆمان بۆ نەکەن. لەبەر ئەوە چاکیان دەزانی کە رۆنی خۆیان دەدەینەوە لە سمیلی خۆیان، بەلام جامی ئیمە پر بوو لیی دەرژا. ئیمە بە کۆشش کردنمان توانیمان خۆ لە هەریمی "مۆکبانە" و گوندەکانی دەرباز کەین، زۆر بەهیوا بووم کە ئەو کەسانە وا بزانن و وا تیبگەن کە تەلەفۆن کردنمان دەبیتە هۆی کۆلدانمان و واز لە جیهیشتنی

"یەمەن" دینین، بەلام ئەوە هەرگیز لە بیری ئیمەدا نەبوو کە بە دایکمان بیژین دەست لە کۆشش و کار هەلگریت و دەربازمان نەکات.

بۆ یەکەمجار کە تەلەفۆنم کرد، "ئاشیا"ی خوشکم وەلامی تەلەفۆنەکەی دایەوە، ئەو بڕوای نەدەکرد کە ئەوە راستە و لەگەڵ مندا دەدوێ، ئەوەندە نادلنیا بوو، دەربارەی سالانی زوو پرسیاری لیدەکردم، بۆ ئەوەی کە دلنیا بیت و بزانێ منم.. ئایا دەتوانم وەلامی پرسیارەکانی بەراستی بدەمەوە. پاشان دایکمی بانگ کرد. هەندیك پیکڤە پەیڤین، دایکم گوتی: "دەیەویت سەردانمان بکات".

چەند هەفتەیەك دوای ئەو تەلەفۆنە، ئاگادار کراینەوە، کە لە "ئنگلاند"ەوە تەلەفۆنیکمان بۆ کراوە. ئیمەش بەرەو مالی "ئەبدولوەلی" بەریکەوتین. ماوەیەکی کورتی برد دایکم تەلەفۆنی کرد، بۆ ئەوەی هەوالمان بزانێ و پیمان راگەیەنیت کە دڵ لە دڵ نەدەین، ئیستا هەندیك شت روویانداوە. هەروەها گوتی: "نیازم وابوو کە بۆ "تایز" بیم و سەردانتان بکەم."

من بە تەنیا لەگەڵ دایکمدا پەیڤیم. "نادیا" شەرمی دەکرد بپەیڤێ.

دایکم لە وتەکانیدا گوتی: "هاورییەکم لیرەیە سلاوت لیدەکات، دەیەویت لە تەکدا ئاخافتن بکات، ئەو کورە ناوی "تۆماس"ە.

بە تەواوی بەو هەوالە تاس بردمیەوە. تەنیا ئەوەندەم گوت: "ئاوا...!" بە دلخۆشیەوە لەگەڵ ئەوەدا بووم کە دایکم دەیویست.

چاوەروانی "تۆماس"م دەکرد، پاشان "تۆماس" هات و تەلەفۆنەکەی هەلگرت، ئەو کاتە نەمدەزانی کە ئەو کورە کییە. بەلام دوایی زانیم کە راپۆرتوانی رادیۆی ناوچەی "بیرمینگهام" بوو. ئەو کورە، ئەو وتوویژەی بە زیندوویەتی، یەکسەری دابوو، بە رادیۆ و بلاوی کردبۆوە. بەلام ئەو کاتە ئەوان بە منیان رانەگەیاند، کە پلانیکی وایان بە دەستەوەیە و یەکسەری دەنگم خراوەتە سەر رادیۆ و هەر ئەو ساتە ئەو گفتوگۆیە بۆ بیسەرانی رادیۆکە بلاو دەکریتەوە. ئەوان بۆیە ئەوەیان پینەگوتم، بیریان لەوە کردبۆوە کە نەکا لە "یەمەن"ەوە هیلی تەلەفۆنەکە ببڕن. لەبەر ئەوەی کە لە "یەمەن" گوێ لە تەلەفۆنی هەموو کەسیك دەگیریت و سانسۆر لەسەر هەموو شتیکە.

ئەو راپۆرتوانە بەوە دەستی پیکرد، گوتی: " "زانا" چۆنی..؟"

لەبەر ئەوەی ئەو پیاوەم نەدەناسی، بە کورتی وەلامم دایەوە، گوتم: "باشم."

"زانا" ئیستاش لەسەر گەرانەوەت بۆ "بیرمینگهام" سووری دەتەوێ بگەرییتەوە...؟"

من وەلامم دایەوە گوتم: "ئا من دەمەویت بە زووترین کات بگەریمەوە."

"تۆ زۆرتر بیر لە چی دەکەیتەوە..؟"

وەلامم دایەوە" بەزۆری بیر لە هاوریکانم دەکەمەوە."

پاش ئەوەی کە چەندان پرسیاری تری لیکردم، تەلەفۆنەکەی دایەوە دەست دایکم، کە پیکڤە بپەیڤین.

ماوەیەکی پیچوو، باوکم تەلەفۆنی کرد، ماوەی یەك کاژمیر پیکەوە پەیڤین. ئەو داوای لیکردین کە نەگەرییینەوە، لەبەر ئەوەی لە شەرماندا دەمرێ. هەمیشە دووبارەی دەکردەوە، دەیگوت: "ئەگەر منتان خۆش دەویت ناگەرینەوە." بەلام ئەو چاکی دەزانی کە ئیمە خۆشمان ناویت. داوای لیدەکردین کە لە شاری "تایز" بمینینەوە تا ئەو کاتەی کە رۆژنامەوان و رۆژنامەکان هەموو چیرۆکەکەیان لە بیر دەچیتەوە.

گوتم: "دەبیت تۆ بەختت لە ئاسمان یاری بکات، تا ئەو خەوەت بیتە دی."

ئەو گوتی: "ئەگەر بیت و بگەرینەوە خۆم دەکوژم و گیانی خۆم دەکیشم."

منیش پیم گوت: "باشە وا بکە."

ئەو ماوەیەی کە لە "تایز" بووین بە بەردەوامی هەوالمان دەزانی، کە لە رۆژنامەکانی "بەریتانیا"دا، راپۆرت و نووسین لە بارەی ئیمەوە بلاو دەبنەوە، سات دوای سات ئاستەنگ بۆ کاربەدەستانی "یەمەن"ی دیتە پیشێ. "ئەبدولوەلی" بە سەروچاویدا دیار بوو، کە نائارامە. هۆکەشی ئەوە بوو، ئەو هەول و کۆششەی کە ئەو بۆ دامرکاندنەوەی شتەکە خستبوویە گەر، بۆی ببووە جیگای نیگەرانی، کە ناتوانیت دەست بەسەر رووداوەکاندا بگریت و بیانگۆرێ.

من و "نادیا" و "ئەبدولوەلی" هەمیشە دەربارەی رۆژنامە بیانیەکان، کە لە بارەی ئیمەوە هەوالەکانیان دەنووسی، ئاخافتنمان دەکرد. "ئەبدولوەلی" زۆر هەولی دەدا بەوە

رازی بین کە ئیستا هەمانە. لە هەمان کاتدا دایکم ئاگادار بکەینەوە کە واز لەو هەوڵ و کۆششانە بینێ. بەڵام من لە بارەی ئەو هەواڵانەوە هەمیشە بە "ئەبدولوەلی"م دەگوت: "ئەو رۆژنامانــە راسـت دەبیـژن و ئـەو نووسـراوانە هـەموویان راسـتی بـێ گریوگۆلـن." کـاتیك کـە مـن ئـەم شـتانەم دەگوت، "ئـەبدولوەلی" بـە ناچـاری بیدەنـگ دەبـوو، هیـــچ شتیکی پینەبوو کە بیلێ.

جاریکیــان "ئــەبدولوەلی" "مــارەبرین نامــە"کــەی (مـــن و ئـــەبدولا و نادیـــا و مهەمـەد)ی نیشـاندام کـە بـە "ئـارەب"ی نووسـرا بـوو، ئـەو کاتـە دەمتوانـــی بـــە باشـــی "ئــارەب"ی بخوینمــەوە، پــاش ئــەوەی کــە خویندمـــەوە، ویســـتم تیبگـــەم کـــە چـــی نووسراوە.لەبەر ئەوە "ئەبدولوەلی" ئەو "مارەبرنامە"ی نیشاندام کە پیمان بلێ: "ئــەو شووکردنەی من و "نادیا" شووکردنیکی یاساییە.

من پیم گوت: "ئەو "مارەبرنامە"یە یاسایی نیـە. مـن "قورئـان"م خویندۆتـەوە، دەزانم کـە لـە "قورئـان"دا ئـاوا نووسـراوە، مـارەبرینی کچیـك و بـــە زۆر بـــە شـــوودانی کاریکی ناپەسەندە. لەبەر ئەوە ئەو نووسـراوە بـە پیـی گوتـەی "قورئـان" ناپەسـەند و نایاساییە."

لەگەڵ ئەوەشدا کە من و "نادیا" ئەوەمان دەزانی "ئەبدولوەلی" فەرمانی پیکراوە، کـە بەوکیشـەیەی ئیمـەوە خـەریك بیـت، ئیمـە وا سـەیری ئـەو پیاوەمـان دەکـرد، کـە یارمەتیدەر و رزگارکارمان بیت. لەراستیدا هەر ئەویش بوو کە بە پراکتیك ئیمـەی لـە ژیانی ناو گوند دەرباز کرد. ئەو یەکەم پیاویك بوو کە لەگەلیدا دانیشـتین و لـە بـارەی گرفتەکەمانەوە لە تەکیدا دەدووایـن، ئەو پیاوە زۆر بەریزەوە گویـی لیدەگرتـین، لەبـەر ئەوە ئیمەش ریزمان لیدەگرت و لەو رووەوە خۆشمان دەویست.

"ئەبدولوەلی" جگە لەو دوو ژنەی ناو شاری، کە مندالیکی لە گەورەکەیان هـەبوو، ژنیکی تریشی لە گوندەکەی خۆیان هینابوو، لـەو ژنـەش شـەش مندالـی هـەبوو. مـن وا دەزانم کە لە وڵاتی "یەمەن"دا پیاوە دەولەمەندەکان ئەگەر بیانــەویت، دەتوانـن چـەند ژنیکیان هەبیت.

من و "نادیا" لەسەر خۆ خەریك بووین لەگـەڵ دنیـای ریـالدا رادەهاتینـەوە. وردە وردە دەسـتمان کـرد بـە هـاتوچۆ و چوونـە دەرەوە.هــەندیك جـار خۆبــەخۆ لـە تــەك مندالەکانماندا بۆ ناو شـار سـواری تاکسـی دەبوویـن. ئیمـە گەیشـتینە ئـەو رادەیـەی کـە خۆمـان بـۆ بـازار بچـین، خـواردن و جلوبــەرگمان بـۆ منـدالـەکانیش دەکـری. لەگــەڵ ئەمانەشـدا تــاکو ئەوکاتــەش هــەر گریــدراو بوویــن بــەو دابــوو نەریتــە کۆنــەی کــە کردبوویانە بەشیك لە ژیانمـان. بـۆ چوونـە نـاو شـاریش جلوبـەرگی ژنـە "ئـارەب"مـان لەبەر دەکـرد، سـەرپۆشمان دەپیچـا و پەچـەمان دەگرتـەوە. ئیمـە دەمانویسـت نـاو شـار شا رەزا بین و شیوەی ژیانی خەلکەکە فیر بین، ئەوەمان دەزانی کە دەبیت، بۆ ماوەیـەك لەم شارە بمینینەوە و ژیان بەسەر بەرین، تــاکو ئـەو کاتـەی ریگـای دەربـاز بوونمـان بـۆ ئاوەڵا دەبیت. ئەم چوونە ناو شارەشمان یارمەتیـەك بـوو بـۆ ئـەوەی کـە نـەختیك لـەو رەوشە دوور کەوینەوە بەسەرمان هاتبوو. لەراستیدا ئەو شارە نەدەچووە دلمانەوە، ئەو شارە تا بلیی پیس و دلتەنگ بوو. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا مـن و "نادیـا" هەمیشـە بـەوە دلشاد بووین کە ئیستا بەیەکەوەین، سات دوای ساتیش هەستمان دەکـرد کـە ئیمـە ئـەو دووکچە "ئنگلیز"ەی جارانین.

دەستدریژی و کوشتوبر، بەشیك بوو لە ژیانی ئەم وڵاتە، تەنانەت لە شارەکانیشدا زۆر جار رژیم خەلکی ئەو شـارەیان لـە گۆرەپـانی گشـتیدا کۆدەکـردەوە و بـە بـەرچاوی منداڵ و ژنەوە، بەندییەکانیان بەر ریژنەی گوللە دەدا و دەیانکوشتن.

هەر کاتیك کە دەچووین بۆ شوینیك، سەرپۆش و پەچەمان دەگرتەوە، بەو جـۆرە نەیاندەناسینەوەو نەیاندەزانی لە کام شوینین، بە ئاسانی دەمـانتوانی لـە نـاو خـەلکیدا خۆمان ونکەین. ئـەوە بـۆ ئیمـە شـتیکی خـۆش بـوو، کـە دەمـانتوانی بـە ئـازادی بریـار لەسەر هەلسوکەوتمان بدەین، لەبەر ئەوەی لـە مـاوەی ئـەو چـەند سـالەدا کـە لـە گونـد ژیابووین ئەو پیاوانە هەمیشە چاویـان لەسـەرمان بـوو کـە چ دەکـەین و چ ناکـەین، بـۆ کوێ دەچین و بۆ کوێ ناچین.

رۆژیکیان ئیمە لە مالی "ئەبدولوەلی" بووین، سـێ ژن بـۆ ئـەوێ هـاتن، ئـەو ژنانـە بەوە دەچوون کە شتیکیان لە ژیر سەردا بیت، ئەمانە بـۆ ئـەو مەبەسـتە هـاتبوون، کـە

چاویان بە ئیمە بکەویت. ئـەو ژنانـە جودا بـوون لـەو ژنانـەی تـر کـە لەوەوبـەر بینـی بوومانن. لەوە دەچوون مووچەخۆر و خاوەن دەسـەڵات بـن، لـە هـەمان کـاتدا پۆشـتە و پەرداخ و خشڵ و زیریان لە خۆیان دابوو.پەراو و پینووسیان پیبوو. لە کاتی پـەیڤیندا زانیمان کە یەکیك لەو ژنانە سکرتیری پاریزگاری "تایز" بوو. دوو ژنەکـەی تریـش لـە کۆمەلەیەکی ژناندا کاریان دەکرد. ئەم ژنانە بەسەرهاتی ئیمەیان بیست بـوو، بـۆ ئـەوە هاتبوون لە نزیکەوە چاویان بە خۆمان بکەویت و بەسەرهاتەکە بزانن.

سکرتیر گوتی: "پاریزگاری ناردوویەتی کە چاوی بـە ئیمـە بکـەویت و لـە شـتەکە بکۆلیتەوە."

منیش بەو ژنەم گوت: "ئیوە دەتوانن بە پاریزگاری، بیژن کە ئەم شتە پەیوەندی بەوەوە نیە."

ئەو ژنە وەڵامی دامەوە گوتی: "ئیـوە پیویسـت ناکـات بـەو شـیوەیە بـیر بکەنـەوە، ئیمە وەك هاورییەك هاتووین چاومان پیتان بکـەویت. ئیمـە بـۆ ئـەوە نـەهاتووین ئـەو شتانەی کە دەیلین دژی ئیوە بەکاریان بهینین، ئیمە تەنیا ئـەوە دەخوازیـن کـە بزانـین چیتان بەسەر هاتووە، لەبەر ئەوە لەوانەیە ئیمە بتوانین بە شیوەیەکی تر یارمـەتیتان بدەین."

من لەوە تیگەیشتم کە ئەو ژنە مەبەستی لە گوتەکانی چیە، پاشان من و "نادیـا" لە تەکیاندا دانیشتین و لـە سـەرەتاوە و تـا بنـەتا بەسـەرهاتەکەمان بـۆ گیرانـەوە. ئـەو ژنانە کە گوییان بۆ وتەکانمان رادیرا بوو، سەرسامی دایگرتبـوون، هـەر چـەندە خۆیـان خەلکی ئەو وڵاتە بوون، بەڵام ئەو شتانەیان بەلاوە جیگای سەرسـوورمان بـوو، کـە ئـەو جۆرە نا بەرانبەری و چەوساندنەوەیە لە وڵاتەکەیاندا روویداوە. ئەو ژنانە وایـاندەزانی کە گەنم بە دەستهار هارین و ئەو جۆرەکارانە لە سـەردەمی نـەنك و باپیرەیـاندا بـەکار هاتووە و ئەوان کردوویانە، ئەوەیان نـەدەزانی کـە لـە وڵاتەکـەیاندا تـاکو ئیسـتا مـرۆڤ هـەن لـەو ئاسـتە سـەرەتاییەدا دەژیـن. ئیمـە دەربـارەی ئـەوە کـە چـەند لـەم وڵاتـە نابەختەوەرین هیچمان بۆ نەگیرانەوە. پیمان نەگوتن کە دەمانەویت بۆ وڵاتـی خۆمـان

بگەڕیینەوە، ئەوان دەیانویست ئەوەمان بۆ روون بکەنــەوە، کـە ئیسـتا ئیمـەش هـاوڵاتی "یەمەن"ین.

من خۆم بۆ رانەگیرا و گوتم: "ئەوە دەزانم، ئــەوەش دەزانم کـە چیـم دەویـت، مـن دەمەوێ بۆ وڵاتی خۆم بگەڕیمەوە." بەو هیوا و ئاواتەوە بووم ئەو کەسـانە وا مـاندو و وەڕس کەم، بۆ ئەوەی لە کۆتاییدا ئەوە چاك بزانن و ریز لە هەلویست و داخوازییەکەم بگـرن. مـن دەمویسـت کـە ئـەوەیان بـۆ دووپـات بکەمـەوە کـە نـەك ئـەوان بـەلکو هیــچ هیزیك نیە وا لە من بکات و کۆلم پیبدات کە واز لـە ئامـانج و خواسـتی خـۆم بینـم و لەم وڵاتەدا بمینمەوە.

ئـەو سـێ ژنـەش هـەر بـە هـەمان شـیوەی "ئــەبدولوەلی" لــە لایــەن کەسـانیکەوە راسـپیردرا بـوون، کـە هـەولی ئـەوەمان لـە تـەکدا بـدەن کــە واز لــە بـیری جیهیشـتنی "یەمەن" بینین و بـۆ وڵاتـی خۆمـان نەگەڕیینـەوە، لـەم شـارەدا دایکوتـین و دریـژە بـە ژیان بدەین. بەلام من هەر چۆن وەلامی "ئەبدولوەلی"م دایەوە، ئاواش وەلامی ئەمانــەم دایەوە. ئەو ژنانە بە وەلامەکەم دلخۆش نەبوون، بەلام هیـچ توانجیشـیان لەسـەر نـەدا، تەنانەت ئەو کاتەی کە جیبیانهیشتین مالئاوایان لیکردین.

چەند رۆژیك پاش ئەمە، هەوالمان زانی کـە دایکـم بـۆ لامـان دیـت، دایکـم لەگـەڵ "جیم هالی" کۆنسۆلی "بەریتانی" لەگەڵ موچەخۆریکی شالیاری دەرەوە وەك وەرگـیر، لە "سەنئا" وە بۆ "تایز" بەریکەوتن.لەراستیدا ئیمــە هەسـتمان بـە رووداویـك دەکـرد. دایکم پیش ئەوەی کە بۆ "یەمـەن"بفریـت، گـیروگرفتی بـۆ پیـش هـاتبوو، گـیروگرفتی ڤیزە وەرگرتن، لەبەر ئەوە ناچار دەبیت، کە بۆ بالیۆزخانەی "یەمەن"ی لە "لـەندەن" بچیت، دایکم لە تەك خۆیدا "ئیلین و بیـن" دەبـات، کـاتیك کـە سـواری تاکسـی دەبـن و نزیـك بالیۆزخانـە دەبنـەوە، دەبینـن کـە رۆژنامەوانـەکان و فۆتۆگرافـەکان بــە هــەموو لایەکی بالیۆزخانەدا بلاو بوونەتەوە، چاوەریی دایکم دەکەن، بەلام دایکم ناچار دەبیـت کە لە ناو تاکسیەکەدا سەردانەوینیت، بۆ ئەوەی ئەو کەسانە نەیبینن، "ئیلـین و بیـن" بە شۆفیرەکە دەلین: کە تاکسیەکە بئاژووێ بەرەو "بارێ"کی نزیك، پاشان کە دەگەنــە ئەو "بارە" لەویوە تەلەفۆن بۆ بالیۆزخانەی "یەمەن"ی دەکەن و داوایان لیدەکـەن کـە

ڤیزە و پەساپۆرتەکەی دایکم بۆ ئەو "بارە"بینن.پاش وچانیك ئەوان دین بۆ ئەو شوینە لەگەڵ خۆیاندا ڤیزە و پەساپۆرتەکەی دایکم دەهینن. بە دایکم دەڵین: "دەبیت نیو کاژیری تر چاوەروان کەن تاکو هەموو شتەکانت تەواو دەبیت" کاتیك کە هەموو شتەکان و ڤیزەکە تەواو دەبیت،دەستبەجێ دایکم وەك مرۆڤیکی خاوەن دەسەلات و گرنگ بەرەو فرگەی "گاتویك" دەبەن و بەرەو "سەنئا" بەریی دەکەن. لە ناو فرۆکەکەدا یەکیك لە کارگیرانی فرۆکەکە بە دریژایی ئەو ریگایە لە خزمەتی دایکمدا دەبیت.

کاتیك کە دایکم دەگاتە "سەنئا" "جیم" پیشوازی لیدەکات و بەرەو ئوتیلیکی بچکۆلەی دەبات،کە نزیکی خانووەکەی "جیم" خۆی دەبیت. بۆ رۆژی دوایی، هەردووکیان بەرەو شالیارگای دەرەوەی "یەمەن" دەچن. پیشتر بە دایکمیان راگەیاند بوو، پیویستە لەسەری پیش ئەوە کە بەرەو شاری "تایز" بەریکەویت، دەبیت سەر لە شالیارگای دەرەوە بدات و پەیوەندییان پیوە بکات، ئەو کاتەش کە دایکم و "جیم" دەگەنە شالیارگا، هەموو فەرمانبەران مەژوول دەبن،ناتوانن لە تەکیاندا بپەیڤن، بەلام هیندەیان پیرادەگەیەنن کە نابیت بە تەلەفۆن پەیوەندی بەو کچانەوە بکەن. پاش ئەوە "جیم دەچیت بۆ لای ئەو کەسەی کە بلیتی فرینی بەرەو "تایز"ی بۆ ئامادە کردبوون، بەلام کاتیك لە فرگەی ناوخۆیی چاوەریی فرین دەکەن، بە بلندگۆ هەوالدەدەن، لەبەر تەپوتۆز و گەردەلول و رەشەبای ئەمرۆ فرۆکە ناتوانیت بالبگریت، لەبەر ئەوە دایکم و "جیم" ناچار دەبن کە سەفەرەکەیان دوا دەخەن بۆ بەیانی.

ئیستا ئەوان لە ناو فرۆکەدان بە ئاسمانەوە بەرەو لای ئیمە دین.

# بەشی هەڤدە

# بیرۆکراتی و دەردەسەری

ئیمە ئاگـادار کراینـەوە، کـە دانیشـتنیکی گـەورە لـە خـانووی پاریزگـاری شـار سـاز دەکریت، دایکـم و کۆنسـۆلی "بـەریتانی" و فەرمانبـەرانی دەولـەت لـەو کۆبوونەوەیـەدا بەشداری دەکەن. من و "نادیا" و "ئەبدولا و مهەمەد" و مندالەکانیشمان بانگکراین.

ئـەو کاتـەی کـە دایکـم گەیشـتە شـاری "تـایز"، ئیمـەش بـۆ مـالی "ئـەبدولوەلی" چووین، لـەوێ چـاوەروانی دایکمـان کـرد. کـاتیك کـە دایکـم گەیشـت، "ئـەبدولوەلی" پیشوازی لیکرد ئیمە لە ژووری ژنـان چاوەریمـان دەکـرد، "ئـەبدولوەلی" و دایکیشـم بـۆ ژووری ژنـان هـاتن. دایکـم تـەنیا جانتایـەکی رەشـی لەگـەڵ خـۆی هینـا بـوو. ئیمـە زۆر لەسـەر خـۆ و بـە ئـارامی پیشوازیمان لیکـرد. ئـەمجارە بـە شـیوەی یەکـەمجار هەسـتی دایکمان نەوروژاند. لەوانەیە لەبەر ئـەوە بووبیت، کـە رزگـار بوونمـان نزیـك بـوو، یـا ئـەوەتا ئیمـە خۆراگـر و پشـوو دریـژ تـر بوویـن، یـان نەماندەویسـت کـە هەسـتمان دەرخەین، "نادیا" خۆی رانەگرت دەستی بە گریان کرد، بەلام من خۆم راگرت.

ئەمـە بـۆ یەکـەمجار بـوو، کـە دایکـم زارۆکـەکانمان ببینیـت، دایکـم سـەری لـەو چراخانـەی مـالی "ئـەبدولوەلی" سـورما بـوو. کـاتیك کـە دانیشـت گوتـی: "ئۆخـەی لـە دانیشتنی ئەم جیگە خۆشانە." من پیکەنینم بە گوتەکەی دایکـم هـات، ئـەم شـوینەش بۆ دایکم شتیکی چاوەروان نەکراو بوو، لەوانەیە ئەو وا چـاوەریی کردبیـت، کـە بچیتـە خانوویەکی وەکو ئەوەی "ئەبدولکەدا" وە کە لە گوند هەیبوو.

"ئەبدولوەلی" و ژنەکەی، "ئەبدولاّ و مهەمەد"یش لە ژوورەوە لامان بوون. دایکم نەیدەویست چروچاوی ئەو دوو کورە ببینیت، ئەو کورانەش نەیاندەزانی کە چی بکەن. "ئەبدولوەلی" ماوەی چەند خولەکیك بە روویەکی خۆش و بەریزەوە لامان مایەوە، پاشان کورەکانی لە تەك خۆیدا برد بۆ ئەو ژوورە بچکۆلەیەی کە جاروبار لیی دادەنیشتن و "گات"یان تیدا دەجوو. من و دایکم و "نادیا" و منداڵەکان بە تەنیا لە ژوورەوە ماینەوە. ئەو شتانەی کە روویان دابوو، بۆ دایکمان گیرایەوە. دایکیشم لەلای خۆیەوە چی روویدا بوو، هەمووی بۆ گیراینەوە. هەروەها هەندیك "شتوازی" لە "ئنگلاند"ەوە لە تەك خۆیدا بۆ زارۆکەکان هینابوو. بۆ "تینا" بووکە شووشەیەك بۆ "هانی" تریلەیەك و ئۆتۆمۆبیلیك بۆ "مارکۆس"یش ماینچەقەلیك. ئەو کاتانەی کە ئیمە دەپەیڤین زارۆکەکان خەریکی کایەکردن بوون بە "شتوازی"ەکانیان.

دایکم زۆر ماندوو بوو، بەڵام دیار بوو کە تەندروستی باشترە لە جاری یەکەم کە سەردانی کردین. لە بارەی "جیم" و ئەو شتانەی کە لە "سەنئا" پیشیان هاتبوو، هەروەها دەربارەی ئەو دانیشتنەی کە سبەینێ دەبووایە بچین، هەموو شتیکی بۆ گیراینەوە.

پاش پشوودان لەگەڵ دایکمدا بۆ خانووەکەی خۆمان گەراینەوە. لەماڵەوە چرپایەکمان هەبوو بۆ دایکمان سازکرد لە سەری بخەویت، من و "نادیا" و منداڵەکانیش لەسەر زەوی خەوتین. کورەکانیش پەیمانیان داینێ کە لە تەك ئیمەدا نەخەون. "مهەمەد" لە ژوورەکەی خۆی و "ئەبدولاّ"ش لە هۆلەکە خەوت. دایکم بە هیچ جۆریك نەیدەویست، ئەو کورانە لە تەنیشتمانەوە بخەون. دایکم دەیویست ئەو ماوەیەی کە لیرەیە بەبێ ئەو کورانە پیکەوە بین. من ئەوەم دەزانی ئەگەر یەکیك بەوە بزانیت کە ئیمە ئەو کورانەمان ترۆ کردووە، لەسەرمان بە چاك ناکەویتەوە. بەڵام نەدەکرا کە دایکم گوێ لەو شتانە بگریت. تەنیا شتیك کە لیی دەترسام ئەوە بوو، ئەگەر ترۆ کردنی ئەو کورانە بەر گویی "ئەبدولکەدا" بکەویتەوە و بزانیت، ئەویش لە "سەئودی"یەوە دەگەریتەوە گاشە و کیشەمان بۆ دروست دەکات. شتیکی سەیر ئەوە بوو، هەر چەندە لە شاریش دەژیاین، لەگەڵ ئەوەشدا دلنیا بووم لەوە کە

رزگاربوونمان نزیکە، کەچی تاکو ئەو ساتەش لەو پیاوە ترسم هەر هەبوو. لە لایەکی تریشەوە یەکدڵ بووم لەوەی کە ئەو بۆ ئێرە نەدەهات، لەبەر ئەوەی کە خۆی بە دۆڕاو و بێدەسەڵات دەبینیەوە. بەڵام بیر کردنەوە لەو پیاوە وەك مۆتەکە سواری شانم ببوو، کۆڵی لە کۆڵ نەدەکردمەوە.

بۆ بەیانیەکەی کە لە خەو هەستاین، بەرچایی بەیانیمان خوارد و بۆ کۆبوونەوە خۆمان ئامادەکرد. من و "نادیا" هەر هەمان جلکە رەش و نەریتیمان لەبەر خۆمان کرد، سەرپۆش و پەچەمان بەست و گرتەوە، دایکم لە داخدا خەریك بوو یەکاڵا دەبۆوە، کە بۆچی لێرەش ئەم جلکانە دەپۆشین. ئەو نەیدەویست پەچە بگرینەوە. گوتی: "ئێستا ئێوە ئازادن، ئێوە کچە "ئنگلیز"ن. ئەم شتانە مانای چیە..؟ ئێوە ئازادن کە چی لەبەر دەکەن، بەڵام نابێت پەچە بگرنەوە."

ئێمە تا ئەو کاتەش خوومان بەو جلکانەوە گرتبوو، خوومان بەوەوە گرتبوو، کە دەموچاوی خۆمان داپۆشین، خۆمان لە هەموو دنیا بشارینەوە. نە من نە "نادیا" هێندە بروا بە خۆکار نەبووین و کەسایەتیمان لیسەندرابۆوە. ئێمە وا بیرمان دەکردەوە ئەگەر بێت و ئەوجلکانەمان لەبەردا نەبێت، جلکیکی نیوە مۆدێرنمان لەبەردا بێت، وا هەستمان دەکرد کە بە رووتی لە تەك ئەو پیاوانەدا دادەنیشین. نەماندەویرا لە دانیشتنیکی ئاوا گرنگدا لەتەك ئەو پیاوە خاوەن دەسەڵاتانەدا بەو شێوەیە دانیشین. من دەمزانی کە ئێمە تاکو ئێستاش ئازاد نین. ترسی ئەوەم بوو کە بە کاریکی ئاوا ئەو پیاوانە لە خۆمان هارکەین. دەترسام کە دایکم لە وڵاتی "یەمەن" بکەنە دەرەوە ئێمەش راپێچی ناو گوند کەنەوە.

"جیم" بە شوینماندا بۆ ماڵەوە هات، لەگەڵ خۆیدا بردینی. "جیم" پیاویکی سەروزمان خۆشی، موو مەیلەو سوور، دەنگیکی "سکۆتلاند"ی پێوە بوو.

بە تاکسی گەیشتینە کۆشکی پاریزگا، کۆشکیکی چوار نهۆمی، هەموو بیرۆکانی پاریزگا لەوێ بوون. بەرەو نهۆمی دووهەمیان بردین، چووینە ناو سالۆنیکی گەورەوە. لە ناو ئەم سالۆنەدا میزیکی گەورە و قەنەفەی لە چەرمی رەش دروستکراو و هەندێ کورسی تریشی تیدا بوو. کاتیك کە دانیشتین، وردە وردە پیاوان هاتن. لە ناو پیاوەکاندا

کاربەدەستیکی "شالیارگای دەرەوە" و پاریزگاری "تایز" و سێ پیاوی سکرتیریش لەوێ بوون. هەروەها "ئەبدوڵا و مهەمەد"ش لەوێ بوون.

هەموو دانیشتن و دەست بە گفتوگۆ کرا. ئەو کاربەدەستەی "شالیارگای دەرەوە"، پتر لە هەموویان دەپەیڤی، بەوە دەچوو پیاویکی کارامە بیت، تەنیا ئەو بە "ئنگلیز"ی دەپەیڤی. ئەو پیاوە داوای لە ئیمە کرد، کە بەسەرهاتەکەی خۆمانی بۆ بگیرینەوە. ئیمەش بۆ جاریکی تر لە سەرەتاوە تا بنەتامان گیرایەوە.

لەو کاتانەدا کە خەریکی پەیڤین بووین، "مارکۆس" دەیزریکاند و راکەراکی بوو، لە ناکاودا، پاریزگاری بەریزی سەغلەت کرد، پاریزگار بە توورەییەوە پیی گوتم: "ئەو مندالت بیدەنگ کە."

سەیرە ئەوانەی کە خاوەنی مندالن، ئەوە دەزانن و تیبینی دەکەن کە پیاو ناتوانیت بە زۆر مندالی بچوك بیدەنگ کات. لەبەر ئەوە من فەرمانەکەی بەریز پاریزگارم پشتگوێ خست. لە کاتی پشوودا توانیم بۆ "مارکۆس"ی روونکەمەوە. ئیتر دوای ئەوە ئەویش بیدەنگ بوو، "تینا" خەوتبوو، "هانی"ش لە باوەشی "نادیا" دا بە بیدەنگی دانیشتبوو، گویی بۆ خەلکەکە رادیرابوو.

کاتیك کە نۆرەی پەیڤینی من بوو، چاوم بەسەر پیاوەکاندا دەگیرا، هەموو بیدەنگ و سەریان نەوی کردبوو، ئەوان شەرمی ئەوە دایگرتبوون، کە لە وڵاتی ئەماندا چۆن کارەساتیکمان بەسەر هینراوە، چۆن هەلسوکەوتیکمان لەتەکدا کراوە. ئەوەشم گوت: "کاتیك کە ئیمە بۆ "یەمەن" هاتین، نەماندەزانی کە بە شوو دراوین، بەلام لە هەمان کاتیشدا بە زۆر و لیدان لەگەڵ ئەم کورانەدا خەواندیانین." ئەو کاتەی کە ئەو رۆمانەم لە سەرەتاوە تا بنەتا بە ئارامەوە بۆ گیرانەوە، هەستم بە هەلچوون و داچوون نەدەکرد، ریگای توورە بوونم بە خۆم نەدەدا. "نادیا"ش وەلامی هەندیك پرسیاری دایەوە.

لە کۆتاییدا فەرمانبەرەکەی "شالیارکای دەرەوە" پرسیاری کرد، گوتی: "ئیستا ئیوە بەختەوەرن...؟"

دەستبەجێ وەلامم دایەوە: "نا"

ئـەو پیـاوە بـە چەناگـە هەلتەکانیکـەوە گوتـی: "دەبیـت ئیمـە ریگایــەکی یاسـایی بدۆزینەوە کە چۆن ئەم رەوشە چارەسەر بکـەین..؟" پاشـان دریـژەی بـە گوتـەکانی داو گوتی: "ئەگەر ئیوە ئەم ولاتە جیهیلن، ئەو کاتە ناچارن کـە منداڵـەکانتان واز لیبینـن، ئیوە ئەم یاسایە دەزانن...؟"

مـن گوتـەکانم پیـبری و گـوتم: "بـۆ..؟ ئەمانـە منداڵـی ئیمـەن، نـەك منداڵـی ئــەو پیاوانە. لەبەر ئەوەی ئیمە بە فەرمی و یاسـایی شـوومان بـەو کورانـە نـەکردووە. ئیـتر بۆچی دەبیت ئەو منداڵانە جیبیلین..؟" ئەو پیاوە ئەوەی بە دڵ نەبوو، کە بەرپەرچی گوتـەکانی بدریتـەوە. بـەڵام بـۆ مـن پیویسـت بـوو کـە راسـتیەکانی خۆمـان بیـژم. ئــەو پیاوانە لە هەولی ئەوەدا بوون، کە بیدەنگم کەن و هیــچ نـەبیژم. بـەڵام مـن بیدەنگیـم نـەکردبووە دروشـم. بـەڵام "جیـم" وەکـو ئـەو پیاوانـەی تـر هـەولی بیدەنــگ کردنمــی نەدەدا، لە هەمانکاتدا نەیدەویست لە کۆششی خۆم بکەوم، لە کاتیکدا کـە ئـەو دەیزانـی ئەو هەموو ریگایەمان بریوە و تاکو ئیرەمان هیناوە.

فەرمانبەری شالیارگا گوتی: "ئیوە راتان چیە، کە هەمووتان لەگـەڵ پیاوەکانتـاندا ڤیزە وەرگرن و بۆ "ئنگلاند" بگەرینەوە..؟ دەنا لـەوە بـترازیت، نـاتوانن منداڵـەکان لـە تەك خۆتاندا بەرن و ئەم ولاتە جیبیلن."

من و "نادیا" سەیریکی یەکتریمان کرد و گوتمان، "باشە".

ئیمە ئەوەمان دەویست، کە بە هەر شیوەیەك بیت بتوانین خۆمان و منداڵەکانمان ئەم ولاتە جیبیلین.

فەرمانبـەر روویکـردە کورەکـان و گوتـی: "کورینـە ئیـوە دەلیـن چـی..؟ دەخــوازن لەگەڵ ژنەکانتان و منداڵەکانتاندا بۆ "ئنگلاند" بچن و کۆتایی بـەم کیشـەیە بینـن..؟" هەردوو کورەکە سەری رەزامەندییان بۆ ئەو دادوەرییە دانەواند.

فەرمانبـەر، گوتـی: "کـەواتا زۆر باشـە، ڤــیزەی "مهەمــەد و ئــەبدولا" جیبــەجێ دەکەین."

ئەو پیاوە هەستی بە شانازیەك دەکرد، کە توانی چارەسـەری ئـەو کیشـەیە بکـات. دانیشتنەکەمان لەوە دەچوو بەم بریارە کۆتایی پیهاتبێ.

ئیستا سەرکەوتنی بریارەکە لە ئەستۆی "شـالیارگای نـاوخۆی" "بـەریتانی" دایـە، ئایا ئــەوان لەگـەڵ ئـەوەدان کـە ڤـیزە بـەو دوو کـورە بـدەن. کەواتـە پیویسـتە چـاوەریٚ بکەین تا ئەو کاتــەی کـە (داخوازینامـە) بـۆ وەرگرتنـی ڤـیزە دەنـیریت بـۆ "شـالیارگای ناوخۆ" و ئەوانیش پەسەندی بکەن و ڤیزە بەو دوو کورە بدەن.

"جیم" لەو بروایەدا بوو کە ئـەوان ئـەو داخوازییـە پەسـەند ناکـەن و ڤـیزە بـەو کورانە نادەن. بەڵام ئەو پیاوانەی تر باوەریان وابوو کە شـتیکی باشـە، ئەگـەر ئـەو دوو کورەش بۆ"ئنگلاند" بچوونایە. لەگەڵ ئەوەشدا ئەو راستییەیان بـاش دەزانـی، کـە ئـەو دوو کورە نەدلخوازی ئیمەن و نەدەمانەوین، بەڵام"جیم" لەگەڵ ئەوەدا بوو ئەگەر ئەو دوو کورە ڤیزە وەربگرن، ئەمــە تـەنیا ریگایەکـە بتوانـین مندالـەکان لـە تـەك خۆمـاندا بۆ"ئنگلاند" بەرین و بە تەواوی رزگارمـان بیـت. لەبـەر ئـەوە ئـاواتخواز بـوو، کـە ئـەو شیوەیە سەربگریت.

"جیم" لەگەڵ خۆیدا چەند (داخوازینامە) یـەکی هینـا بـوو، کـە دەبـوو کورەکـان بیاننووسـیایە و پریـان بکردایەتـەوە. لەبــەر ئـەوە بـۆ نووســین و پرکردنــەوەی ئــەو (داخوازینامانە) چووینە ژووریکی بچکۆلە تر و لەویٚ دانیشتین. "جیم" بـۆ کورەکـانی روونکردەوە، کە دەبیت خۆیان خـەرجی بلیـت و ڤیزەکـان هەلسورینن. "مهەمـەد" بـە "جیم"ی گوت: خاوەنی 12000 "پاوەن"ە، کاتیك کە لە "سەئودی" کـاری کـردووە کـۆی کردۆتەوە.

"ئەبدوڵا"ش گوتی: ئەو گـیروگرفتی ڤـیزەی نیـە، کـاتی خـۆی کـە بـۆ چارەسـەری نەخۆشی بۆ "ئنگلاند" چووە، کەمتر لەو کاتە ماوەتەوە، هیشتا ڤیزەکەی ماوەی مـابوو کە "ئنگلاند"ی جیهیشتووە. من و "نادیا" دەمـانزانی کـە ئـەم دوو کـورە درۆ لـە تـەك "جیم"دا دەکەن. نە "مهەمەد" خـاوەنی ئـەو دراوە بـوو، نـە "ئـەبدوڵا" لـەو بارەیـەوە راستی دەکرد. بەڵام "جیم" ئەوەی نەدەزانی و بروای پیکردن.

"جیم" گوتی: ئیستا ئەوەندە هەیە، کە دەبیت چاوەریٚ بکەن. بە لایەنی کەمـەوە وەرگرتنی ڤیزە، شەش مـانگ چـاوەروانی دەخـوازیٚ تـاکو بریـاری لەسـەر دەدەن. بـەڵام پەیمانتان دەدەمیٚ کە دەستوو بردی تیدا بکەم بە زووترین کات ڤیزەکان وەرگرن.

کاتیك که دایکم بۆ "یەمەن" هاتبوو، ئەوەی بۆ روونکرا بۆوە، که کاتی خۆی لە ساڵی 1980دا "ئەبدولکەدا و جەواد" بە جووتە "داخوازینامە" یان بۆ باڵیۆزخانەی "بەریتانی" لە "سەنئا" ناردووە، لەو نامەیەدا داوای ئەوەیان کردووە کە ڤیزە بۆ کورەکانیان وەرگرن، لەبەر ئەوەی کە کورەکانیان دوو کچی "ئنگلیز" یان خواستووە. پاش ئەم نامەیە، یاریدەدەری کۆنسوڵی "بەریتانی" وەڵامی "داخوازینامە" کە بە نامەیەك بۆ "ئەبدولکەدا و جەواد" دەنێریتەوە، داوایان لێدەکەن کە دەبێت ئەو دوو کورە بۆ باڵیۆزخانە بێن و چاوپێکەوتنیان لە تەکدا بکرێ، پاش ئەوە دەتوانن ڤیزەکان وەرگرن. بەڵام "ئەبدولکەدا و جەواد" ئەوە دەزانن کە مارەکردنی ئێمە بە شێوەی یاسایی و فەرمی نیە، لەبەر ئەوە نامەکەی کۆنسوڵ پشتگوێ دەخەن و لێیناپرسنەوە. بەڵام "داخوازینامە" کە تا ئەو دەمەش لە ئەرشیفی باڵیۆزخانەی "بەریتانیا" لە "سەنئا"ماوە. ئەو دوو پیاوە بەو کارەیان ئەوەیان دووپات کردۆتەوە و سەلماندووە کە ئێمە بە خواستی خۆمان شوومان بەو دوو کورە نەکردووە، بەلکو لە لایەن باوکمانەوە فرۆشراوین.

دایکم بۆ ماوەی چوار هەفتە لای ئێمە مایەوە. کورەکانیش هەر بە هەمان شێوەی جاران لێمان دوورە پەرێز بوون. لەبەر ئەوە من و دایکم و "نادیا" و منداڵەکان هەمیشە پێکەوە بووین، کاتێکی خۆشمان بەسەر دەبرد. کاتێك کە کورەکان لە ماڵەوە دەبوون شەرە دەنووکمان بوو. ئەوان هەرەشەی ئەوەیان دەکرد، کە دەچنە لای پارێزگاری شار و سکاڵای خۆیان بەرامبەر بە دایکم دەردەبرن، دەڵێن ئەو ژنە هاتووە خۆی تێکەڵاوی ژیانی خێزانی ئێمە کردووە، بەمەش دایکتان لە وڵات دەکەنە دەرەوە.

لەو ماوەیەدا زۆر هەواڵ و دەنگوباس بەرگوێمان دەکەوتەوە. یەکێك دەیگوت: "ئەبدولکەدا و جەواد" پەیوەندییان بە پارێزگارەوە کردووە. یەکێکی تر دەیگوت: لە ماوەی شەش مانگی تردا ئێوە ئەم وڵاتە جێدەهێڵن. یەکێکی تریش دەیگوت: ئێوە بە هیچ جۆرێك ناتوانن ئەم وڵاتە جێبێڵن. چەند کەسانێك تەلەفۆنیان کردبوو، گوتبوویان ئەوان لەم هەفتەیەدا ئەم وڵاتە جێدەهێڵن، ئەو کەسانە سەرەك کۆمار دەناسن و لەوێیان بیستووە. یەکێکی تر دەیگوت: کە گوایا باوکمان نامەی بۆ پارێزگاری

"تایز" ناردووه و داوای لیکردووه که به هیچ جۆریك ریگای ئەوە نەدات ئەو کچانە بگەرینەوە. ئەمانە و زۆر دەنگوباسی تر.

بەلام ئەنجام هیچ شتیك رووی نەدا.

رۆژیکیان دایکم بریاریدا کە بە فرۆکە بەرەو "سەنئا" هەلفریت و پەساپۆرتەکەی بینیت، "جیم" پەساپۆرتەکەی دایکمی لەتەك خۆیدا بردبوو، بۆ ئەوەی ڤیزەکەی بۆ ماوەیەکی تریش دریژ بکاتەوە. دایکم پیشنیازی ئەوەی کرد، کە ئیمەش لە تەکیدا بۆ "سەنئا" بچین. کاتیك کە چووینە فرگەی ناوخۆ، لەسەر "تابلۆی ئاگاداری" وینەکانی خۆمان بینی هەلواسرا بوون. کە چاومان بە وینەکانی خۆمان کەوت، ئەوە تیگەیشتین کە پاسەوانانی فرگە ئاگادار کرابوونەوە و پییان راگەیەندراوە، کە ئەم کچانە دەیانەویت لەم ولاتە هەلین. بەبێ راوەستان دەستبەجێ بەرەو مالی "ئەبدولوەلی" پیچمان پیادایەوە.

پاش چەند رۆژیك، ئەو سێ ژنەی کە ماوەیەك لەوەوبەر هاتن و لە مالی "ئەبدولوەلی" سەردانیان کردین و چاومان بەیەك کەوت. رۆژیکیان سەردانی مالەوەیان کردین و لە تەکماندا دانیشتن. پاش ئەوە هەرسیکیان ناونیشانی خۆیانیان داینێ و داوایان لیکردین کە سەردانی مالەوەیان بکەین. لەبەر ئەوەی کە دایکم لە مالەوە بە تەواوی وەرس ببوو، هیچ شوینیك نەبوو بیبەین، داخوازی ئەو ژنانەمان پەسەندکرد و چووین، ئەم ژنانە لە خانووی خۆش و ناو مالی ریکوپیکدا دەژیان، جلوبەرگی خۆرئاواییان پۆشی بوو، بەبێ ئەوەی کە سەرپۆش بگرنەوە. لە هەمانکاتدا چیشت و نانیکی خۆشیان بۆ دروستکردبووین. ئەم ژنانە هەرسیکیان خویندەوار بوون و گەلیك ولاتان گەرابوون.

یەکیك لە ژنەکان لە کۆمەلەیەکی ژناندا کاری دەکرد، ژنیکی رووخۆش و تیگەیشتوو بوو. لەگەل ئەو ژنەدا دەربارەی هەلدرینی دووفلیقانەی "نادیا" لە کاتی مندال بوونەکەیدا دووام. ئەوەشم پیگوت: کە شوینی ئەو هەلدرینە تاکو ئیستاش هەر چاك نەبووەتەوە و هەوی کردووە. ئەو ژنە سەری لەو شتە سورمابوو، پیی گوتم: "با

لەگەڵ "نادیا" ریککەوین، دکتۆریکی ژن دەناسم و خۆی نیشانی ئــەو بـدات. بـەڵام ئـەو شتەمان لای دایکم نەدرکاند، نەماندەویست دایکم بخەینە سەغلەتییەوە.

بـۆ رۆژی دوایـی تاکسیەکمان گـرت و رۆیشـتین، تیمارگــەی دکتۆرەکـە کـەوتبووە ناوچەیەکی خۆشـی شـارەوە. کـە گەیشـتینە لای دکتـۆر، یەکسـەر چووینـە ژوورەوە. لـە پیشدا سەیری گیانی منی کرد، پاشان سـەیری گیـانی "نادیـا"ی کـرد و کۆنـترۆلی کـرد. گوتی: "ئەو جیگای هەلدرینە هەوی کردووە و زەرتکاوی هەیە. لەبەر ئەوە دەرمانی بۆ "نادیا" نووسی و دەرمانەکانی داینێ. دوایی پرسیاری کرد، حەبی منداڵ نەبوون بەکار دەهینـین..؟ ئیمـەش وەڵامـان دایـەوە "نـا". دکتۆرەکـە سـەری سـورما، گوتـی: "چـۆن کەوایە ئیوە هەمیشە دەبیت ئامادەی ئەوەبن کـە سـکتان پربیـت، بـەڵام ئیـوە چانسـتان هەیە کە ئیستا سکتان پرنەبووە." پیشنیازی ئەوەی کـرد، ئـەوەندەی کـە دەتوانـین، لـە سیکس خۆمان دوور بخەینەوە. دوای ئەوە حەبی دژ بە منداڵ بوونی داینێ. دایکم زۆر دلخۆش بوو، کە بەسەرهاتەکەمان بۆ گیرایەوە. ئەو ماوەیەی کە لە لامان بـوو، هـەموو شەویك حەبەکانی بەبیر دەهینایینەوە کە بیخۆین.

کاتیك کە دایکم لامان بـوو، "ئەهمـەد"ی بـرام سـەردانی کردیـن، لـەو کاتـەوە کـە "ئەهمەد" تەمەنی سێ ساڵان بووە و باوکم هینا بووی بۆ "یەمەن" و جییهیشـت بـوو، ئەمە بۆ یەکەمجار بوو، کە دایکم ئەو کورەی خۆی ببینیت. ئەو رۆژە ئیمـە لـە مالـەوە بووین، کە لە دەرگایدا و هاتە ژوورەوە، بەڵام دایکم نەیدەزانی ئەو کـورە کییـە. کـاتیك کـە بەیـەکتریم ناسـاندن، یـەکتریان لــە ئـامیز گـرت. "ئەهمـەد" زمـانی "ئنگلـیز"ی نەدەزانی لەبەر ئەوە نەیدەتوانی لەگەل دایکمدا بپەیڤێ. من و "نادیا" بووینە وەرگیر لە نیوانیاندا. برایەکی باوکیشـم لـە "سـەئودی" گـەرابۆوە، ئـەویش لەگـەڵ "ئەهمـەد" هاتبوو. مامم پالپشتی ئیمە بوو، دژی ئەوکارە نارەوایە بـوو، کـە بـاوکم بەسـەر ئیمـەی هینابوو. ئەو شەرمەزار بوو بەرامبـەر بـەو کارەسـاتە. مـامم پیـاویکی رووخۆشـی بـاش بوو، بە شیوە و لەش و لاردا لە باوکم دەچوو، بەڵام سالیك لە باوکم منداڵتر بوو.

دایکم بە بینینی "ئەهمەد" دلخۆش و دەم بە پیکەنین بوو. "ئەهمەد" پرسـیاری ئەوەی دەکرد، کە ئایا دایکم دەتوانیـت ئـەویش لـە "یەمـەن" دەربـاز کـات. "ئەهمـەد"

دەیویست لە دەست سەربازی رزگاری بیت. دایکم گوتی: "هەولیکی بۆ دەدەم." بۆ ئەو مەبەستە تەلەفۆنی بۆ "جیم" کرد و لەو بارەیەوە دووان، "جیم" لە وەڵامدا بە دایکمی گوت بوو: "ئەهمەد بنیرە بۆ بالیۆزخانەی "بەریتانی" و پیویستە "داخوازینامە" پر بکاتەوە، دوای ئەوە پەساپۆرتی دەدەینێ. ئەو شتە بۆ "ئەهمەد" ئاسان بوو، لەبەر ئەوەی تەنیا هاوڵاتی "بەریتانی" بوو. باوکم کە دەزانیت شتیك لە ئارادایە. ئەویش لەلای خۆیەوە ئەوەی لە توانایدا دەبیت دەیکات، بۆ ئەوەی ئەو هەوڵ و کۆششەی ئیمە بوەستینێ. چونکە بەو کاروکردەوە ناپەسەندانەی کە بەرامبەر مندالەکانی کردبووی، بە رووڕەش و شەرمەزار خۆی دەبینیەوە، باوکم لە هەولی ئەوەدا بوو، کە چاوی بە "ئەهمەد" بکەویت.

باپیرە و "ئەهمەد"ی برام لە شاری "تایز" بوون، هاتبوون بۆ سەردانی چەند خزمیکمان و لەوێ دەخەوتن. ئیمە هیچ شتیکمان لە بارەی ئەو خزمانەوە نەدەزانی. دوای ئەوەی هاتن بە شوینماندا و بۆ مالی خۆیان بردیانین. ئەم خزمانەمان کاتی خۆی گوندیان جیهیشت بوو، بەیەکجاری هاتبوونە شارەوە و لیرە دەژیان. کورە گەورەکەیان دکتۆر بوو، خۆشیان ژیانیکی مۆدیرن دەژیان. ژنەکە ئامۆزای باوکم بوو، هەندیك دەربارەی ژیانی باوکم دووا، کە پیش ئەوەی "یەمەن" جیبیلیت و بەرەو "ئنگلاند"بچیت. ئەو ژنە بۆی گیراینەوە گوتی: "کاتیك باوکت گەنج بوو، لە گوندی "مەرایس" ژنی هینا." ئەمە بۆ یەکەمجار بوو، کە ئیمەش و دایکیشم ئەو شتە دەربارەی باوکم بزانین. ئەو ژنە گوتی: "کاتیك کە باوکت گەیشتە ئنگلاند، نامەی بۆ ئەو ژنە نووسی، لە نامەکەدا پیی گوتبوو،کە جاریکی تر هەرگیزاو هەرگیز بۆ "یەمەن" ناگەریتەوە. پاش ماوەیەك ئەو ژنە لە خەفەتدا بە نەخۆشی دڵ مرد."

رۆژیکیان باپیرەم بۆ مالی ئیمە هات و هەوالی "ئەهمەد"ی دەپرسی، بزانیت کە لای ئیمەیە. تا ئەو کاتەش "ئەهمەد" و باپیرەم، میوانی ئەو خزمەمان بوون. ئیمەش نەماندەزانی "ئەهمەد" لە کوییە. لەبەر ئەوە تاکسیەکمان گرت و بۆ مالی "ئەبدولوەلی" چووین، هەوالیکی "ئەهمەد" مان بۆ بپرسیت بزانین چی بەسەر هاتووە. باپیرەم لەو بارەیەوە لەگەڵ "ئەبدولوەلی" دووا. بەڵام "ئەبدولوەلی" لە وەڵامدا

گوتی: "لەو بارەیەوە ئاگادار نیم." پەیمانی داینێ بە زووترین کات سۆراخی دەپرسیت. بۆ ئەو مەبەستە پەیوەندی بە زۆر شوینەوە کرد. پاش ئەوەی کە هەوالیان زانی بە "ئەبدولوەلی" یان راگەیاند کە "ئەهمەد" لە بەندیخانەیە و گیراوە.

من هەرگیز چاوەریی ئەوەم نەدەکرد، کە "ئەبدولوەلی" بە کاریکی ئاوا هەستا بیت. پییان راگەیاندین، ئەهمەد لە بەندیخانەی سەرەکیی شار گیراوە. من و باپیرە و دایکم و "نادیا" و مندالەکان تاکسیەکمان گرت و بەرەو بەندیخانە بەریکەوتین. کاتیك کە گەیشتینە بەر دەرکی بەندیخانەکە، پاسەوانیکی تفەنگ بە شان راوەستا بوو، پرسیارم لیکرد: "کوریك بە ناوی "ئەهمەد موهسین" لیرە لای ئیوە گیراوە." من وای بۆ چووم ئەو پاسەوانە وەلامم ناداتەوە، لە کاتیکدا ژنیك بە سەرپۆش و پەچەوە لەو سەرجادەیە ئەو پرسیارەی لیکات. بەلام ئەو مرۆڤیکی باش بوو، گوتی: "نازانم راوەستە ئیستا دەچم هەوالْ دەپرسم." چەند خولەکیکی پیچوو پاشان گەرایەوە، گوتی: "بەلێ "ئەهمەد" گیراوە."

پرسیارم لیکرد گوتم: "لەسەر چی گیراوە ..؟" بەلام ئەو نەیتوانی وەلامم بداتەوە، پیم گوت: "دەتوانم بیبینم..؟"

پاسەوانەکە گوتی: "نا".. و سەریکی بۆ بادا، پاشان گوتی: "بۆت نیە بیبینی، پیشان پیویستە بەریوەبەری بەندیخانە ببینیت، پاش ئەوە ئازاد دەکریت."

من بە توورەییەوە پیم گوت: "پارەیان داویتێ کە ئەوە بلییت..؟ هەموو شتیك بە بەرتیل مەیسەر دەبیت، کەس کاری بۆ ناکریت تاکو پارە نەدات."

پاسەوانەکە تفەنگەکەی بەرەو رووم راگرت و گوتی: "ئەگەر ئیستا بیدەنگ نەبێ و دەم دانەخەی..." پاشان بە منگەمنگ چەند شتیکی تری گوت و بیدەنگ بوو.

منیش بە توورەییەوە پیم گوت: "بەردەوام بە، بزانم چی دەکەیت، چیت لە دەست دیت فەرموو بیکە."

باپیرەم هات و پەلی گرتم، هەولی ئەوەیدا دوورم بخاتەوە و گوتی: "زانا دان بە خۆتا بگرە." پاشان بە خۆما چوومەوە، کە شتیکی راستم نەکرد لەو پاسەوانە توورە بووم. سواری تاکسیەکە بووینەوە و بەرەو مالْ گەراینەوە. ئەو رۆژە درەنگیك،

"ئەبدولوەلی" یەکێك لە پۆلیسەکانی خۆی بۆ لامان نارد. ئەو پۆلیسە پێـی ڕاگەیاندین کە "ئەبدولوەلی" دەڵیت: ئیستا دەزانم، کە "ئەهمەد" لەسەر چی گیراوە. "ئەهمەد" بە فەرمانی پاریزگاری "تایز" گیراوە.

من و "نادیا" بریارماندا بۆ لای پاریزگار بچین و دایکم و باپیرەمان لە ماڵەوە جیهیشت.

کاتیك کە گەیشتینە ئەوێ، بە ناو ئەو خەلکانەدا خۆمان دەرباز کرد بە پیپلیکانەکاندا چووینە سەرەوە، ئیمە هیوامان بەو ژنە سکرتیرە بوو. کە گەیشتینە لای بەرەو روومان هات، بردینە ژووری کارەکەیەوە. من هیندە تووڕە بووم بەلامەوە گرنگ نەبوو کە چی دەبیژم. بەڵام ئەو ژنە هەولیدا کە هیمنم بکاتەوە، گوتی: "ئیستا تەلەفۆن بۆ پاریزگار دەکەم و پیی رادەگەیەنم کە ئیوە لیرەن. دوای ئەوە چایان بۆ هینایین و بە تەنیا لە ژوورەکەدا ماینەوە.

لە ئەنجامدا چاومان بە پاریزگار نەکەوت، لە بری ئەوە پەیوەندی بە "ئەبدولوەلی"یەوە کرابوو. ئەویش بەلینی ئەوەی دابوو کە دیت و دەمنبات. "ئەبدولوەلی" سەری لەم کارەی ئیمە دەرنەدەچوو،کە بۆچی ئیمە خۆمان چووین بۆ ئەوێ و ویستوومانە پەیوەندی بە پاریزگارەوە بکەین. "ئەبدولوەلی" داوای لیکردین گوتی: "هەستن با بڕۆینەوە."

منیش پیم گوت: "من ناڕۆم تاکو براکەم بەرنەدەن."

ئەویش وەڵامی دایەوە: "باشە دەڕۆین ئیستا "ئەهمەد" دەهینین و بەری دەدەین."

پاش ئەوە چووینە دەرەوە تاکسیەکمان گرت، جاریکی تر بەرەو بەندیخانە بەرێ کەوتین. "ئەبدولوەلی" چووە ژوورەوە، بۆ ئەوەی کە راویژ لەتەك بەرپرسیاری بەندیخانەدا بکات، ئیمەش لە ناو تاکسیەکەدا چاوەریمان دەکرد. نزیکەی نیو کاژیری پیچوو، پاشان گەرایەوە و "ئەهمەد"ی لەگەڵ خۆیدا هینا.

"ئەهمەد"یش لەتەکماندا سواری تاکسیەکە بوو، بەرەو ماڵەوە گەراینەوە. کاتیك کە بۆ ماڵەوە گەراینەوە. دایکم بە بینینی "ئەهمەد" ئاهیك بە دەروونیدا هاتەوە.

"ئەهمەد" بۆی گیراینەوە، لە ژوورەوە پاسەوانیکی بەندیخانە لییداوە و هەڕەشەی ئەوەیان لیکردووە، کە واز لەو دەستیوەردان و ئەو کارەی ئیمە بینیت. گیروگرفتی ئەو ژنانە گیروگرفتیکی ناوخۆی خیزانەکان خۆیانن، ئەو بۆی نیە بە هیچ جۆریك خۆی تیکەڵاوی کاری ئەو خیزانانە بکات. بە زەییم بە "ئەهمەد"دا دەهاتەوە، لەبەر ئەوەی بیتاوان بوو. هەر لەبەر ئەوە گرتبوویان کە لایەنگری ئیمە بوو، دەنا ئەوان هیچ جۆرە بەلگەیەکیان پینەبوو. بەڵام یاسای ئەو دەولەتانە پیویستیان بە بەلگە نیە،کاتیك کە یەکیك دەستگیر دەکەن.

رۆژیکیان من و "نادیا" و دایکم و مندالەکان لە مالەوە پیکەوە بووین، کاتیکم زانی لە دەرگا درا، کە چووم دەرگاکەم کردەوە، پۆلیسیك بە تفەنگیکەوە راوەستا بوو، پیاویکی تریش لە تەنیشتیەوە بوو، کاتیك کە پیاوەکەم بینی زانیم کە کاربە دەستی دەولەتە، پرسیاری کرد گوتی: "دایکت لەوییە..؟" منیش دەستم بۆ ئەو ژوورە راکیشا کە دۆشەکیکمان تیا داخستبوو لەویٚ دادەنیشتین گوتم: "ئا لەویٚ دانیشتووە." پیاوەکە و پۆلیسەکە خۆیان کرد بە ژووردا. پیاوەکە بە توورەییەوە بە "ئنگلیز" ییەکی تیکشکاو بە دایکمی گوت: " "مریم"، ڤیزەکەت تەواو بووە، تۆ بە نایاسایی لەم وڵاتەدا ماویتەوە."

دایکم وەڵامی دایەوە گوتی: "نا چوار رۆژی تریشم مۆلەت ماوە."

کابرا بە توورەییەوە گوتی: "دەزانی کە چی چاوەریتان دەکات، ئەگەر ڤیزەکەتان لەکاتی خۆی لابدات..؟" پۆلیسەکەش تفەنگەکەی ئامادە کردبوو، دەستی لەسەر پەلەپیتکەکەی دانابوو.

دایکم وەڵامی دایەوە گوتی: "بەڵام کاتی ڤیزەکەم تەواو نەبووە."

کابرا فەرمانیدا. "دەتوانم پەساپۆرتەکەتان ببینم..؟"

دایکم پەساپۆرتەکەی نیشاندا، ئەویش سەیریکی کرد. دایکم پرسیاری لیکرد،" کیٚ فەرمانی بە تۆداوە بەو شیوەیە ببیت..؟" بەڵام ئەو وەڵامی نەدایەوە، دایکم بە توورەییەوە گوتی: "بینە پەساپۆرتەکەم بدەرەوە، خیراش لەم مالە بچۆ دەرەوە، جاریکی تریش نەتبینمەوە." دایکم هەموو گیانی دەلەرزی. کاتیك کە ئەوان هاتن هەر

له ریگاوه ویستیان بەو شیوه ناشرینه دایکم بترسینن، پیاوەکە بە هەرەشـەوە کردنـەوە چووە دەرەوە.

هەروەك "جیم" کە چاوەروانی دەکرد، "شالیارگای ناوخۆ"ی "بـەریتانی" ڤـیزەی بەو دوو کورە نەدا، لەبەر ئەوەی لە کاتی پرکردنـەوەی "داخوازینامـە" کانـدا ئـەو دوو کورە، وەڵامی ناراست و درۆیان دابۆوە، لەبـەر ئـەوە ڤیزەیـان نـەدابوونێ. بـە گەیشـتنی ئەو هەواله زانیم، کە هیچ ریگایـەکی ترمـان لـە پیشـدا نیـە کـە بتوانـین منداڵـەکانمان لەگـەڵ خۆمـاندا بـۆ "ئنگلانـد" بـەرین. دەمزانـی کـە ناچـارم و دەبیـت "مـارکۆس" جیهیلم. مانەوەی دایکیشم لیرە بێ ناوەرۆکە، لیرە هیچ شتیك ناكریت. ئەویش وای بە باش زانی بۆ "ئنگلاند" بگەریتەوە و بەردەوام بیت.

دایکـم بریـاریدا کـە بـۆ "ئنگلانـد" بگەریتـەوە. هــەمووماـن سـواری "جیپـــە لاندرۆڤـیر"ەکـەی "ئـەبدولوەلی" بووین، بـۆ ئـەوەی دایکمـان لـە فرگـە رەوانـە بکـەین. گەیاندمانە ئەویندەرێ و هەمووومان چووینە ئەو هۆلی چاوەروانیەوە کە تازە دروست کرابوو، دیواری هۆڵەکە شووشە بەند بوو، لەویوە چاومان لەو فرۆکانە بوو، کە دەهاتن، یـان باڵیـان دەگـرت. لـە هـەمانکاتدا چاومـان لـەو خەلکانـەش بـوو، بـۆ نـاو فرۆکـەکان سەردەکەوتن. نزیکەی دە خولەکی خایـاند، ئـەو فرۆکەیـەش هـات کـە دەبووایـە دایکـم سوار بیت. بەراستی گرانە بتوانم لە ناخۆشی ئەو ساتە بدویم، کە چـەند نـاخۆش بـوو بۆ جاریکی تریش دایکم جیماندەهیلێ، تـەنیا ئاواتمـان ئـەوە بـوو، کـە ئیمـەش لەگـەڵ دایکمدا سواری ئەو فرۆکەیە بین. لە بێ دەسەڵاتیدا دەگریـاین. "هـانی" کـە چـاوی بـە "نادیا" کەوت دەگری ئەویش دایە پرمەی گریان.

دایکم رووی تیکردین و گوتی: "خەفەت مەخۆن رزگار بوونتان نزیکە."

"ئەبدولوەلی" لە تەك دایکمدا بە کۆنـترۆلدا رۆیشـتن، ئیمـەش لـە دیـوارە شووشـە بەندەکـەوە، دەسـتمان بـۆ دایکـم رادەوەشـاند. "ئـەبدولوەلی" لەبـەردەمی فرۆکەکـە راوەستا، تاکو دایکم سەرکەوتە سەرەوە، پاشان بۆ لای ئیمە گەرایـەوە.ئیمـە چاوەریمـان کرد تا ئەو کاتەی فرۆکەکە باڵی گرت، پاش ئەوە بەرەو شار گەراینەوە. هەمووومان کش و مات و بیدەنگ دانیشتبووین.

"ئەبدولوەلی"یش مرۆڤیکی کارامە بوو، هەولی ئەوەی نەدا بمانهینیتە پەیڤین.

لە ریگای فرگە پارکیکی نوییان بۆ یاری منداڵان دروستکرد بوو، "ئەبدولاّ و مهەمەد" و مـن و "نادیـا" و منداڵەکان رۆژیـك بـۆ ئـەو پارکـە هـاتین. ئـەو رۆژە منداڵەکان بە وازی کردنەوە کاتیکی خۆشیان بەسەر برد.

"مهەمەد و ئەبدولاّ" پتر بە هاوریی منداڵەکان دەچوون، وەك لـەوەی کـە باوکیـان بن. رۆژیك لە رۆژان لە "ئەبدولاّ"م نەدی بیریك لە "مارکۆس" بکاتەوە و کەلوپەلی بـۆ بکریت، ئەگەر "مارکۆس" پیویستی بە جلوبەرگ هەبووایـە، دەبـوو مـن پیـی بلیـم کـە ئـەو منداڵـە پیویسـتی بـەو شـتە هەیـە. هـەرگیز ئەوەشـی نـەدەکرد کـە لەگـەڵ خۆیـدا شتیك بۆ "مارکۆس" بینیتەوە.

پاش ئەوەی کە دایکم گەرایەوە، باپیرەم و "ئەهمەد" ماوەیەکی تریش لە "تـایز" مانەوە. رۆژیکیان باپیرەم بانگی کردم گوتـی: "زانـا، ئیـوە لـیرە تووشـی زۆر گـیروگرفت بوون، بۆ نایـەن بچین بـۆ "ئـەدەن" ئیمـە لـەوێ دەتوانـین ئـەم ژیانـە بگۆریـن هـەموو شتیکتان بۆ بکەین."

پرسیارم لیکرد: "بیین لەوێ چی بکەین..؟"

ئەو وەڵامی دامەوە، "دەتوانین زۆر شت بکـەین، دەسـەڵاتدارانی ئـەوێ وەکـو ئـیرە نین و پیشمان پیناگرن."

لەلای خۆمەوە ئەو پیشنیازەی باپیرەم وەلاوە نەنا.بەڵام پاش ئەوەی کـە بـە باشـی بیرم لیکردەوە، نەمویست بەڵایـەکی تریـش بەسـەر خۆمـان بینـم. بـیرم کـردەوە ئیسـتا ئیمە هەولیکی باشمان داوە، تا بەم رۆژە گەیشتووین. گریمان وا من باوەریشم بە باپیرم کرد، بەڵام دەشێ باوکم هانی ئەوەی دابیت، کە بـە کـاریکی ئـاوا هەسـتێ و ریسـەکەمان بکاتەوە بە خوری. من ئەوەم دەزانی کە باوکم و "ئەبدولکەدا"ش لـە هـەولدانیکی لـەو بابەتەدا بوون.

نازانم چۆن و لە کویوە "ئەبدولوەلی" بـەم پلانـەی باپـیرمی زانـی بـوو. ئـەو پیـی گوتم: "بیستوومە کە باپیرەت دەیەویت لە تەك خۆیدا بۆ "ئەدەن" بتانبات..؟"

بەڵام من لەوە تیگەیشتم ئەم هەواڵە کێ پیی گوتووە.

کاتیك کە دایکم بۆ ئنگلاند گەرایەوە، لەگەڵ ئەوەشدا کە من و "نادیا" و منداڵەکانمان لە ناو شار دەژیاین، هەستمان بە نادڵنیایی دەکرد. ئاگاداری رووداوەکان نەبووین، هەموو شتێکی ناخۆش ئازاری دەداین. بەڵام ئێمە بەردەوام بووین لە هاتوچۆکردن و سەردانی ئەو مرۆڤانەی کە دەمانناسین. هەروەها لە تەك ئەو دوو کورە "مهەممەد و ئەبدوڵا" دریژەمان بەو ژیانە دەدا، باری ئابووری ناچاری کردبووین، کە پێیانەوە ببەسرێینەوە.

بۆ جاریکی تر "مارکۆس" تووشی نەخۆشیەکی گران هاتەوە،نەیدەتوانی خواردن بخوات،بە تەواوی لاواز و بێهێز بوو، لە جولەو گەران کەوت. جاری پێشوو کە نەخۆش کەوت، هێز و گوریکی تیادا بوو. بەڵام ئەمجارەیان بە تەواوی لیکەوت. لەبەر ئەوە من و "نادیا" بریارماندا ئەمجارە خۆمان بۆ نەخۆشخانەی بەرین.

هەواڵی ئەو دانیشتنەی کە لەگەڵ "پاریزگاری شاری "تایز" کردبوومان، بە هەموو لایەکی شاردا بڵاو ببۆوە کەوتبووە سەردەمی هەموو کەسێك. ئەم چیرۆکەی ئێمە ناسرابوو. ئێمە هەستمان دەکرد لە کاتی چوونە دەرەوەمان ئەگەر چی پەچەشمان دەگرتەوە، لەبەر ئەوەی کە منداڵەکانمان لەگەڵدا بوو، بە زمانی "ئنگلیز"ی دەپەیڤین، خەڵکی لەسەر ریگا و ناو کۆڵانەکاندا سەیریان دەکردین و دەیانناسین. کاتیك گەیشتینە نەخۆشخانە. پیدەچوو یەکێك ناسیبینی و دەستنیشانی کردبین، یەکسەری بەرەو ژووری دکتۆر رۆیشتین، کەس دەستی نەهینایە ریگامان، هەر کە چووینە ژوورەوە، داوای ئەوەم کرد کە دەستبەجێ یەکێك سەیری منداڵەکەم بکات، لە وزەمدا نەبوو یەك چرکە چاوەروان کەم. پیاویك لە ژوورەوە بوو، بانگی پیاویکی تری کرد. نازانم ئەو پیاوە دکتۆر بوو چی بوو..!؟ بەڵام ئەو پیاوە دەیزانی کە ئێمە کێین، زۆر بەر یزەوە هەڵسوکەوتی لەگەڵماندا کرد و بە دەنگمانەوە هات. بەڵام من لەو ساتەدا گویم بەوە نەدەدا، کە ئەم پیاوە کێیە و چ کارەیە. تەنیا مەبەستم ئەوە بوو سەیری "مارکۆس"بکەن کە چیەتی. ئەو پیاوە گوتی: "بفەرموون با بڕۆین" بەرەو ژووریکی تری بردین، ئەو ژوورە بە ژووری تاقیگا دەچوو، لەو ژوورەدا "تیشکە ئیکس" "ROENTEN – X " و ئامیری پرۆڤەی خوین و گەلێ شتی تریشی تیدا بوو. پیاوەکە بە

دەست هیمای دانیشتنی کردین و گوتی: "فەرموو دانیشن، ئیستا سەیری مندالەکە دەکەم بزانم چیەتی." چەند خولەکیك سەیری لەشی "مارکۆس"ی کرد و گوتی: "ئەم منداله هیزی لەبەر براوە، پیموایه دەبیت پرۆڤەی خوینی بگرین." پاش ئەوەی کە هەموو شتیك تەواو بوو. پرسیارم لیکرد"، چەندی ماوە دەویت، تاکو ئەنجامەکە وەردەگرینەوە..؟"

دکتۆر گوتی: "بەیانی وەرنەوە، بەلام ئیستا بچن بۆ ئەو بەشەی تری نەخۆشخانەکە."

بەیانی کە رۆژ بۆوە، بۆ هەمان ژوور چووینەوە. کاتیك کە دکتۆر چاوی پیمان کەوت رەنگی تیکچوو.

یەکسەری پرسیارم لیکرد و گوتم: "ئەنجامەکەی دەرچووە...؟"

دکتۆر گوتی: "ئا، "مارکۆس" خوینی گەرەکە، ئەو منداله چانسی هەبوو کە هیناتان، دەنا ژیانی لە مەترسیدا بوو، ئەگەر نەخۆشیەکەی ئەو مندالەتان پشتگوێ بخستایه لەو بروایەدا بووم کە دەیکوشت."

من بە تەواوی پەشۆکام و گوتم: "ئیستا خوینی لە کوێ بۆ پەیدا بکەم..؟"

دکتۆر گوتی: "باوکی با خوینی بداتێ."

وەلامم دایەوە، "دکتۆر ناخوازم مندالەکەم خوینی باوکی وەرگرێ." یەکسەر بیرم لەوە کردەوە کە باوکی لە کاتی نەشتەرگەریەکەیدا کە لە "سەئودی"یە بۆیان کردبوو خوینی کەسانی تری تیکراوە.

جاریکی تریش بە دکتۆرەکەم گوتەوە: "نا نامەوێ هیچ شتیك لە باوکی وەرگریت."

دکتۆرەکە لە مەبەستەکەم گەیشت، پاشان گوتی: "باشە ئەگەر گروپی خوینەکەی منی بۆ ببیت، خەم ناکات من خوینی دەدەمێ." دکتۆر پرۆڤەی خوینەکەی خۆی کرد، خوینەکەی دکتۆر بۆ "مارکۆس" دەگونجا. پاش ئەوە بانگی پیاویکی تری کرد، داوای لیکرد کە شووشەیەك خوینی لیوەربگریت. لەراستیدا کاریکی مرۆڤ دۆستانەی کرد، بۆ

ئەو یارمەتیە بە پەرۆش بوو. من لەوە نەگەیشتم، کە ئەو دکتۆرە چۆن بریاریدا و ئەو کارەی کرد..؟!

لەوانەیە بەزەیی پیاماندا هاتبیتەوە، لەبەر ئەوە دەیویست چاکەمان بەرامبەر بکات. کاتیك کە خوینەکە ئامادەکرا، "مارکۆس"یان لەسەر جیگایەك پالخست، بەلام ئەو منداله هیز و جولەی لەبەر برابوو، بە ئاستەم چاوەکانی بۆ هەلدەهاتن.

پرسیارم لیکردن، "دەتانەوێ چی لیبکەن...؟"

دکتۆر لەسەر خۆ وەلامی پرسیارەکەی دامەوە و بۆی روونکردمەوە، گوتی: "پیویستە دەماریك بدۆزینەوە خوینەکە وەرگرێ و لەسەر خۆ خوینەکەی تیکەین."

لە پیشدا ویستیان لە باسکیەوە ئەو کارە بکەن، بەلام شوینیکی وایان نەدۆزیەوە، ترس دایگرتم. بە ناچاری شوینیکی گونجاویان لە ناوچەوانیدا دۆزییەوە لەویوە خوینەکەی تیکەن. بەو دیمەنە دەستم بە گریان کرد.

کاتیك کە دەرزییەکەیان کرد بە ناوچەوانیدا زریکەی لیهەستا و پەلی دەهاویشت. بەپەلە لە باوەشم گرت، چاوم لیبوو کە خوینەکە دلۆپەی دەکرد، لە سەریەوە دەچووە ناوەوە. هەناسەم لە خۆم بری بوو، نەدەبووایە بە هیچ جۆریك بجولیمەوە، دەنا ئەو دەرزییەی کە لە ناوچەوانی رۆچوو بوو، لەوانە بوو بیتە دەرەوە. خوینەکە لەسەرخۆ دلۆپەی دەکرد. "مارکۆس" خەوی لیکەوت. بەو جۆرە دوو کاژیری برد، تاکو هەموو خوینەکەی وەرگرت. هەستیکی پر لە ئەندیشە دایگرتم، لەگەڵ ئەوەشدا دەمزانی،کە دەبیت بەم زووانە ئەم منداله نەخۆشە جیبیلم. "نادیا" هەموو ئەو کاتانە لەگەلمدا بوو، بەلام کەسیکی تر نەیدەزانی، کە ئیمە لە کویین و سەرمان بە چ کونیکا کردووە و چیمان بەسەر هاتووە.

پیش ئەوەی کە "مارکۆس" هەمووخوینەکەی وەرگریت، بە "نادیا"م گوت: " بۆ مالەوە بگەریرەوە، ئەو پیاوانە لەوە ئاگادار بکە پاشان با تاکسییەك بگرن و بین بۆ ئیرە و پیکەوە بۆ مالەوە بچینەوە." بەلام کاتیك "نادیا" بۆ مالەوە دەگەریتەوە، ئەو پیاوانە لەوێ نابن، "نادیا"تاکسیەك دەگریت و دەچیت بۆ مالی "ئەبدولوەلی" و

بەسەرهاتەکەی تیدەگەیەنێ. ئەویش راناوەستێ و یەکسەری لەگەڵ "نادیا" هاتن بۆ ئەو ژوورەی کە "مارکۆس"ی لێ خەوت بوو.

پیش ئەوەی کە "ئەبدولوەلی" بیت، دکتۆرەکە زوو زوو دەهات و سەری "مارکۆس"ی دەدا و کۆنترۆلی لەشی دەکرد.

کاتیك کە "ئەبدولوەلی" بەو شیوەیە چاوی بە "مارکۆس" کەوت رەنگی بە رووەوە نەما بوو، ئەگەر شتیکمان لێ بەسەر بهاتایە ئەو پیاوە بەرپرسیارمان بوو. دەیویست بزانێ کە چی روویداوە. "مارکۆس" ئەو دەمە سوورایی کەوتبۆوە رووی، دکتۆرەکەش لەو کاتەدا، خۆیکرد بە ژووردا. "ئەبدولوەلی" پر بە دڵ سوپاسی دکتۆرەکەی کرد بۆ ئەو یارمەتی و بەدەنگ هاتنەوەی.کاتیك کە خوینەکە تەواو چۆرایە لەشیەوە، بەتەواوی روومەتە زەرد هەڵگەراوەکانی رەنگیکی پەمەییان بەخۆوە گرت. پاش ئەوە بەرەو مالی خۆمان گەراینەوە، چەند رۆژیك دوای ئەوە "مارکۆس" بە تەواوی هاتەوە سەرخۆی و دەستی بە خواردن کردەوە و تەندروستی گەلیك روو لە باشی بوو. "مارکۆس" ئەو میراتیەی لە باوکیەوە بۆ جیمابوو، هەر جارە دەبووایە بەشیوەیەك ناساغ بیت.

ئەوەی کە پتر پالی پیوە دەنام و خەمی کەم دەکردمەوە،کە "مارکۆس" لە "یەمەن" جیهیلم، ئەوە بوو،کە کور بوو، من ئەوەم دەزانی لەو رووەوە گرفتی نابیت، خۆ ئەگەر لە بری کور، کچیك بووایە، نەمدەزانی کە چی بکەم، بەڵام ئاسانتریش دەبوو، ئەگەر کوریکی بە تەندروست بووایە، بۆ یەکیك کە رووبەرووی ژیانیکی ئاوا ئاستەم بۆتەوە.

# بەشی هەژدە
# دەرباز بوونیکی لە ناکاو

دوای ئـەوەی کـە دایکـم بـۆ "ئنگلانـد" گەرایـەوە، "جیـم" تەلـەفۆنی بــۆ کردیــن دەیویست، لەگەڵ "مهەمــەد"ی مـیردی "نادیـا" بـدوێ. "جیـم" ئـەوەی بـە "مهەمـەد" راگەیاند، ئیستا دەتوانیت پەساپۆرتی "بەریتانی" وەربگریت، لەبەر ئەوەی "جـەواد"ی باوکی هاولاتی "بەریتانی"یە.

"جیــم" پرســیاری لــە "مهەمــەد" کــرد: "دەتوانــی بییــت بــۆ "ســـەنئا" ئــەو "داخوازینامانــە" پربکەیتــەوە و پەنجـەمۆر بکـەیت، کـە بـۆ وەرگرتنــی پەســاپۆرت پیویستە..؟"

"مهەمەد" بە خۆشیەوە وەلامی "جیم"ی دایەوە: "ئا بە زووترین کات دیـم، ئـەو کارانە دەکەم."

منیش لەلای خۆمەوە گەلیك دلخۆش بووم، وا بیرم دەکردەوە، کە ئەمە ئاسـانترین ریگایە کە "نادیا" بتوانیت مندالەکانی لەگەڵ خۆیدا بۆ "ئنگلاند" بـەریت. لەراسـتیدا من نەمدەویست "نادیا" بە تەنیا لەم ولاتە جیبیلـم. چونکـە دەمزانـی ئەگـەر "نادیـا" بە تەنیا لەم ولاتە بمینیتەوە، لە توانایدا نیە، یان نـاخوازیت هـەولی خـۆ رزگـار کـردن بدات.

لەگـەڵ ئەوەشـدا کـە "مهەمـەد" بـە کـوڵ و جۆشـەوە دەیویسـت خـۆی بگەیەنیتـە "ئنگلانـد"، بـەلام بـەدەم داواکردنەکـەی "جیـم"وە نــەدەچوو، کـە خـۆی بگەیەنیتـە بالیۆزخانەی "بەریتانی" لە "سەنئا" و کارەکانی جیبەجێ کات.

من و "نادیا" هەمیشە دەنوکمان لەسەری بوو، هانی ئەوەمان دەدا، کە بچیت کارەکانی لە بالیۆزخانە جیبەجێ بکات. لە کۆتاییدا "مهەمەد" هاتە ژیر بارەوە، پرسیاری لە من و "نادیا"ش کرد: "ئایا دەتوانین لە گەلیدا بۆ "سەنئا" بچین و کارەکە مەیسەرکەین..؟"

"ئەبدولوەلی" گوتی: " "زانا" پەساپۆرتەکەی تۆش ئامادەیە، دەتوانی لەگەڵ خۆتدا بیهینیتەوە."

ئەو "داخوازینامانە"ی کە کاتی خۆی بۆ وەرگرتنی پەساپۆرت دایکم بۆی ناردین و من و "نادیا" پرمانکردەوە، دایکم لای "جیم" داینابوون، وا دەزانم دایکم لە من و "نادیا" دلنیا نەبوو. لەوە دەچیت ئاوا بیری کردبیتەوە، ئەگەر ئەو شتانە لە مالەوە لای خۆمان بن، لەوانەیە پیاوەکانمان ئەو "داخوازینامە" و شتانە بدزن و گۆرەگومیان کەن، ئەو ساتە ریسەکەمان ببیتەوە بە خوری.

بەیانی زوو من، "نادیا" مندالەکان، "مهەمەد" و "ئەبدولوەلی" بە جیپیکی لاندرۆڤیر لەگەڵ پۆلیسیکدا کە جیپەکەی دەهاژوت، بەرەو "سەنئا" بەریکەوتین. بەلام "ئەبدولا"ی بە ناو میردم لەگەلماندا نەهات، من نەمدەزانی ئەو کورە لە کوییە و سەری خۆی بۆ کوێ هەلگرتووە. بەلام ئەوە شتیکی ئاسایی بوو، ئەو بۆ کوێ چووە و لە کوییە، ئەوە کاری بە منەوە نەبوو، هەر بیریشم لینەدەکردەوە، تاکو گەیشتینە "سەنئا" چوار کاژیرمان پیچوو. کاتیك گەیشتینە ئەوێ باران دەباری، رۆژیکی گەلیك سارد بوو.

"ئەبدولوەلی" لەویش خانوویەکی لە دەرەوەی شاری "سەنئا" هەبوو، ئیمە دەبوو تا کارەکانمان تەواو دەکەین لەو خانووەدا بژین، خانوویەکی خۆش و ریکوپیك بوو، تۆزیك لە خانووەکەی "تایز" گچکەتر بوو. ئەم خانووە وەکو خانووەکەی "تایز" نەبوو پۆلیس پاسەوانی لیبکات. مالە دراوسیکان هەموو خەلکانی دەولەمەند بوون. لە هەردوو شاری "تایز و سەنئا" دا ناوچە دەولەمەند و هەژار نشینەکان جودا بوون، لەم ولاتە لە نیوانی دەولەمەند و هەژاراندا جیاوازییەکی گەورە هەیە.

"ئەبدولوەلی" دەربارەی مالـە دراوسـیکانی دەدوا، گوتـی: "ئـەو خـانووەی تەنیشت خانووەکەم، مالی پاریزەریکە. ئەوی ئەو لاشیان مالی دکتۆریکە، خانووەکـانی ئـەوان لـە خانووەکـەی مـن گـەورەترن، لـەو لاشـەوە خـانووی پیـاویکی "ئنگلـیز"ی سـەرمایەداری کۆمپانیای نەوتە." پاش ئەو وتوویژە پیاوەکان بۆ کرینی خواردەمەنی چوونـە دەرەوە، ماوەیـەکیان پیچوو. دوای ئـەوە کـە گەرانـەوە مـن و "نادیـا"ش چیشـت و خواردنمـان ئامادەکرد.

دوای نیـوەرۆژ، بـۆ بالیۆزخانـەی "بـەریتانی" چووین. کـاتیك گەیشـتینە ئـەوێ، هەندیك گیروگرفت بۆ "مهەمەد" پەیدا بوو. لە بالیۆزخانە پییان گوت بـوو، پیویسـتە بـاوکت ئـەو "داخوازینامانـە" پەنجـەمۆر بکات. بـەلام بـاوکت ئـەو کـارەی نـەکردووە و نایەویت کە تۆ پەساپۆرت وەرگریت و بۆ "بەریتانیا" بچیت. باوکت دەلێ: "ئەگـەر تـۆ ئـەو کـارە بکـەی، ئەوسـا "نادیـا"ش دەتوانیـت بـۆ ئنگلانـد بگەریتـەوە." "مهەمـەد" هەمیشە لە ژیر فەرمانی باوکیدا بوو، چی بریار بدایە، ئەو کـورە ئـەوەی دەکـرد، هـەر وەك "ئەبدولا"ی بەناو میردم، "مهەمەد"یش بە هەمان شیوە، سەرنەوی فەرمانـەکانی بـاوکی بـوو. ئـەم کورانـە بـە هیـچ جۆریـك کاردانەوەیـەکیان بەرامبـەر بـە بریارەکـانی باوکیـان نیشـان نـەدەدا. "نادیـا" دەبوایـە نـاوی خـۆی لـە پەسـاپۆرتەکەی "مهەمـەد"دا بنووسیت، بۆ ئەوەی دلنیا بیت، کە مندالەکانی لەگەلْ خۆیدا دەبات.

من نەچوومە نـاو بالیۆزخانـەوە، لـە دەرەوە لـە نـاو جیپەکـەدا چاوەروانم کـردن. پـاش ئـەوەی کـە کارەکـەی "مهەمـەد" سـەری نـەگرت بـوو گەرانـەوە، "نادیـا" پەساپۆرتەکەی منی لەگەلْ خۆیدا هینا، دایە دەستم. ئەمە یەکەمجار بـوو، پەسـاپۆرتی خۆم ببینم، پەساپۆرتە کۆنەکەمم بە دوو چاوی خۆم نەبینی، چونکە لە نیوانی باوکم و "ئەبدولکـەدا"دا دەسـتا و دەسـتی دەکـرد، ئـەوان گلیـان دابـۆوە. پیویسـت بـوو ئـەم پەساپۆرتەش بدەم بە "ئەبدولوەلی" و لەلای ئەو بیت. "ئەبدولوەلی" گوتی: "پیویسـتە ئەو پەساپۆرتە بنیرن بۆ "شالیارگای ناوخۆ" بۆ ئەوەی ستیمپلی بکەن."

دوای ئەوەی کە بالیۆزخانەی "بەریتانی"مان جیهیشت، بە جیپەکە بە نـاو شـاری "سـەنئا" گـەراین. شـاری "سـەنئا" شـاریکی خـۆش و گەورەیـە، زۆربـەی خانووەکـانی

مۆدیلـی کۆنــن، لـە شـاریکی "بـەریتانی" دەچیـت. لـەو شـارەدا ژنـــان بـــە بـــەرگی خۆرئاواییەوە لەگەڵ پیاوەکانیاندا دەست لە نیو دەست پیاسەیان دەکرد. لە ناو بـازار و شوینە گشتیەکاندا گـەرۆك و گەشـتكار بـەرچاو دەكـەوتن، ئـەم شـارە گـەلیك لـە شـاری "تایز" خاوینتر و کراوەتر بوو.

بۆ رۆژی دووەم مندالەکانمان تووشی کۆکـە و هەلامـەت بـوون، لەبـەر ئـەوە ناچـار بووین، ئەو رۆ ژە لە مالەوە بمینینەوە و نەچینە دەرەوە. بۆ رۆژی سییەم، بەرەو شـاری "تـایز" گەراینـەوە. دوای ئـەوە نـاوی پەسـاپۆرتەکەی منیـش نـــەما، وەکـو ئـــەوەی کـە پەساپۆرتیشم وەرنەگرتبیت.

چـەند رۆژیـك دوای ئـەوە کـە گەراینـەوە، "ئـەبدولوەلی" کاغــەزیکی لـە گیرفـانی دەرهینـا و نیشـانیدام، ئـەو کاغـەزە بـە "ئـارەب"ی نووسـرا بـوو. "ئـەبدولوەلی" گوتـی: "ئـەم کاغـەزە بەلگەنامـەی جیابوونەوەکەتـە". پـاش ئـەوە خســتیەوە بــەر باخــەلی و هەلیگرت. بە بینینی ئەو نامەیە، گەلیك ترسام.

پرسیارم لیکرد: "بەلگەنامەی جیابوونەوەی چی...؟"

ئەو وەلامی دامەوە: "جیابوونەوەی تۆ و "ئەبدولا"یە، ئەو پەنجەمۆری کردووە."

لە دلی خۆمدا پرسیارم لە خۆم دەکرد:" من بەلگەنامەی جیابوونەوەم بـۆ چیـە.. لە کاتیکدا کە نە بەفەرمی نە بە خواستی خۆم شووم بەو کورە نەکردووە..؟"

"ئەبدولوەلی" گوتی: "تۆ ماوەیەکی زۆرە لیرە ژیان بەسـەر دەبـەیت، لەبـەر ئـەوە پیویستت بە "بەلگەنامەی جیابوونەوە" هەیـە، بـۆ ئـەوەی کـە نیشـانی بدەیـت کـە تـۆ ئیستا ژنی ئەو کورە نیت. بەم "بەلگەنامە"یە تۆ ئازاد دەبیت، ئەوسا دەتوانیت، کویت پیخۆشە برۆیت، دەشـتوانی لـەم ولاتـە بمینیتـەوە، یـان لەگـەڵ "مـارکۆس"ی کـورت لـە شاری "تایز" بژیت. پیویستیش ناکـات جـاریکی تـر شـوو بکەیتـەوە، یـان دەتوانـی ئـەم ولاتەش جیبیلیت، بۆ ولاتی خۆت بگەرییتەوە. ئەوەش خۆت بریاری دەدەی."

من هیچ وەلامیکم نەدایەوە. بەلام ئەوەم دەزانی، لـە کۆتـاییدا دەبیـت کـە یـەکیك لەو شتانە هەلبژیرم. بە زۆر داسەپاندنی هەر یەکیك لـەو بریارانـە بەسـەرمدا ئـازار و ژانـە. مـن تـەنیا "مـارکۆس"م جینەدەهیشـت، بـەلکو "نادیـا" شـم جیدەهیشـت. مـن وا

هەستم دەکرد، تاکو ئیستا خۆم خەلەتاندووە، بۆ ئەوەی کە شیت و پەتەری نەبم، ئاواتخواز بووم لەم ژیانە رزگارم بیت. بەلام لەگەل ئەوەشدا ئەوەندە بروا بە خۆکار و گەشبین بووم کە لە کۆتاییدا هەمووومان رزگارمان دەبیت.

چەند رۆژیک بەسەر ئەو گفتوگۆیەی من و "ئەبدولوەلی"دا بەسەر چوو، ئەو هەوالەم بەر گوێ کەوت کە ئیستا چی لە ئارادایە و چی روویداوە. ئەویش ئەوەیە، کە رژیمی "یەمەن"ی بە تەواوی لە من بیزار و ماندوو بوون. شالیاری دەرەوەی "یەمەن"ی "ئەلریانی" بانگی بالیۆزی "بەریتانی" کردووە و پیی گوتووە، کە دەیەویت بە زووترین کات ئەو کیشەیە ببریننەوە. لە هەمان کاتدا "ئەبدولا"ی بەناو میردم پیویستە، بە زۆر "بەلگەنامەی جیابوونەوە"ی پێ پەنجەمۆر بکریت، بۆ ئەوەی ئەو کچە بتوانیت ئەم ولاتە جیبیلیت.

من کە ئەو "بەلگەنامەی جیابوونەوە"یەم بینی، کەوتمە گومانەوە کە چۆن "ئەبدولا" پەنجەمۆری کرد بوو، پرسیارم لە خۆم دەکرد: "چۆن "ئەبدولا" کاریکی ئاوای کردووە و پەنجەمۆری کردووە..؟" لە کاتیکدا ئەوەم باش دەزانی، کە "ئەبد ولکەدا"ی باوکی ریگای نەدەدا کە کورەکەی دەست لە من هەلگریت و جیابینەوە. لەو بارەیەوە هەرەشەی لە "ئەبدولا"ی کوری کرد بوو، کە بە هیچ جۆریک بیر لە جیابوونەوە نەکات. ئەم هەوالانەم لەو پۆلیسەوە وەردەگرت کە لە مالی "ئەبدولوەلی" کاری دەکرد. "ئەبدولوەلی" وەکو کوری خۆی سەیری ئەم پۆلیسەی دەکرد و زۆر بروای بەو پۆلیسە هەبوو. ئەو کورە پۆلیسە زۆر ریزی لە من و "نادیا" دەگرت، ئەو شتانەی کە روویان دەدا دەیزانی، ئەویش بۆ من و "نادیا"ی دەگیرایەوە. دەربارەی جیابوونەوەکەی خۆم و "ئەبدولا"م لیپرسی، ئەو گوتی: "پۆلیس "ئەبدولا" یان زیندانی کردووە و زنجیریان خستۆتە پییەوە، بۆ شوینیکیان بردووە نزیکەی پینج کاژیر لە "تایز"ەوە دوورە، پاش ئەوەش زۆریان لیداوە، کە ئەو "نووسراوە" پەنجەمۆر بکات، کە ئیستا "بەلگەنامەی جیابوونەوە" تانە." پرسیارم لە "ئەبدولوەلی" کرد،" راستە تۆ بریاری بەندکردنی "ئەبدولا"ت بۆ ماوەیەك داوە، هەر لەبەر ئەوەش "ئەبدولا" نەیتوانی لەگەلماندا بۆ شاری "سەنئا" بیت..؟

ئەو کاتەی کە "ئەبدولا" دەگرن و بە زۆر دەیانەویت پەنجەمۆری جیابوونەوەی پیبکەن، بە دریژایی ئەو ماوەیەی کە بەند دەبیت دەگری، نایەویت لە من جیاببیتەوە، لەبەر ئەوەی باوکی هەرەشەی ئەوەی لیکردووە کە کاریکی ئاوا نەکات.

یەکیك لەو هۆیانەی کە "ئەبدولکەدا" نەیدەویست کورەکەی لە من جیاببیتەوە ئەوە بوو، پیویست بوو کە دراویکی زۆر بدات بۆ ئەوەی ژنیکی تر بۆ کورەکەی بکریت، بەلایەنی کەمەوە دراویکی زۆرتر لەو دراوەی خۆی هەیەتی. لەبەر ئەوە، بە دلنیاییەوە نەیدەویست، من لە دەستیان بچم و لە خیزانەکەیان دابریم.

دوای ئەوە کە "ئەبدولا" ئازاد کرابوو، من بیئاگا بووم، نەمزانی بەرەو کوێ سەری خۆی هەلگرت، ئیتر بیرای بیرای ئەو کورەم بە دوو چاوانم نەبینیەوە. نازانم بەرەو "سەئودی" یە سەری خۆی هەلگرت، یان بۆ گوندی "هۆکایل" گەرایەوە؟

"ئەبدولوەلی" گوتی: "تۆ دەتوانی بەم زووانە بەرەو "ئنگلاند" بفری...، بەلام پیویستە ماوەی سێ مانگ چاوەرێ بکەی پیویستە ئیمە دلنیا بین، کە تۆ سکت پرنیە..؟ ئیستا کاربەدەستانی دەولەت نایەویت مندالیکی "یەمەنی"یان لە دەست بچیت و ژنیکی بیانی بیبات. پیویستە "مارکۆس"یش لەلای "نادیا" جیبیلی."

پرسیارم لیکرد: "بە دلنیاییەوە "مارکۆس" لای "نادیا" دەمینیتەوە و دەژی.؟"

ئەو وەلامی دامەوە: "ئا ماوەیەك، بەلام پیویستە ئەو کورە بۆ لای باوکی بگەرینریتەوە."

"ئەبدولوەلی" پەیمانی ئەوەی دامێ، کە "نادیا" لە شار دەمینیتەوە و پیویست ناکات بۆ ناو گوندی "مۆکبانە" بگەریتەوە. من لەو بارەیەوە زۆرم بیر دەکردەوە، بەلام هەندیك جاریش گویم نەدەدایە. بەلام کاتیك کە "مارکۆس"م لە باوەش دەکرد و سەیرم دەکرد، نەمدەتوانی بیری لینەکەمەوە، لە کاتیکدا کە دەمزانی ئەو مندالەم لە دەست دەچێ و دەبیت بەبێ دایك گەورە بیت. ئیتر دلی خۆم بەوە دەدایەوە کە "نادیا" سەرپەرشتی دەکات، ئاواتخواز بووم کە کاتیك "نادیا"ش ریگای گەرانەوەی ولاتی بۆ رەخسا. "مارکۆس"یش لەگەڵ خۆیدا بۆ "ئنگلاند" بهینێ.

"نادیا" دلخۆش و خۆراگر بوو، بەرامبەر بەوە کە من جییان دەهێلم. ئەو تەنیا ئەوەندەی گوت: " "زانا" ئەوە لە بیرنەکەیت، کاتێك بۆ ئنگلاند گەرایتەوە، هەرچیەکت لە توانادا هەیە بیکە، بۆ ئەوەی منیش رزگارم بیت و بگەریمەوە." بەڵام "نادیا" دەیزانی کە پێویستە چاوەروان بێت، تا ئەو کاتەی "مهەمەد"ی مێردی پەساپۆرتی "بەریتانی" وەردەگریٚ.

رۆژیکیان دایکم تەلەفۆنیکی بۆ کردین، گوتی: "بیستوومە کە "جیم" تووشی هەندیك لێپرسینەوە بووە، نەدەبوو، پەساپۆرتەکە بە تۆ بدات، چونکە پێش ئەوە دەبوو، ئەو پەساپۆرتە لەلایەن رژیمی "یەمەن"یەوە مۆر بکریت، پاش ئەوە وەرتبگرتایە، ئیستا رژیمی "یەمەن"ی دەیانەویت بزانن، کە چی بەسەر ئەو پەساپۆرتەدا هاتووە و لە کوییە."

منیش لە لای خۆمەوە نەمدەزانی پەساپۆرتەکە چی لیبەسەر هاتووە، هەر هەمان رۆژ کە پەساپۆرتەکەم وەرگرت، "ئەبدولوەلی" لییسەندم، من هیندە بروام بەو پیاوە هەبوو کە ئەوەی لە بەرژەوەندی من بیت، ئەو پیاوە ئەوەم بۆ دەکات. من تاکو ئەو دەمەش دوو دڵ بووم لەوە کە مرۆڤیکی ئازادم. دوو دلی و رارایی وایان لیکردبووم، هەر کەسیکم دەبینی پرسیارم لیدەکرد: "ئایا راستە من ئەم وڵاتە جیدەهیلم.؟" ئەوانیش وەڵامیان دەدامەوە: "ئا راستە" لە ئەنجامدا راهاتم و گەیشتمە ئەو راستیە، کە ئیستا لەو پیاوە جیا بوومەتەوە.

رۆژیکیان "ئەبدولوەلی" سەردانی مالەوەی کردین. گوتی: " "زانا" خۆت ئامادە بکە، شتەکانت بپیچەرەوە و ئامادەبە، دەبیت بەرەو "سەنئا" بەریکەویت، دەبیت دوو رۆژی تر بەرەو "ئنگلاند" هەلفریت. "ئەبدولوەلی" هەزار "ریال" ی دامیٚ کە هەندیك دیاری بۆ کەس و کارم بکرم. منیش یەك و دووم لینەکرد و وەرمگرت. دوای ئەوە من و "نادیا" چووین بۆ بازار هەندیك شووشە بۆنی نایاب و کاتژمیریکم بۆ دایکم کری، هەندیٚ بۆنم بۆ خوشکەکانیشم کری. هەندیك کەلوپەلم بۆ خۆشم کری، بۆ نموونە پاکەتیك بابەتی ئارایشت، هەروەها هەندیك جلوبەرگ بۆ مندالەکان، ئەوەی لە دراوەکەش مایەوە بە "نادیا"م دا بۆ خۆی خەرجیکات.

ئیمە ماوەیەك بوو، ئەو جلوبەرگانەمان واز لیهینا بوو، كە لە گوند دەمان پۆشـین و لەگەڵ خۆماندا هینا بوومانن. لە سەرەتاوە كە بۆ "یەمەن" هـاتین، بلـوزی قۆلكـورت و تەنوورەی كورتمان لەبەر دەكـرد، بـەڵام دوایـی بـۆ لەبـەر كردنـی جلوبـەرگی دریـژ و پالتۆی رەشی دووگمەدار، خراینە ژیر زۆر و فشارەوە. بە دریژایی ئەو چەند سالە كـە لەو وڵاتە ژیاین ئەم جلوبەرگانەیان پیلەبەر دەكردین، لەم شـارەش ماوەیـەك هـەر ئـاوا ماینەوە، كاتیك كە لەوە دلنیا بووم، ئەم وڵاتە جیدیلم و بـۆ وڵاتـی خـۆم دەگەریمـەوە، هـەندیك جلوبـەرگی مەیلـەو خۆرئـاواییم دەپۆشـی، بـۆ ئـەوەی خـۆم ئامادەكـەم، لـە "ئنگلاند" نەبم بە جیگـای سـەرنجی خـەلكی، بـەڵام تـاكو ئیستاش لـەم وڵاتـە پـانتۆلی دریژ لە پیدەكەم و سەرپۆش دەبەستم.

"نادیـا" خـەندە بـە روویـەوە دیار بـوو، دلنیـا بـوو، لـەوە پـاش ئـەوەی كـە مـن دەگەریمـەوە، هینـدەی پینـاچیت ئـەوانیش "یەمـەن" جیدەهیلـن. كـاتیك كـە لەگـەڵ "مهەمـەد"یشدا دووام ئـەویش گەشـبین بـوو. گوتـی: " ئـەو "داخوازینامانـە"ی كـە پیویستمە هەر كاتیك باوكم پەنجەمۆری كـرد ئـەوا مـن و "نادیـا" و مندالـەكانیش بـە زووتریـن كـات خۆمـان دەگەیەنینـە "ئنگلانـد" و سـەرتان لیدەدەیـن." كـە "مهەمـەد" ئەمەی دەگوت، بروام هەبوو كە ئەوە دەكات، هەستم بە ئارامی دەكرد، لەوە دەچوو كـە ئەویش بە پەرۆشەوە بیەویت سەر لە "ئنگلاند" بدات.

"نادیا" گوتـی: " "زانـا" ئەگـەر بـۆ پەسـاپۆرتەكەی "مهەمـەد" گرفتیـك هاتـە پیشـەوە، ئـەو كاتـە پیویسـتە بـە هـەموو توانایەكتـەوە هـەولبدەیت، كـە مـن لـیرە رزگاركەیت، با زۆر نەخایەنێ"

وەڵامم دایەوە: "نا ناهیلم، دلنیابە."

كاتیك كە شتەكانمان كری بەرەو ماڵەوە گەراینەوە، دەسـتم كـرد بـە كۆكردنـەوەی شتەكان، جانتاكەم پیچایەوە. "ئـەبدولوەلی" ئاگـاداری ئـەوەی كردمـەوە كـە بـاری خـۆم گـران نەكـەم، زۆر شـت لەگـەڵ خـۆم نەبـەم. تـەنیا جانتایـەكی سـەفەری و جانتایـەكی دەستی بەسە. جانتا سەفەریەكەم هیندە گەورە نەبوو، ئـەو دیاریانـەی كـە كـری بـووم، هـەموو جانتاكـەی داگـیر كـرد، ئـەو جلوبەرگانـەی كـە هەشـت سـاڵ لەمەوبـەر لـە

"ئنگلاند"ەوە لەگەڵ خۆم هينابووم، فريم نەدان، نەمدەويست هيچ شتيك لەو شتانە فريبدەم كە يادگاری ژيانی رابردوومی پيوەيە.

ئيمە دەبووايە بە شەو بەرەو شاری "سەنئا" بە ريكەوين، بۆ ئەوەی بەيانی زوو لە فرگە ئامادە بين. لەبەر ئەوە دوای نيوەرۆی ئەو رۆژە بۆ مالی "ئەبدولوەلی" چووين. وام دەزانی خەو دەبينم. دلنيا بووم لەوە كە ئيستا نا ساتيكی تر لەو خەوە رادەبم و بەرەو گوند راپيچم دەكەنەوە، ئەو كاتەش پيويستە دەست بە ئاوكيشان و كاروبارەكانی ناوماڵ بكەمەوە.

نانی شيومان لە مالی "ئەبدولوەلی" خوارد، دوای ئەوە دايكم تەلەفۆنی كرد، تا بزانيت، كارەكان بە كوێ گەيشتوون. پەيمانی دامێ لە فرگەی "لەندەن" چاوەروانم دەكات.

بە دايكم گوت: "ناخۆشترين شت ئەوەيە كە "ناديا" جيدەهيلم."

دايكم وەلامی دامەوە: "خەفەت مەخۆ، ئارامت بيت، ئەويش دوای تۆ دەگەريتەوە."

جيپەكە لە پشتی خانووەكەوە راوەستينرا بوو، لە دەرگای پشتی خانووەكەوە هاتينە دەرەوە، "ئەبدولوەلی" جانتاكەی هەلگرتم، "ماركۆس"م بە باوەش هەلگرت. "ناديا" و منداڵەكانيش هاتن، بۆ ئەوەی بۆ دواجار لەم وڵاتە مالئاوايی لە يەك بكەين، بەلام "مەهمەد" بريارى دابوو كە لە گەلماندا بيت، بۆ ئەوەی لە فرۆكەخانە "بای بای"يم ليبكات، هەروەها پۆليسيكيش لەگەلماندا دەهات.

"ناديا" زۆر خۆراگر و دلير بوو، ماچی "هانی و تينا"م كرد، "ماركۆس" لە خەو هەستا بوو، "ناديا" ليی وەرگرتم، مالئاواييم لە "ناديا" كرد. "ماركۆس" چاوەكانی تيبری بووم، بەلام نەگريا. ناديا گوتی: "خەمت نەبێ، هەموو شتيك مەيسەر دەبێ." كە سواری جيپەكە بووم، وەلامی "ناديا"م دايەوە، "دەزانم."

بە تاريكی ريگامان گرتەبەر، بە دريژايی ئەو ريگايە، كەس لەو پياوانە نەياندواندم، پيش كازيوەی بەيانی گەيشتينە فرگە و دەستم بە گريان كرد.

هەفتـەی جـاریك فرۆكـە، لـە "یەمـەن"ەوە یەكسـەری بـۆ "لــەندەن" هــەلدەفری. فرگەخانەیـەكی مۆدیرنـی گـەورە بـوو، كـاتیك كـە چـاوم بـە فرۆكــەكان دەكـەوت، كـە دادەدەن و دەنیشنەوە، یان ئەو كاتانەی كە بالیان دەگـرت. هەسـتم دەكـرد ئەمـە راست نیە و خەو دەبینم، ئەمە چۆن راستیەكە كە دەبیت "نادیا" و "ماركۆس" و مندالەكان جیبیلم.

كـاتیك كـە چووینـە هۆلـی گشـتی فرگــەوە، راوەســتام و چـاوەریم دەكــرد، بــەلام "ئـەبدولوەلی" و "مهەمـەد" بـە نـاو هۆلەكـەدا دەگـەران و لەگـەلْ خـەلكیدا گفتوگۆیـان دەكرد و خەریكی جیبەجیّ كردنی كارەكان بوون. ئەوەی كە مـن ئاگـادار نـەبووم ئـەوە بوو، كە "جیم" هاتبوو، هاورییەكی خۆی رەوانە بكات، لە دووریشەوە چاوی خستبووە سەر من تاكو بزانیت كارەكانی من بە ئاسایی بە شیوەیەكی باش بەریوە دەچن.

لە كۆتاییدا "ئەبدولوەلی" بانگی كـردم، بـە جووتـە بـە نـاو چـەند دەرگایـەكی لـە شووشە دروستكراودا تیپـەرین، چووینـە ئـەو شـوینەی كـە جانتایـان لیكیشـانە دەكـرد. جانتاكەیان لیوەرگرتم، بۆ هۆلەكە گەرامەوە و لەسەر كورسیەك دانیشـتم و چـاوەروانم كرد. چەند چركەیەكی برد، "ئەبدولوەلی" و پیاویكی كارمەندی فرگە هاتن. ئەو پیاوە كارتیكی شینی دایە دەستم گوتی: "ئەوە بنووسە و پركەرەوە."

پرسیارم لیكرد: "ئەوە چیە.؟"

پیاوەكە گوتی: "خیرا بینووسە، كارمان پییەتی."

پرسیارەكانی ناو كارتەكە ئاسان بوون، نووســیم و دامـەوە دەسـت پیاوەكـە. ئـەوان بە پەلە رۆیشتن و دیارنـەمان. نیـو كـاژیری پیچوو، هیـچ دیـار نـەبوو. مـن وا هەسـتم دەكرد، كە ئیستا بیانوویـەكی تازەیـان دۆزیوەتـەوە سـەفەرەكەم دەخەنـە دواوە، بـەرەو "تایز" دەمگەریننەوە. لە كۆتاییدا بە جووتە گەرانەوە. "ئــەبدولوەلی" پەسـاپۆرتەكەی دایـە دەسـتم و گوتـی: "ئیسـتا سـتیمپلی چوونـە دەرەوەت هەیـە." پـاش ئـەوە جـاریكی تریش بە تەنیا جیی هیشتم و رۆیی.

نازانم "ئەبدولوەلی" درۆی لەگەلْ كردبووم، یـان نـا..؟ دەبوایـە چـەند هەفتەیـەك پیـش ئیسـتا پەسـاپۆرتەكەم وەرگرتایەتـەوە و سـتیمپلیش بكرایـە..! یــان ئــەویش بــە

هەلەدا چوو بوو.؟ بەڵام بە هەر شیوەیەك بیت، گرنگ ئەوەیە ئیستا پەساپۆرتەکەم لە دەستدایە. ئەو ماوەیەی کە لە فرگەخانە چاوەریم دەکرد، هەموو ساتیك چاوەروانی ئەوە بووم کە ئیستا نا ساتیکی تر، پۆلیسیك دیت، پیش خۆیم دەدات و فریم دەداتەوە ناو جیپەی کە پیی هاتبووین. ئەو ماوەیە باری تەندروستی و فیزیکیم باش نەبوو، دەمم وشك ببوو، ترس هەموو گیانمی داگرتبوو.

لە بلندگۆکانەوە ئاگادارییاندا، ئەو فرۆکەیەی کە بەرەو "لەندەن" دەبیت بفریت ئامادەیە. من زانیم کە ئەوە فرۆکەکەی منە. "ئەبدولوەلی" بۆ لای من گەرایەوە، پیی گوتم: "وەرە برۆین، سواری فرۆکە ببە." چاوم بۆ "مەهەمەد" گیرا لە هیچ شوینیکەوە دیار نەبوو، تەوقەم لەگەڵ "ئەبدولوەلی" کرد ماڵئاواییم لیکرد، پاشان چوومە ئەو رارەوەی کە سەرنشینەکان بۆ چوونە دەرەوە و سواربوونی فرۆکەکە سەرەی لیدەگرن.

کاتیك کە "ئەبدولوەلی" رۆیشت بە تەواوی هەستم بە تەنیایی و ترس دەکرد. ئەگەر شتیك یان گرفتیك روویدایە، کەس نەبوو هانای بۆ بەرم. من تەنیا ژنە "ئارەب"یك بووم لە ناو ئەو مرۆڤانەدا، زۆربەی سەرنشینی فرۆکەکە گەشتەوان بوون. هەندیکیشیان پیاوانی "یەمەن"ی بوون. ئەم مرۆڤانە هەموویان چاوەریی سەرکەوتنی هەمان فرۆکە بوون.

ژنیکی کاملی "ئەمەریکی" لە تەنیشتمەوە دانیشتبوو، ئەویش لەگەڵ کۆمەلە گەریدەکاندا بوو، پرسیارم لیکرد: "ئەم فرۆکەیە بۆ "لەندەن" دەفریت..؟"

خەندەیەکی کرد و گوتی: "ئا.. بەرەو کوێ دەچن..؟"

گوتم: "بۆ "ئنگلاند" دەگەریمەوە."

پرسیاری کرد: "بەریزتان ئنگلیزن..؟"

-"ئا" وەڵامم دایەوە.

ئەو گوتی: "بە جلوبەرگەکان و گەنمرەنگیەکەتدا وای بۆ چووم، خەلکی ئیرە بن."

وەڵامم دایەوە: "من ماوەی هەشت سالە لیرە دەژیم."

ئەو گوتی: "ئیمە ماوەی سی هەفتەیە لیرەین، زۆر شوین گەراین.." ئەو بەردەوام دەدوا. من بەوە گەلیك دلشاد بووم کە لەگەڵ مرۆڤیکدا دەدویم، نـەختیك لـەو تـرس و دلە خورپەیە و هەست بە تەنیا بوونەم کەم دەکاتەوە. چاوم لیبوو. دوو پیاو هاتن ئەو دەرگایەیان کردەوە کە پیایدا دەچووینە دەرەوە. تاکو سواری فرۆکەکـە ببـین، ئـەم دوو پیاوە کۆنترۆلی بلیتەکان و پەساپۆرتەکانیان دەکرد، بە سەرنجەوە تیمروانین، ئـەو دوو پیاوە لەگەڵ یەك دەپـەیڤین، مـن لـەوە دلنیـا بـووم کـە سـەیری مـن دەکـەن، لـە بـارەی منەوە دەدوین... ژنەکە بەردەوام بوو لە گیرانـەوەی گەشـتەکەیان: "ئیمـە زۆر شـوینی "یەمـەن"مـان بینـی، ولاتیکـی خۆشـە، وینـەی هـەندیك شـارە کۆنـەکانم گرتـووە.. ئـەو شوینانە هیندە دلگیر بوون بروام بە دوو چاوی خۆم نەدەکرد.." مـن زۆر دلشـاد بـووم، کە ئەو ژنە لە بارەی ئەو هەشـت سـالەوە هیـچ پرسـیاریکی لینـەکردم، هینـدە پەشـۆکا بووم لەو بروایەدا بووم بە پرسیاریکی ئەو ژنە لە بارەی ژیانمەوە،تیك دەچووم، لەوانە بوو زۆر بە ناریزانەوە وەلامم بدایەتەوە. بـەلام کـاتیك کـە گویـم لـە وتـەکانی دەگـرت، هەستم دەکرد کە چەند مرۆڤیکی سەربەست و ئازادە، ئەو توانیویەتی بەو شیوەیە کام شوین ویستبیتی بچێ و چی ویستبێ بیکات.

ئیمـەش کـاتی ئـەوەمان هـات کـە بچینـە نـاو فرۆکەکـەوە، دوو پۆلیسـی چـەك بـە دەست لە بەردەمی دەرگاکە راوەستا بوون، پیویست بوو، یەك یەك بەدەرگاکـەدا بچینـە دەرەوە. لە هەمانکاتدا هەریەکە و بلیتی خۆی نیشان بدات، یەکیك لەو پۆلیسانە جانتا دەستیەکەمی پشکنی، پاشان سەیری بلیتەکەی کردم، سـەریکی مەرەخەسـکردنی بـادا و لەگـەڵ سەرنشـینەکانی تـردا چوومـە دەرەوە بـۆ سـوار بوونـی ئـەو پاسـەی کـە دەبـوو بمانگەیەنیتە بەر پەیژەی فرۆکەکە.

"هـەلاو" یـەکیك لـە پۆلیسـەکان لـە دواوە بـانگی کـردم و بـە دەسـتی هیمـای گەراندنەوەی بەرەو دوای کردم، لە ترساندا خەریك بوو، دلم لە لیدان دەکەوت.

"پەسـاپۆرتەکەت..!" منیـش دامـە دەسـتی، لەسـەر خـۆ بـە پەسـاپۆرتەکەدا هەلیدەروانی و سەیریکی کردم.

به ترسیکەوە گوتم: "چی لە پەساپۆرتەکەم دەکەیت..؟ ئەو مرۆڤانەی تر تەنیا بلیتەکانیان نیشاندا.!" بەلام وەلامی نەدامەوە. دریژەم پیدا و گوتم: "بیگومان تۆ من دەناسیتەوە، بۆ ولاتی خۆم دەگەریمەوە." بە مۆرەیەکەوە ویستی شتیك بلیت. پۆلیسەکەی تر هاواری لیکرد." پەساپۆرتەکەی بدەرەوە." بە تووڕەییەوە پەساپۆرتەکەی دایەوە دەستم، منیش بە پرتاو خۆم گەیاندە پاسەکەو سوار بووم، هەموو سەرنشینەکان لە جیگای خۆیان دانیشتبوون، من وا هەستم کرد کە ئەو مرۆڤانە هەموویان چاویان لە من بریوە.

کاتیك گەیشتینە لای فرۆکەکە و لەسەر پەیژەی فرۆکەکە خۆم بینیەوە، بروام نەدەکرد کە ئەمە راست بیت. ئەم فرۆکەیە، فرۆکەیەکی گچکە بوو، بەلام لەگەل ئەوەشدا بە تەنیشتی کورسی دانیشتنەکەمەوە کورسیەك چۆل بوو، تاکو ئەو کاتە کە فرۆکەکە لەسەرخۆ کەوتە جولە، چاوەریی ئەوە بووم لە دوا چرکەدا، یەکیك خۆی بکات بە ناو فرۆکەکە دا و پەلم بگریت و دامبەزینیت. کە فرۆکەکە خیرایی پتر کرد تا بالی فرین بگریت، هەستم بەسەر گیژی کرد، هیندەم زانی فرۆکەکە بالی گرت، خۆی گەیاندە ئاسمان و فری. یەکیك لە کارگوزارانی ناو فرۆکەکە هات و پرسیاری لیکردم: "خواردنیك دەخوازی.؟" مانگی رەمەزان بوو، بیگومان من بەرۆژو نەبووم. بەلام دەمزانی کە زۆربەی پیاوە "یەمەن"یەکان بە رۆژون، وەلامی ئەو ژنەم دایەوە: "نا برسیم نیە." ئەو ژنە کارگوزارە ئەو جۆرە پرسیارانەی لە سەرنشینەکانی تریش دەکرد. لە پەنجەرەکەی تەنیشتمەوە سەیری خوارەوەم دەکرد، "یەمەن"بەرە، بەرە بچوك و بچوکتر دەبۆوە، ئەو پەنجەرەیەی کە سەیرم لیوە دەکرد، کەوتبووە سەروو بالی فرۆکەکەوە، لەبەر ئەوە "یەمەن" لە ژیر فرۆکەکەدا شاردرایەوە و لە چاوم ونبوو، فرۆکەکە گەیشتە ناو ئاسمانیکی ساوی شینەوە، چاوانم فرمیسکیان داباران و دەستم بە گریان کرد.

ماوەیەکی کەمی پیچوو، پیویست بوو، فرۆکەکە لە فرگەیەکی خۆر هەلاتی نەوین دادات، بۆ ئەوەی هەندیك لە سەرنشینەکان دابەزن، سەرنشینی تر سەرکەون. کەوتمە فەنتازی و بیرکردنەوە، ئیستا دین لە فرۆکەکە دامدەبەزینن و دەمگیرنەوە دواوە.

فرۆكەكە دايـدا، بـەڵام ئيمـەيان دانەبـەزاند، تـەنيا ئـەو كەسـانە دابـەزين كـە دەبووايـە دابەزن، ئەمەش هەنديك بارى شان و ترسى كەمكردمەوە، هيـچ رووينـەدا، ئـەو كاتـەى لـە پەنجـەرەى فرۆكەكـەوە سـەيرى دەرەوەم دەكـرد، چـاوم بـــە ئۆتۆمۆبيليكـى پۆليـس كەوت، بەرەو رووى ئيمە دەيهاژووت، دلـم كەوتـەوە تـەپ تـەپ، ئۆتۆمۆبيلەكـە لـە ژيـر بالى فرۆكەكەى ئيمەدا راوەستينرا، دوو پۆليسى بـە خـۆى چـەكدار خۆيـانكرد بـە نـاو فرۆكەكەدا، بەرەو رووى ئەو كورسيە هاتن كە منى ليدانيشـتبووم. پۆليسـەكان چاويـان لەسەر من دانا، بەلامدا تيپەرين، بەرەو ناوەوە رۆيشتن، چوونە پشتى پشتەوە، جاريكى تر هاتنەوە، منيش وەك ژنە "ئارەب"يك سـەرم بەسـەر زەويەكـەدا شـۆركردەوە، لەبـەر خۆمەوە نزام دەكرد، كە لە من رەت بن و برۆن، بـە بـەردەمى ئـەو كورسـيەدا رۆيشـتن كە لەسەرى دانيشتبووم، پۆليسەكان تيپەرين، لە فرۆكەكە دابەزينە خوارێ.

گويم لە ورتە و گوتـەى سەرنشينەكان بـوو، كـە دەيـانگوت. هـەنديك تيرۆريسـتى راكردووى "فەلەستين"ى لەم ناوچانەدا هەن. لەبەر ئەوە پۆليس هەموو ئـەو فرۆكانـە دەپشكنن كە ليرە دادەدەن. ماوەى پتر لە دوو كـاژير لـە نـاو فرۆكەكـەدا مابنـەوە، تـاكو جاريكى تر بەرەو "لەندەن" بالى گرتەوە و فرى.

# بەشی نۆزدە
# گەڕاندنەوە و بەناوبانگ بوون

کاتێك گەیشتمە "لەندەن" لە فرگەی "GATWICK" دابەزیم، وەك خەوالو وابووم، لەگەڵ مرۆڤەکانی تردا بەرەو هۆڵی فرگە ملم نا. بە چواردەوردا چاوم بۆ دایکم دەگێرا، ترس دایگرتبووم، مرۆڤەکانی دەوروبەرم دەبینی بەرگی خۆرئاواییان پۆشیوە، دەمتوانی منیش بەرگی وەکو ئەوان بپۆشم و سەرپۆشەکەی سەرم فڕێدەم، ئێستا هێندەی ئەو کاتە ئازادم کە "ئنگلاند"م جێهێشت. بەڵام نەمدەتوانی ئەو شتانە بکەم. من لەو لایەنەوە ببووم بە ژنە "یەمەن"ییەکی تەواو.

لەگەڵ ئەو مرۆڤانەدا بەسەر چەند پێپلیکەیەکدا سەرکەوتم لەسەرەوە ژنێکم بینی دەستێك بەرگی تایبەتی لەبەردا بوو، کاغەزێکی بە دەستەوە بوو، سەیری هەموو ئەو کەسانەی دەکرد کە بە بەردەمیدا تێدەپەڕین.

کاتێك بەلایدا ڕەتبووم، بانگی کردم و پرسیاری کرد، "تۆ "زانا"یت.؟"

وەڵامم دایەوە: "ئا منم."

ژنەکە گوتی: "لەو بڕوایەدا نەبووم کە بتناسمەوە." پاشان کاغەزەکەی نیشاندام، وێنەیەکی کۆنی ساڵانی زووم بوو.

پاشان گوتی: "خۆت تێك مەدە پێویستە لە ڕێگایەکی ترەوە بچینە دەرێ، دەنا زۆربەی ڕۆژنامەوانەکان لە دەرەوە چاوەڕێی تۆ دەکەن."

بە شوێنێکدا ڕۆیشتین چەند کۆڕیدۆڕێکمان بڕی، ئەو ژنە بە دەم ڕۆیشتنەوە لەسەرخۆ دەدوا، تا گەیشتینە ئەو شوێنەی جانتاکەمی لێبوو، جانتاکەی هەڵگرتم و بە

کۆنـترۆلی گومرگـا تیپـەرین، دوایـی لـە دەرگایەکـەوە هاتینـە دەرێ بـۆ سـەر گۆرەپـانی فرگەکە.

ئەو ژنە گوتی: "رزگارمان بوو." پاسـیکی نیشـاندام لـە گۆرەپانەکـە راوەسـتا بـوو. پاشـان گوتـی: "بـا سـواربین، ئیسـتا دەتگەیەنمـە لای دایکـت." سـواری پاسـەکە بوویـن بەسەر ریگای گۆرەپانی فرگەدا پاسەکەی لیدەخوری، ئەو فرۆکانەمان جیهیشت، کـە لـە فرگـە بـۆ کۆنـترۆلکردنی تـەکنیکی یـان بـەنزینیان تیدەکـردن وەسـتا بـوون. چـەند ئۆتۆمۆبیلیکی پۆلیس بەم بەرو ئەو بەری ریگاکەدا بە لایتە پرتەپرتکەرەکانیانەوە لـە هاتوچۆدا بوون. ژنەکە ئەوەی بۆ روونکردمەوە، گوتی: "رۆژنامـەوان و کامیراوانـەکانی TV هەموویان لە فرگـە چـاوەریی تۆیـان دەکـرد. مـن چـاوەروانی ئـەوەم دەکـرد کـە تـۆ ناتەویت چاوت پییان بکەویت."

منیش وەلامم دایەوە. "راستە وایە، تـەنیا دەمـەویت دایکـم ببینـم." لـە دوورەوە چاوم بە هیلیکۆپتەریك کەوت نیشتبۆوە. بەوە دەچوو پاسـەکە بـەرەو ئـەوێ بـهاژووێ. کـاتیك کـە نزیـك بووینـەوە چـاوم بـە دایکـم کـەوت لـە تەنیشـت هیلیکۆپتەرەکـەوە راوەستاوە و چاوەریم دەکات. "هیلین و بین"شم بینی و ناسـیمنەوە. فرۆکەوانەکـە لـە ناو هیلیکۆپتەرەکەدا دانیشتبوو. پاسەکە راوەستا و ئیمەش دابەزینە خوارەوە.

ژنەکە روویکردە دایکم گوتی: " "مریەم"... ئەوە کچەکەتـە." دوای ئـەوە سـواری پاسەکە بۆوە و دەستەکانی راوەشاند و ریگای خۆی گرتەبەر.

بەرەو رووی دایکم رامکرد، بۆ ماوەیەکی دریژ یەکترمان لە ئامیز گرت.

بەدەم گریانەوە گوتم: "من برواناکـەم کـە ئەمـە راسـتیە، وا هەسـت دەکـەم ئەمـە خـەوە..؟" ئـەوە تـەنیا شـتیك بـوو کـە توانیـم دەریـبرم. دایکـم لەبـەرەوە دەشـگریا و پیشدەکەنی، ئاگاداری ئەوە بووم کە کامیرا یەك لەسەر یەك چرکەی دەهات، "بین" بە چواردەوری من و دایکمدا خەریکی وینە گرتنمان بوو. بەلام ئەوە بەلای منـەوە شـتیك نەبوو، من هەمیشە خەوم بەم دەمە ساتەوە دەبینی.

دایکم گوتی: " "زانا" پیویسته سواری ئەم هیلیکۆپتەرە ببین، ئەمە تەنیا ریگایەکە کە لە دەست TV و رۆژنامەوان رزگارمان دەکات، "ئیلین ئەم کارەی ریکخستووە."

ترسیك دایگرتم، من لەوەو بەر هەرگیز سواری هیلیکۆپتەر نەببووم، ناچار سەرکەوتم و دانیشتم. دایکم رووی تیکردم و گوتی: "مەترسە." بەلآم من هەستم کرد کە دایکیشم دەترسێ. کاتیك هیلیکۆپتەرەکە لە زەوی بەرز بۆوە، بەملاو بەولادا تەکان و گوژمی دەدا، لەوە دەترسام بکەویتە خوارەوە. بەلآم فرۆکەوانەکە هیمن دیار بوو. "ئیلین و بین"یش لە تەکماندا سەرکەوتبوون.

دایکم پرسیاری کرد: " "زانا" گەشتەکەت چۆن بوو.؟"

بۆ لای دایکمەوە رووم وەرچەرخاند، گوتم: "دایە لە ناو فرۆکەکەدا زۆر دەترسام، هەستم بە تەنیایی دەکرد."

-"نادیا" و مندالەکان چۆن بوون..؟"

-"باش بوون."

نەمدەویرا سەیری دەرەوە بکەم، بە خیرایی بەسەر "Sussex"دا تیپەرین، دیمەنی خوارەوە سەوزی دەکردەوە. دوای فرینیکی کورت،هیلیکۆپتەرەکە لە گۆرەپانیکدا لە لای خانوویەکی چواردەور چۆلەوە نیشتەوە.ئیمەش دابەزینە خوارەوە، لە ژیر هەوای پەروانە خولاوەکاندا جلەکانی بەرمان شەکە شەکیان دەهات. لە گۆرەپانەکە دەربازمان بوو، چووینە سەر ریگایەك، ئۆتۆمبیلیك راوەستا بوو، شۆفیرەکە لە دەرەوە چاوەریی ئیمەی دەکرد. لە پشتمانەوە هیلیکۆپتەرەکە بەرز بۆوە و بەسەر کۆمەلیك درەختدا هەلفری و لە چاو ونبوو، بیدەنگی و کشوماتیەکی هەست پیکراوی لە دوای خۆیەوە جیهیشت.

پرسیارم کرد: "بەرەو کوێ دەچین..؟"

کاتیك کە سواری ئۆتۆمۆبیلەکە بووین، "ئیلین" گوتی: "بەرەو ئۆتیلی "Brighton" دەچین، چونکە "Grand Hotel" چاك دەکەنەوە، پاش تەقینەوەی ئەو بۆمبە کە چەند سالیك لەمەوبەر روویدا، ئەو بۆمبە بۆ نوینەرانی رژیمیان دانابوو،

هیندەی نەمابوو هەموویان بکوژیت." من لە بارەی ئەو بۆمبەوە هیچ شتیك ئاگادار نەبووم. "Lyxhotel"مان لیدەرکەوت بەسەر زەریادا دەیروانی. لەوە دەچوو زووتر، لەم ئوتیلە شوینیان بۆ ئامادە کردبین.

"ئیلین" کلیلی ژووری ئوتیلەکەی دایە دەست دایکم. ئەوەشی بە دایکم گوت کە چۆن بچینە ژوورەوە. "ئیلین" چوو بۆ پرسگەی ئوتیلەکە، بۆ ئەوەی پییان راگەیەنیت کە ئیمە هاتووین.

پرسیارم لە دایکم کرد، "کەی بۆ مالەوە دەچینەوە..؟ من نامەوێ لیرە بمینمەوە، دەمەویت خوشك و براکان و هاوریکانم ببینم."

ئەو بە شان هەلتەکاندنیکەوە گوتی: "نازانم، لەوانەیە بەیانی."

-"بۆچی..؟ من دەمەویت ئیستا بەرەو مالّ بچمەوە."

ئەو وەلاّمی دامەوە: "پیویستە، ماوەیەك خۆمان لە رۆژنامەوانەکان بدزینەوە، ئەوان ئیستا لە دەرەوە چاوەریمان دەکەن. ئەگەر ئیستا برۆین شوینمان دەکەون، ئیمەش نامانەویت ئیستا کیشەکەمان لە TV دا باس بکریّ و بلاّوکریتەوە. پیویستە بروا بە "ئیلین" بکەیت، ئەو دەزانیت کە چی دەکات."

من هیچ شتیك لەوە تینەدەگەیشتم، بەلاّم ئاوا بۆ شتەکە دەچووم کە "ئیلین" دەیەویت چیرۆکەکە لای خۆی بمینیتەوە و بۆ خۆی بیت، لەبەر ئەوەی ئەو لە سەرەتاوە هەموو شتەکانی دەستپیکرد. گویم لە راویژەکەی دایکم گرت، ماوەیەك بیدەنگیم لیکرد. هەستم دەکرد کە زۆر ماندووم، لە هەمانکاتدا برسی و خەویشم دەهات. ئەوەی کە بەلامەوە ناخۆش بوو، TV بوو، لەبەر ئەوەی زۆر شەرمنۆك و رارابووم، تا ئەو ساتەش نەمدەزانی کە TV چییان دەویت و مەبەستیان چیە. دایکم بۆی روونکردمەوە، دەبیت لەو بارەیەوە هوشیار بین، ئاگامان لە خۆمان بیت.

بە دایکم گوت: "من نامەویت ئەمرۆ هیچ وەلاّمیکیان بدەمەوە، تەنیا ئەوەم دەویت، کە تۆزیك پشوو بدەم و ئازادبم." ئەوان لیم تیگەیشتن، دەیانزانی کە نامەویت بیر لە هیچ شتیك بکەمەوە، تاکو "نادیا"ش بۆ ئیرە نەگەریتەوە. من وام هەست دەکرد بەشیك لە خۆمم لە ولاّتی "یەمەن"جیهیشتووە. هەموو بیرکردنەوەم بۆ ئەوە

بـوو، ئیستا دەبیـت چـی بکـەم بۆئـەوەی رژیمـی "یەمـەن"ی "نادیـا" و زارۆکـەکان مەرەخەس بکەن و بۆ ئیرە بگەرینەوە. ئـەوەندە مـاندوو بـووم سـەرم گیـژی دەخـوارد، هەستم دەکرد کە دەمەویت بۆ لای "نادیا" و زارۆکەکان بگەریمەوە، ئەو ماوەیە چـەند جاریك ئەوەم گوت و دەربری،دایکم بەو گوتەیە دلگران و ئـازاردا. لـە ئـەنجامدا پیـامدا هەلشاخا و تـووره بـوو. وا دەزانم دایکـم وا تیگەیشت کـە مـن سوپاسـی ئـەو کۆشـش و هەولەی ناکەم کە بۆ رزگار کردنم دابووی. دایکم گازندەی ئەوەی لیکـردم، لەبـەر ئـەوە دەمـەویت بـۆ "یەمـەن"بگەریمـەوە،چونکـە ئـەویندارى "ئـەبدولوەلی" بـووم.ئـەوە گوتەیـەکی ناراسـت و شـیتانە بـوو.بـەلام دوای ئـەوە دایکـم داوای لیبووردنـی کـرد.! لیبووردنی چی، پاش ئەوەی کە "ئیلین" گویی لیبوو.؟ لەوانەیە "ئیلین" وا بزانیت کە ئـەو شـتە راسـتە.ئـەویش وا تیبگـات کـە مـن لەبـەر ئـەوە دەمـەویت بـۆ "یەمـەن" بگەریمەوە و شـوو بـە "ئـەبدولوەلی" بکەم. ئـەو رۆژە هـەر بـیرم لـەو گوتەیـەی دایکـم دەکـردەوە، کـە لەوانەیـە "ئیلـین" ئـەو گوتەیـە بەراسـت وەرگریـت، بـەلام ئیسـتا دەری نەبریت، دواتر لە داهاتوودا لەو راپۆرتانەدا دەیاننووسیت و دەربیریّ.

"بین" پرسـیاری کـرد ئایـا مـن و دایکـم دەتوانـین بچینـە سـەر رۆخـی دەریاکـە و چەند وینەیەکمان بگریت. هەرچەندە مانگی"ئەپریل" بـوو بـەلام زۆر سـارد بـوو. مـن نەمدەویست وینەمان بگریت، بـەلام دایکـم گوتـی: "لەبـەر دلـی "بیـن" بـا برۆیـن، زوو دەگەرییـنـەوە، دوای ئـەوە ئیـتر ئـازادین و جیمـان دەهیلیـت." وتـەکانی دایکـم پەسـەند کرد، بریارمدا و چووین،نزیکەی بیست خولـەکمان پیچوو. ئـەو کاتـەش سەرپۆشـەکەی سەرم لانەبردبوو، نەمدەتوانی سـەرپۆش نەبەسـتم، وا هەسـتم دەکـرد بـەبیّ سـەرپۆش وەکو ئەوە وایە کە رووتبم.

گەراینـەوە ژووری ئوتیلەکـە. دوای ئـەوە هـەندیك لـە هاوریکـانی رۆژنامەکـەی "ئیلین" هاتن بۆ ئەوەی لەگەلماندا بدویـن و سـەردانیان کردیـن. ئـەو مرۆڤانـە بـەریز بوون، هەستیان بەوە دەکرد کە من لەسەرخۆ نیم، لەبەر ئەوە هیچ جۆرە پرسیاریکیان لینـەکردم. رۆژیکـی درەنـگ بـوو، "ئیلـین" هـات و گوتـی: "چـەند رۆژنامـەوانیکی رۆژنامەیەك، زانیویانە کـە ئیـوە لـیرە دەژیـن، پیویسـتە ئـەم هوتیلـە جیبیلـین. لەبـەر

ئەوە ناچار بووین بە دزی ئەو رۆژنامەوانانەوە بەرەو ئوتیلیکی تر بچین، "ئیلین" لەو ئوتیلە ژووریکی بۆ گرتبووین."

لەگەڵ "ئیلین"دا بە ریکەوتین و تاکسیەکمان گرت بەرەو شاری "لەندەن" بۆ ئوتیلی "Metropolitan" ئوتیلیکی ریکوپیك، لەوەی پیشوو خۆشتر بوو.

بە دایکم گوت: "ئەگەر ئیستا بریار نەدەیت، کە بۆ مالەوە دەگەرییینەوە،ئەوا خۆم بە تەنیا دەچمەوە."

دایکم گوتی: "باشە دەرۆین، بەڵام با لەگەڵ "ئیلین" بدویم."

دایکم لەو بارەیەوە لەگەڵ "ئیلین" دووا بوو، بە "ئیلین"ی گوتبوو، کە "زانا" چەند ئارامی لەبەر براوە و خەریکە هار دەبێ. "ئیلین" هات بۆ لام، لەو بارەیەوە پەیڤین.

دوایی بە دایکم گوت: "بۆچی ئاوات بە "ئیلین" گوتووە.؟ تەنیا شتیك کە من دەمەویت، ئەوەیە بۆ مالەوە بچمەوە."

دایکم گوتی: "ئۆکەی، بەیانی ئۆتۆمۆبیلیك پەیدا دەکەم و بۆ مالەوە دەچینەوە."

ئەو شەوە باش خەوم لیکەوت، بۆ بەیانییەکەی "بین" بە ئۆتۆمۆبیل بەرەو "بیرمینگهام" سواری ئۆتۆمۆبیلی کردین، منیش ئەو جلوبەرگە "ئنگلیز"یانەم لەبەر کرد، کە دایکم لەگەڵ خۆی بۆی هینام بووم. بیرم لە سەفەری هاتنەوەکەم نەدەکردەوە، گیژ ببووم، زۆر هوشیاری دەوروبەرم نەبووم کە چی روودەدا. ئەوەی کە بیرم لیدەکردەوە و دەمویست، تەنیا ئەوە بوو، کە بگەمە مالەوە و چاوم بە خوشك و براکان و هاوریکانم بکەویت.زۆر بیئارام بووم، جیگام بە خۆم نەدەگرت.

کاتیك لە سەنتەری "بیرمینگهام" نزیك کەوتینەوە، خانووەکەی "رۆتئونده"م بینی بەرەو روومان بوو، وەکو خۆی، چۆنم بینی بوو هەروا بوو، فرمیسك لە چاوانم دادەبارین.

دایکم پرسیاری لیکردم: "ئەوەت دیتەوە یاد..؟"

-"ئەی چۆن" بە دەنگیکی بزرکاوی پر لە گریانەوە وەڵامم دایەوە.

"ئیستا بەرەو کویٚ دەچین..؟" پرسیارم کرد.

دایکم گوتی: "بۆ مالی خانم "ویلینگتۆن" دەچین، شتیکی باش و خۆشە با چاوت بە "لاینی" هاوریت و دایکی بکەویت." من نەمدەزانی ئەوە راستییە یان خەوە. ئەو دەمانەم دەهاتوە یاد کە چۆن مـن و "لاینی" هاوریم، لە کاروباری دووکاندا یارمەتی خانمی "ویلینگتۆن"مان دەدا، ئەویش لە پاداشتی ئەوە، هەندیك دراوی دەداینێ، بەو دراوە دەمانتوانی بە ئیواران بۆ سینەما بچین. من هەمیشە ئەو خیزانەم خۆشدەویست.

دایکم پرسیاری لیکردم: "بیر لە چی دەکەیتەوە..؟"

-"یادی هەموو لایەکیان دەکەم."

کاتیك کە گەیشتینە بەر دەرکی مالەکەیان، لە ئۆتۆمۆبیلەکە دابەزیم، خیزانەکەیان هەموویان هاتنە دەرەوە، "مۆ، ئاشیا، تینا"، هەروەها کچەکەی "ئاشیا"ی خوشکم "لانە"، لەوەوبەر "لانە"م نەبینی بوو، هەروەها خانمی "ویلینگتۆن" و دوو کچە گەورەکەی. کاتیك نزیکیان بوومەوە هەموویان دەگریان. "لاینی" هاوریم لەویٚ نەبوو، لە خانووەکەی خۆی بوو، بەلاَم ئاگاداریان کردبوو، کە ئیمە بەرەو مالی دایکی بە ریگاوەین.

هەموومان چووینە ژوورەوەو دانیشتین، کەس ورتەی لە دەم نەدەهاتە دەرەوە. "ئاشیا" بە بەردەوامی دەگریا. "تینا"ی خوشکم لەو ماوەی هەشت سالەدا زۆر گۆرا بوو، بالآی هیندە بەرز ببوو لە سەرەتاوە نەمناسیەوە. بە بەردەوامی لە بیری "نادیا"دا بووم، کە چۆن لە "یەمەن" گیری خواردووە. دەمم بە تەواوی وشك ببوو. "ئیلین و بین"یش لە لامان دانیشتبوون، ماوەیەکی پیچوو، "لاینی" هاوریشم هات. یەکسەری ناسیمەوە، لەگەلٚ ئەوەشدا کە ببوو بە ژنیکی تەواو. ئیستا زۆر نەشمیلەتر بوو، وەك لە سەردەمی کچینیتی. هەردووکمان بە گریانەوە باوەشمان بە یەکتردا کرد. کەسمان تەنیا وشەیەکیشمان بۆ نەگوترا. ئەو هەر سەیری منی دەکرد، منیش سەرم بادەدا و دەگریام، بیرم لەوە دەکردەوە کە چۆن توانیم جاریکی تر بۆ ناو خیزانەکەم بگەریمەوە.

-"ئای چەند گۆراوی... زۆر گۆراوی... گەنمرەنگ بووی." ئەمە تەنیا شتیك بوو کە "لاینی" دەیگوت و دووبارەی دەکردەوە.

من و دایکم چوار رۆژ لە مالی خانمی "ویلینگتۆن"ماینەوە. بەڵام ئەوانی تر بە شەو دەرۆیشتنەوە و بە رۆژ دەهاتن سەردانیان دەکردین. "ئیلین و بین" ئەو چەند رۆژە لە ئوتیلیك لە "بیرمینگهام" دەژیان، بەڵام ئەمانیش هەموو رۆژیك دەهاتن بۆ سەردانم. من وا دەزانم بۆیە لەو ئوتیلە دەژیان بۆ ئەوەی کە ئاگاداربن و ریگە نەدەن هیچ رۆژنامەیەکی تر توخونمان کەون.پیش ئەوەی کە بە تەواوی بڕۆن هەموو خیزانەکەیان کۆکردینەوە، لە ناو باخچەی مالەکەی خانمی "ویلینگتۆن"دا وینەیان گرتین، لەراستیدا من بەوە دلشاد نەبووم کە "ئیلین و بین" لە لامان بمیننەوە، لییان ماندوو ببووم.

بە دایکم گوت: "نامەویت "بین" لەوە زۆرتر وینەم بگریت."

دایکم وەڵامی دامەوە: "ئەو وینانەیان پیویستە، بۆ ئەوەی بتوانن لە رۆژنامەکاندا، رووداوەکە گەلەکیش "popular" بکەن و یارمەتی "نادیا" بدەن ئەویش رزگاری بیت." دوای ئەو گوتەیە، بیدەنگیم لیکرد.

پاش ئەو چوار رۆژە، ئیستا ئامادەی ئەوە بووم بۆ خانووەکەی دایکم بگەرییمەوە. خانووەکەی دایکم لە گەرەکی "Kings Head" بوو. دایکم کە باوکمی جیهیشت بوو، بۆ ئەو خانووە گواستبوویەوە. من و دایکم تاکسیەکمان گرت، برا و خوشك و هاوریکانم لە مالی دایکم چاوەرییان دەکردین. هەر چەندە خانوویەکی بچکۆلە بوو، بەڵام خۆش و دلگیر بوو، لەگەڵ ئەوەشدا هیندەی تر خۆش بوو، کە جاریکی تر لە ناو خیزانەکەمدا خۆم دەبینیەوە.

لە ماوەی چەند هەفتەیەکدا، جاروبار رۆژنامەوانەکان دەهاتن بۆ پرسیار کردن. بەڵام من نەمدەویست بیانبینم، لەگەلیاندا گفتوگۆ بکەم. کاتیکیش کە دەهاتن، لە زەنگی دەرگای مالەوەیان دەدا، من دەرگام نەدەکردەوە، یەکیکی ترمان دەرگاکەی دەکردەوە و بە ریگای خۆیاندا رەوانەیان دەکردنەوە. هەندیکیشیان لەبەر دەرگا رادەوەستان و چاوەرییان دەکرد، تا هەلیکیان بۆ هەلکەویت، لە کاتی چوونە دەرەوەمدا، لەبەر ئەوە ئەو ماوەیە نەمدەتوانی بە هیچ لایەکدا بچم و خۆم نیشاندەم، لە وزەمدا نەبوو لەسەر ریگاوبان لەو بارەیەوە بدویم. دوو هەفتەی یەکەم، بۆ ئەوەی خۆم لە

دەست رۆژنامــەوان و راپۆرتـی TV رزگارکـەم، بە دزیـەوە بـۆ مـالی "لاینـی" هـاوریم و مالی خانمی "ویلینگتۆن" چووم، لای ئەوان مامەوە.

"تۆم کویرك" رۆژنامـەوانی رۆژنامـەی "بیرمینگهام پۆسـت" بـۆ جاریکی تریـش پەیوەندی بە دایکمــەوە کـردەوە، بـۆ ئـەوەی بزانیـت کـە کیشـەکەی "نادیـا" گەیشـتۆتە کویَ. ئیمـەش پـەیوەندیمان پییـەوە کـرد و بـۆ بیرۆکـــەی دەچوویــن ســەرمان لیــدەدا، تەلەفۆنەکەی ئەو رۆژنامەیەمان بەکار دەهینا، بە بـەردەوامی لـە ریگـای تەلەفۆنەکـەی مالی "ئەبدولوەلی"یەوە لەگەلّ "نادیا" دەدواین. بەو شیوەیە هەوالم دەزانین، دەمزانـی کە "نادیا" لە شار دەژی و "مارکۆس"یش تەندروستی باشە. "نادیا و مهەمـەد"یـش لـە تەلەفۆندا پییان دەگوتم خەمی "مارکۆس"ت نەبیت. ئیمەش هەر پاسـاپۆرتەکەمان بـۆ دەرچیت بەرەو لای ئیـوە دیـین. "مهەمـەد" هـەر چاوەریی ئـەوە بـوو، کـە "جـەواد"ی بـاوکی ئـەو "داخوازینامانـە" بنووسـیت و پەنجـەمۆر بکـات، ئــەوانیش پەسـاپۆرتەکە وەرگرن.

من ئەوەم دەزانی کە رۆژنامەوانیکی زۆر بۆ مالی "جەواد" چـوو بـوون، مالەکـەی لە "بیرمینگهام" بوو، ئەو رۆژنامەوانانە دەیانویست بزانن چی بەسەر "نادیـا" هـاتووە و کـاری ئـەو گەیشـتۆتە کویَ. بـەلاّم ئـەو پیـاوە، هـەرگیز دەرگـای مالەکــەی لــە کــەس نەدەکردەوە، یان گفتوگۆی لەگەلّ کەسدا نەدەکرد.

هەموو لایەك هەولیان دەدا کە هیمنم بکەنــەوە، سـەرەرای ئـەوە هەمیشـە نائـارام بووم. دەمزانی کە لە ولاّتی "یەمەن" شتیکی بچوك چـۆن گـەورە دەکـریَ و کـاتی پیـوە دەکوژریت، لە هەمان کاتدا خەلکانی ئەویَ خاوەنی بەلینی خۆیان نـین. لەبـەر ئـەوەش دەسـتم نـەدەچووە کارەکـانی خۆمـەوە ریکیـان بخـەم، لـە کـاتیکدا "نادیـا" بــە خــۆی و زارۆکەکانیەوە لە "یەمەن" گیری خوارد بیت.

تەنیا کەسیك کە دەیتوانی یارمەتی "نادیـا" بـدات بـاوکم بـوو، لەبـەر ئـەوەی کـە باوکم دەیتوانی سکالاّی ئەوە لە لای "جەواد"بکات، کە کچەکەی و مندالەکانی کچەکەی لە ولاّتی "یەمەن" نائارامن، ئیستا ئەوان دەتوانن بۆ ئیرە بیانهینن. بەلاّم دەمزانی کـە "جەواد" نایەویت لەو بارەیەوە لەگەلّ باوکمدا بدویَ و یارمەتی بدات. لەبەر ئـەوە بـە

دایكم گوت: "پێویسته لەو بارەیەوه لەگەڵ باوكمدا بپەیڤم، بەلكو ئەویش هەولیك بدات بۆ ئەوەی "نادیا" رزگاركەین."

وەكو ژنیكی "یەمەن"ی بۆ جاریكی تر جلوبەرگە "ئارەب"یەكانم لەبەری خۆم كردەوه و پەچەم بەست، مەبەستم ئەوه بوو، لەبەر چاوی باوكم وا خۆم نیشاندەم كە چۆن گۆراوم و ئیستا چەند كچیكی بەریز و رووسوورم. به تەنیا تاكسیەكم گرت و بۆ دووكا ن چووم. دووكانەكه هەر به شیوەی جاران بوو، هیچ شتیكی نەگۆرابوو، باوكم لە ژوورەوه كاری دەكرد، كه چوومه ژوورەوه هەستی پینەكردم.

كاتیك كه پەچەكەم لابرد و بینیمی هاواری لیهەستا: "زانا"..!. دەستی به گریان كرد. بەلام من نەگریام، چوومە ژوورەكەی پشتەوه و چاوەروانم كرد. كاتیك كە كریارەكان رۆیشتن، دەرگای دووكانەكەی داخست و هات. لوشكه لوشك دەگریا، یەك وشەی بۆ نەدەگوترا.

پاشان دەستی به ورته ورت كرد: "من گەلیك خەفەتبارم بەوەی كە بەسەرتان هات، ئەگەر من لە سەرەتاوه دەمزانی، ئەوانە هەلسوكەوتی واتان لەگەلدا دەكەن شتەكان به شیوەیەكی تر دەبوو.." من ئەوەم چاك دەزانی كه درۆ دەكات. بە دریژایی ئەو سالآنه كه لەوێ بووین، ئەو كەسانەی كه له نیوان "یەمەن" و "ئنگلاند"دا هاتو چۆیان دەكرد. هەمیشه هەوالی ئیمەیان بۆ دەهینا، كە چۆن ژیانیكمان هەیە و چۆن هەلسوكەوتمان لەگەلدا دەكریت. هەروەها خۆشمان ئەو هەموو نامەیەمان كە بۆ نووسی و رەوانەكرد،پیمان رادەگەیاند كە چۆن ژیانیكمان هەیە. من نەمدەویست جاریكی تر ئەم فیلمەی بۆ لیبدەمەوه. تەنیا مەبەستم ئەوه بوو كە یارمەتی "نادیا" بدات.

پیم گوت: "لەگەڵ ئەوەشدا كە ئیستا من لیرەم، بەلام دەمبینی كە چۆن موسولمانیكم، بابه گیان تۆم خۆش دەویت، ئیستاش پیویستم به یارمەتی تۆ هەیە، بۆ ئەوەی كه "نادیا" و میردەكەی و مندالەكانی دەربازكەین، بۆ ئەوەی وەكو خیزانیكی گەورەی بەختیار بۆ جاریكی تر، هەمووومان پیكەوه و له نزیك یەكەوه بژین."

ئەو سەری دلنیایی بۆ داواکەم راوەشاند پەیمانی دامێ، گوتی: "هەر ئیستا دەچم لەو بارەیەوە لەگەڵ "جەواد" دەدویم، ئیستا مافی خۆتانە بە دروستی بژین، ئیستا ئیوە باشتر لە ژیان دەگەن دەتوانن بە زمانی "ئارەب"ی بپەیڤن. ئەوەی کە من بۆ ئیوەم دەخواست ئەمە بوو."

منیش فەرموودەکانیم بۆ مۆر کرد: "ئا ئیستا من باشتر لە ژیان دەگەم، کەواتە تۆ لەو بارەیەوە لەگەڵ "جەواد" دەدویی..؟"

-"ئا من ئەوە دەکەم، تۆش دەتوانی لەگەلمدا بییت."

باوەرم بە بەلینەکەی کرد، لەبەر ئەوەی ئاگاداری "جەواد"ی کردەوە کە دەچین و سەری لیدەدەین. ئەو رۆژە گەرامەوە. ئەو رۆژەی کە بۆ مالی "جەواد" چووین، دووبارە جلەکانم لەبەر کردەوە. "جەواد" و ژنەکەی لە خانوویەکی گەورەی کۆندا دەژیان. چاوم بە "سەلامە" کەوت و لەگەلیدا دووام، بەلام لە ناخەوە کینم لیی دەبۆوە، چونکە لە کۆتاییدا درۆی لەگەڵ "نادیا" کرد. ئەو هەر هەمان جلوبەرگی گوندی پۆشی بوو. کچیکی تریشی ببوو، کە تەمەنی دوو سالان بوو.

پرسیارم لیکرد: "بۆچی هاتیت بۆ ئیرە و مندالەکانت بەسەر "نادیا" جیهیشت..؟ من دەمەویت بزانم چی روویدا، کەس لەو بارەیەوە هیچی پینەگووتین، بەلام تۆ بۆچی ئەو کارەت کرد."

ئەو گوتی: "نیازم وایە بەم زووانە بگەریمەوە، چونکە "نادیا" و "مهەمەد" و مندالەکانیان دەبیت بۆ ئیرە بین."

بەلامەوە مەبەست نەبوو، کە چەنە، چەنی لەگەلدا بکەم، پیم گوت: "دەزانم کە ئەوان دین." دەمزانی ئەو شتانەی کە ئەو دەیلیت، بیناوەرۆك و درۆیە. بە هەر شیوەیەك بوو، دانم بە خۆمدا گرت، کە نەرم بم. هەستیشم دەکرد لە ناوەوە خۆم دەخۆمەوە.بەلام نەمدەویست دەریبرم بۆ ئەوەی توورەیان نەکەم، ئەو چانسەی "نادیا" لە دەست نەدەم.

باوکم بە "ئارەب"ی لەگەڵ جەواد کەوتە گفتوگۆ، ئیستا تیدەگەیشتم کە چی دەبیژن. "جەواد" پەیمانی بە باوکم دا، کە هەرچی لە توانایدا هەبیت دەیکات.

ئەو گوتی: "کات دەخوازیت، بەڵام دەیکەم و ئەوانیش دینین."

مانگ هات و رۆیشت، هیچ شتێك روونەدا، زوو هەستم بەوە کرد کـە ئـەوان بـەو جۆرە پەیمانانە، دەیانویست دەمکوتی من بکەن.

پاشان لەو پیاوانەم دەبیستەوە کە هاتوچۆی "یەمەن" یـان دەکـرد و دەگەرانـەوە، ئەوان منیان دەناسیەوە، لە ریگاوبان کە تووشیان دەبووم، هـەموو هـەوالیکیان دەدامـێ. ئەوان دەیانگوت: نادیا بە خواستی خۆی جاریکی تریش بۆ ناو گوند گەراوەتەوە. بـەڵام من دلنیا بووم کە "نادیا" بە زۆر براوەتەوە، نەك بە خواستی خۆی.

"ئەهمـەد"ی براشـم هـات و سـەردانی کردیـن، ئـەویش هـەمان هـەوالی لـە بـارەی "نادیا"وە بیستبوو، "ئەهمـەد"پیـی راگـەیاندین کـە "لـەیلا"ی خوشـکم زۆر نەخۆشـە، پیویستی بە چارەسەر هەیە، دەیەویت بۆ "ئنگلاند" بیت.

دایکم بە پەلە ناسنامەی "لەیلا" و رۆژی لە دایك بوون و شـتەکانی هـەموو لـە لا مابوو بۆی جیبەجێ کرد. "ئەهمەد" گوتـی: "دەتـوانم ئـەو شـتانە بـۆ "لـەیلا" لەگـەڵ خۆم بۆ "یەمەن"بەرم.

چەند مانگیك دوای ئەوە، رۆژیك لـە ناکـاو لـە دەرگـای مالـەوەیانـدا، "مـۆ"ی بـرام هەوالی داینێ کە "لەیلا"ە هاتووە. کاتیك کـە چوومـە دەرەوە، بـۆ یەکـەمجار "لـەیلا"م بینی، خۆی و میردەکەی لە ناو ئوتۆمبیلیکدا دانیشتبوون، شیوەی لـە "نادیـا" دەچـوو، چوار منداڵەکەشیان لەگەلیاندا بوو، هـەموویان لالوپـاڵ خـەوتبوون. کـە چـاوی بـە مـن کەوت،دەستی بە گریان کرد و دابەزی. بەڵام مـن بـیرم هـەر لای "نادیـا" بـوو، بـە خـۆم دەگوت: "ئەو دەتوانیت دەرچیت، ئەی بۆچی "نادیا" ناتوانیت دەرچیت؟"

"لـەیلا" نەخۆشـی بـە روویـەوە دیـار بـوو، رۆژیکـی ساردبوو، لەگـەڵ دایکمـدا بـە گریان و فرمیسك رشتنەوە یـەکتریان لـە ئـامیز گـرت، مـن دەمویسـت، بینـە ژوورەوە و سەرمایان نەبیت، بەڵام ئەوان یەکتریان بەرنەدەدا. لـە کۆتـاییدا جانتاکانمـان داگرتـن و چووینە ژوورەوە. ماوەی چەند رۆژیك لە مالی دایکـم مانـەوە. کاروبـاری دکتۆرمـان بـۆ جیبـەجێ کـرد. بـۆ هـەموو هاوڵاتیـەك هەیـە، "کـارتی تەندروسـتی" لـە نەخۆشـخانە وەربگریت، دایکم ئەو کارتەی سەردەمی منداڵـی "لـەیلا"ی پاراسـتبوو، کارتەکـەیان بـۆ

گۆریەوە بە کارتیکی نویتر، هیچ جۆرە گیروگرفتیکی چوونە لای دکتۆری بۆ پەیدا نەبوو. کاتیك کە نەخۆشیەکەی روو لە باش بوون دەچوو، خانوویەکیان بەکرێ گرت و چوونە ناویەوە. دەنگوهەوالەکان کە پیمان دەگەیشت ئەوە بوو، کە "نادیا" منداليکی تریشی بووە..! ئەگەر ئەوە راست بیت، ئەوەش راستە کە "نادیا" بۆ ناو گوند گەراوەتەوە، لەبەر ئەوەی کە دەرمانی منداڵ نەبوون لە ناو گوند دەست ناکەویت. ئەمەش شتیکی باش نیە بۆ "نادیا" کە هیشتوویەتی مندالیکی تریشی ببیت. دوای ئەو هەموو ئازار و ژانە کە لە کاتی لە دایك بوونی "تینا" دا چەشتی. جگە لەو هەموو کارە کە لەسەر شانیتی، منداڵ بەخیوکردن و ئەرکی "مارکۆس"یش لەو لاوە بوەستێ.

من زۆر هەولمدا بە تەلەفۆن لەگەڵ "ئەبدولوەلی" بدویم، پرسیاری لیبکەم ئەو پەیمانەی کە پییدا بووین، بۆچی شکاندی، ئاوا دەستبەرداری "نادیا" بووەو بۆ ناو گوند راپیچیان کردۆتەوە. بەلاّم ئەو پیاوە هەرگیز لە مالەوە نەبوو تاکو لەو بارەیەوە لەگەلیدا بدویم. دایکم تەلەفۆنی بۆ "سەنئا"کرد، لەگەڵ "جیم"دا لەو بارەیەوە دووا، بەلاّم ئەویش بە دایکمی گوت، لەو بارەیەوە ئاگای لە هیچ شتیك نیە، لەبەر ئەوەی کە هەموو پەیوەندییەکان پچراون. بەو جۆرە ئەوەی بۆ "نادیا" کرا سەری نەگرت و ریسەکەمان بۆوە بە خوری، تەنیا ئەوەمان لە دەست دیت کە هەر بە هیوا بین و جاریکی تر لە سەرەوە دەست پیبکەینەوە.

رووداوەکانی ژیان فیریان کردم، کە پتر بە ئاگا و هوشیار بم. ئاگاداری ئەوەبم کە لەم جیهانەدا چی روودەدا. کاتیك کە پرۆگرامیك لە TV دا دەبینم لە بارەی بیلانە و منداڵ و ئەو خیزانانەی کە لە یەکتری دادەبرین، هیندە ئازارم دەدات خەریکە هەموو گیانم لیك دەبیتەوە و دلم دەوەستیت.

# فەرهەنگۆك...!

1-چوار میزیلکە: چوار مەشقی، چوارمەشقی دانیشتن.

2-ناکاو: ناکام، لەپر، روودانی شتیك بە خیرایی، چاوەروواننەکراو.

3-روومەت: بەریز، کولم، شەرەف (شەرەف وشەیەکی ئارەبیە).

4-زەوەر: زەخیرەی زستانە، هەلگرتنی خواردن بۆ زستان.

5-کەلەموستی پێ: دوو پەنجەگەورەی هەردوو پیی مرۆڤ.

6-تلوەسوت: لەشی مرۆڤ کە بە خۆر دەسووتێ.

7-تاوە گاز: لەشی مرۆڤ کە تیشکی خۆر ئازاری دابیت.

8-پەیڤین: گفتوگۆ، ئاخافتن، قسەکردن، دواندن، ئاخاوتن.

9-گازکردن: بانگکردن، هاوار لیکردن.

10-بەلەك: جۆرە رووەکیکی خۆرسکە لە کوردستان دەرویت، گەڵایەکی سەوزی هەیە وەکو گەڵای شەتلە تەماتە وەهایە، لە هەمانکاتدا تامیکی تالی هەیە. ژنانی لادێ لە گەڵاکەی چای لیدروست دەکەن لە کاتی مەهەکی مانگانەدا ئەگەر خوینیان زۆر بێ، ئەو چایە دەخۆنەوە، خوینەکەیان دەوەستینێ.

11-زەوی دیم: ئەو زەوییە کە پیویستی بە ئاودان نیە.

12-سانا: ئاسان، هاسان. سڤك، سووك.

13-لەتەك: لەگەڵ، شانبەشان.

14-نەیجە: (قامیش) (قامیش وشەیەکی تورکیە). گۆرانیەکی فۆلکلۆری کوردی هەیە. دەبیژیت: "باڵات بە وینەی نەیجەی شەمیران. وەك مانگی چواردە لە نیو ئەستیران."

15-گورزە کردن: چەپك کردن، دەستە کردن.

16-تەیمان: پەرژین، دیواری لە شولك دروستکراو، چەپەر.

17-پەچە: شوێنی مۆڵدانی مەرو ماڵات لە شەودا. (پەچەی ژنان). گۆرانیەکی فۆلکلۆری هەیە، دەبیژیت: (بانکە لەو رانە با بێ بۆ پەچە. بینە ماچتکەم، دەولەمەن بەچە.)

18-هەلاش: داروپەردوو، لە زۆربەی گوندەکان و تەنانەت ناوشارەکانی کوردستاندا، هەلاش بەکاردەهینن بۆ سەربانی خانوو و پاشان گڵ دەدەن بەسەر هەلاشەکەدا.

19-هەتوان: مەرهەم، وەزەنی، دەرمانی گیراوە لە شیوەی کریمدا.

20-بەرپەچ: دژ، بەرپەچ دانەوە، دژایەتی، کاردانەوە.

21-بالینە: جۆرە سەرینیکی بازنەییە لە پەرۆ دروستدەکرێ، لە کاتی ئاوکیشاندا دەخریتە سەر سەر، یان کریکار بەکاری دەهینێ لە کاتی تاسە چیمەنتۆ خستنە سەر سەردا. یان وردەواڵە فرۆشەکان بەکاری دەهینن، بۆ ئەوەی سەریان ئازاری نەگات.

22-سیلاو: ئەو شوینەی کە ئاوی کانی تیدا کۆدەبیتەوە، چالێ کە ئاوی تیدا خر دەبیتەوە.

23-شیتە: مەیمونیکی بچوکە.

24-پۆیلانە: دیاری و کرینی بابەتی ژنهینان بۆ بووك، (جیازی) (جیازی وشەیەکی ئارەبیە) یان کەلوپەل بە دیاری بردن بۆ زاوا. جگە لە (پۆیلانە) هەروەها (پیشەلانە و پاشەلانە)ش هەیە.

25-سڤك: سووك، ئاسان، هاسان، سانا.

26-ساویلکە: سافیلکە، خۆش باوەر، خۆش بروا.

27-سەرپشك: بریاردەر، خاوەن دەسەلات.

28-تەیپ: تۆمارکەر، (تەسجیل، مسەجەل) ئەم دوو ووشەیە (ئارەبین).

29-پەی: دۆزینەوە، دەست پیاگەیشتن، ناسین، هەست.

30-بوولیلە: دنیا تاریك بوون، ئیواران کە دنیا بەرەو تاریکی دەچێ.

31-گوهدار: گوێبیست، گویرادیر، گویگر.

32-ئاکار: خورەوشت، هەلسوکەوت، کاروکردار.

33-تۆڵ: سکپر، ژنی سکپر، ژنی دوو گیانە، ژنیك مندالی لە سکدا بیت.

34-کلۆج: شیوە، جۆر، کلۆجیك، شیوەیەك، جۆریك.

35-متمانە: باوەر، بروا.

36-کافرمان: جۆرە چەقۆیەکی تیژە، سەرتاشەکان لە کۆندا بەکاریان دەهینا بۆ سەرتاشین، هەروەها بۆ خەتەنەکردنی مندالانیش بەکاریان دەهینا.

37-ئامیز: باوەش، کۆش.

38- سۆ: ئازار، ژان، ئیش، برین کولاندنەوە.

39- نەریت: خورەوشت، داب، کولتور، ترادیسون. بۆ نموونە، دەبیژن: نەریتی ئەو گەلە وایە.

40- بیبایەخ: بینرخ، کەم نرخ، بە چاوی کەمەوە سەیرکردن.

41- گرفت: ئاستەنگ، پرۆبلم، گیروگرفت. (گرفت) بۆ یەکیکی نەخۆشیش دەگوترێ دەلین: ئەو کەسە گرفتی کردووە.

42- بریك: نەختیك، هەندیك، هەندك، تۆزیك. پچیك، چکیك.

43- توێ توێ: لەت لەت، هەنجن هەنجن، تویژاڵ تویژاڵ کوت کوت، پارچە پارچە، قاش قاش.

44- زەردك: رەنگ زەرد، زەردوویی، زەردباو، مرۆڤی رەنگ زەردی نەخۆش.

45- ئسپار: زەوی کیلان، زەوی هەلگەرانەوە.

46- لوا: هەلکەوت، لواندن، رەخسان، هەبوون، چانس، بۆ هاتن.

47- ملەماچ: جۆرە گیراوەیەکی شلە لە ئاوی گەرم و ئارد، جاران لە سەموون خانەکاندا لە بری هیلکە سەموونیان پێ یالەساو دەدا بۆ ئەوەی سەموونەکە جوان و بریسکەدار بیت.

48- یالەساو: سواغدان، تەراوی دیوار. یان دەلین: ئەو کە دەموچاوی یالەساو کردبوو لە دەرماندا، مەبەست لە سوراو و سپیاوە، ماکیاژ کردن.

49- ژیکەلە: جوان، ناسك، نازدار، شۆخ، شەنگ.

50- رەوش: بارودۆخ، سەردەم، کات، (زروف).

51- کوتومت: هەمان شیوە، هەمان جۆر، هەمان ریگا، هەمان شت.

52- زەنگۆڵ زەنگۆڵ: تکە تکە، تنۆك تنۆك، دلۆپ دلۆپ، خور خور.

53- مشور خۆر: یارمەتیدەر، خەمخۆر، بەپیرەوەچوون، بە تەنگەوە هاتن.

54- سانتێ (پەرۆی بینویژی.) وشەیەکە لەسەر بیری دین داریژراوە.

55- خولی مانگانە: خوینی مانگانە، مەهەکی مانگانە.

56- نزا: پاراندنەوە، تووك، پارانەوە لە خودێ.

57- گالۆك: گۆچان، گۆپاڵ.

58- تووك: پارانەوە، نزا، (تووکی دەست و دەموچاو.)

59- دەنووك لەسەر بوون: هاندان هەژاندن، توند و تۆلکردنەوە، بە ئاگا هینانەوە، گەرمکردن، تیژکردن.

60- سیخور: چلکاوخۆر، کاسەلیسەرەوە، ناکەس بەچە، ئاژان، سەرنەوی، جاش، پیاو خراپ.

61- فشار: زۆرهینان، زۆرکردن، هیرشکردن، پالەپەستۆ.

62-بە پرتاو: بە پەلە، بە خێرایی، دەستوبرد، دەستبەجێ.

63-کارامە: لێزان، زانا، شارەزا، زرنگ، پسپۆر.

64-زەوت: داگیرکردن، دەستبەسەراگرتن، بەزۆرلێستاندن، بە تۆپزی، بە زۆر.

65-پێکڤە: پێکەوە، بە جووت، بەیەکەوە، بە کۆمەڵ.

66-هاتنەگۆڕێ: هاتنەکایەوە، هاتنە پێشێ، روودان، لە ئارادا.

67-چەواشە: بەهەڵەدا بردن، سەرلێشێواندن، گومان دروستکردن، راستی شاردنەوە، درۆ.

68-بەستەلۆك: یەخچاڵ، (سەلاجە) (سەلاجە، وشەیەكی ئارەبیە.)

69-سمبۆل: هێما، پەنجەراکێشان بۆ شتێك، بەکارهێنانی فۆرمێك لە بری شتێكی تر، بە خستنەبری، لە جیاتی، وێنە، نیشانە. لە هەندێك شوێن سمێڵ نیشانەی پیاوەتیە، پەرۆی سپی بەرزکردنەوە، نیشانەی خۆ بەدەستەوەدانە. لە کوردستانیش پەرۆی (زەرد و سەوز)ی پارتی و یەکێتی کرایە سمبولی شەرە گەرەك و ناوچەگەری و کورد کوژی.

70-دەرککردن: هەستکردن، پێزانین، پەیبردن، ناسین.

71-فەرمی: بەشێوەیەکی یاسایی، (رەسمی). (رەسمی وشەیەكی ئارەبیە.)

72-گەواهی: رووداوبین، ئاگادار، (شاهید). (شاهید وشەیەكی ئارەبیە.)

73-گەلەکێش: گەلراکێش، بەگەل ناساندن، مرۆڤ نزیك كردنەوە لە بابەتێك لە شتێك، لای خەلكی خۆشەویست کردن.

74-دان بە خۆداگرتن: ئارام گرتن، بەخشکە چوون بۆ شتێك، بێدەنگی لە شتێك بە ئاگابوونەوە، هێمن، ئازا، خۆراگر، هەڵنەچوون، مێشك سارد، لەسەرخۆ، هێور.

75-کولەمەرگی: کۆیلەمەرگی، ژیانی بندەستیتی، مەمرەو مەژی. مرۆڤێ کە ئازادی لێدەسەنرێ. ماف لێزەوتکراو، مرۆڤی بێبریار.

76-کۆزیلکە: کۆبوونەوە، خربوونەوە، دەورەدان لە شتێك.

77-سەر پشك: ئازاد، سەربەست، بریاردەر، لێپرس، بەرپرسیار، بەرپرس.

78-رووکەش: بینین لە دیوی دەرەوە، نەچوونە ناوەرۆکەوە، شێوەی ئاسان، ساکار، ناوەرۆك ئاشکرا نەکردن.

79-کەلەیی: شێتگیر، زۆر توورە، لە دین دەهری بوون.

80-مەرەخەس: رێگەپێدان، رێگا لێنەگرتن، ئازادکردن، سەربەستکردن.

81-هەهەکی مانگانە: خوێنی مانگانە، خوێنی مانگانە، خوێنی مانگانەی ژن.

82-زایینگە: کوز، دووفلیقانە، ئەندامی مێزکردن و سێکسی ژن، کچ، مێ.

83-خەنی: دلخۆش، پێکەنین، خەندە.

84-بزواندن: جولەکردن، پالپێوەنان، راتەکاندن، لەرزەکردن.

85-گازیوە: تاریك و روونی بەیانی، سەر لە بەیانی پێش ئەوەی خۆر بکەویت.

86-هاوەلمندالْ: هاوریی مندالْ، لە مندالآنی دایکدا، (ویلاش). (ویلاش وشەیەکی تورکیە.)

87-دژوار: گران، بەئەرك، ئاستەم، ترسناك. ناخۆش.

88-تریت: نانی خوساوە لە شیردا، یان لەئاودا، یان لە ماستدا، مالی بیدان.

89-تالوکە: ناخۆش، ژیانیکی تالْ، سامناك، مەترسی، ترسناك، چاوەریکردنی رووداویکی ناخۆش.

90-قۆری: جۆرە گیانلەبەریکە، لەشەوگەر و مارمیلکە گەورەترە، لە دیناسۆریکی بچووك دەچێ، لە کوردستانیش دەژی.

91-داخوازینامە: نامە بۆ داخوازی شتیك، (ئیستمارە).

92-تەنگاسی: تەنگەتاوی، شپرزەبوون، تالوکە، گیروگرفت، پیشهات، مەترسی.

93-شەرمنۆك: شەرمن، کەمروو، بروا بە خۆنەکار، گومانکردن لە خۆ، نەویر، بیدەنگ.

94-وام: قەرز، وەرگرتنی شتیك بە مەرجێ بیگەرینیتەوە.

95-کۆك، باش، توندوتۆلْ بە تەندروست، ساغ، گەلآلەکراو، ئامادە.

96-مارانگاز: بریندار کراو، بەهەلەدا براو، گلآو، پیلانلیکراو، درۆ لەگەلکراو، بەسەرهینراو.

97-باو: مۆدیل، رەواج، تەرز، میتۆد، ریگا، شیوە، جۆر.

98-ناهەموار: خراپ، بیبەزەیی، نالەبار، دلرەش، نابەجێ، کردەوەی ناشرین.

99-دەربازکردن: رزگارکردن، ئازادکردن، (فراندن، بۆ مەبەستی رزگارکردن.)

100-رۆژنامەوان: رۆژنامەنووس، هەوالنیر، پەیامنیر، کەسیك کاری رۆژنامەنووسی بکات، رۆژنامەگەر.

101-بەرپرسیار: بەرپرس، لیپرسراو، هەلسورینەر، بریاردەر، بەدەسەلآت.

102-هەڤپەیڤین: گفتوگۆ، دانیشتن، دیالۆك، ئاخافتن.

103-جەربەزە: ئازا، چەتون، چاونەترس، دیالۆك، ئاخافتن.

104-سەرنگون: لەناوبردن، بیسەرو شوین، ونکردن، بیناونیشان، کەس نەزان، نادیار. (دەولەتی داگیرکاری ئیراك و رژیمی سەدامی رەگەزپەرست، لە سالی 1988 دا لە باشووری کوردستان 200 هەزار کوردیان لە مندالْ و کچ و کور و ژن و پیاو، لە ژیر ناوی ئەنفالدا سەرنگون کرد.)

105-جودا: لەیەك نەچوو، جیاواز، هەمەرەنگ، ناچوونیەك.

106-ریژنە: بە خور هاتن، ریژنەی گوللە، ریژنەی باران، زنجیرە، بە كۆمەڵ، دەستە.

107-روخسەت: ریگادان، مەرەخەسكردن، ئازادكردن.

108-بازگە: بنكەی سەربازی، بنكەی چاودیری، بنكەی چەكداری بۆ كۆنترۆلكردن. بنكەی پاسەوانی.

109-بەئەمەك: مرۆڤ دۆست، راستگۆ، دلسۆز، پەیمان نەشكین، خاوەن گوتە.

110-بیانی: بیگانە، نامۆ، ناهاولاتی.

111-زاگۆن: یاسا.

112-رووپەل: رووپەر، لاپەرە.

113-گالكردن، بانگكردن، هاندان، راسپاردن، هینان.

114-تامەزرۆ: بە پەرۆش، بە ئاوات، چاوەرێ.

115-راپەرمو: متمانە، بروا بە خۆكار، دلنیا، مسۆگەر.

116-بوختان: درۆ، دەلەسە، ناراستی، درۆ هەلبەستن، وتەی نابەجێ، داتاشینی درۆ، كەلەكچیتی، تەلەنانەوە.

117-بەهاناوەهاتن: بەدەنگەوە چوون، خەمخۆری، بەپیرەوەچوون، بەتەنگەوە هاتن.

118-سەرنەوی: سەرشۆر، لە ژیر فەرماندا، لە ژیر بریاردا، بە چۆكداهات، كرنوش بەر، ملشۆر، خۆبەدەستەوەدەر، پیاوی خەلكی، بریار لەسەردراو، بیرۆمەت، بێ ئابروو.

119-جەسوور: ئازا، چەقوون، چاونەترس، خەباتگیر، مافخواز، سلنەكار، شیر، بویر، دلیر.

120-لەمەر: لە بارەی.

121-شەمزان: پەشۆكان، سەرلیشیوان، شیوان، رەنجاندن.

122-كەز: بسك، قژ، زولف، پرچ، كاكۆڵ. وشەی كەز پتر بۆ (كیژ) بەكاردەهینرێ.

123-سەروسەكوت: سەروچاو، سەروفەساڵ، رووخسار.

124-مامەلە: هەلسوكەوت، گفتوگۆ، پەیڤین لەبارەی شتیكەوە.

125-دابران: جوداكردن، دابرین، لیك جیابوونەوە، جوودا بوونەوە، دەستلیك بەردان، لە كۆڵ بوونەوە، لەیەخەبوونەوە، دووركەوتنەوە.

126-سەمەرە: سەرسورهینەر، گالتەجاری، رابواردن، گالتەپیكردن، سەیر و سەمەرە.

127-لەویندەرێ: لەوێ، لەویكانێ، لەو شوینە.

128-ترۆكردن: پشتگوێ خستن، گوێ پینەدان، بەهیچ نەزان، سركردن، بەرەلا كردن.

129-فره: زۆر، کۆمەلیك، گەلیك، خەرمانەیەك، باریك، هەمكیك، گەلەك.

130-چیدی: جاریکی دی، بىرای بىرای، دووبارە نەکردنەوە، پتر، لەوەزیاتر.

131-کیبرکێ: ماشینەوە، هەولدان بۆ بردنــەوە، خۆنیشاندان، خۆدەرخستن، کۆشش. (کیـبرکیی دلخواز و فروفیلاویش هەیە.) پیشبرکێ، ململانێ.

132-توخنکەوتن: نزیك کەوتن، خۆتیهەلسوان، باس لیوەکردن، ئاشکراکردن.

133-داربەدار: لیدان بە هەمانشت، بەکارهینانی هەمان ریگا، هەمان کاردانەوە، چاو بـە چـاو. (رۆنی خۆی ئەسویتەوە لە سمیلی خۆی. پەندیکی کوردیە.) کەسیك کاریکی لەگەڵ کـردی ئەو کارەی لەگەڵ بکەیتەوە.

134-دەبیژێ: دەلێ.

135-تاسەبردنەوە: کەفەزگ، هەناسەسوار بوون، سەرسام.

136-راپۆرتوان: کزمەندی رادیۆ، راپۆرت نووس، هەوالنیر.

137-بیگریوگۆڵ: بیخەوش، باش، چاك، راست، کۆك، ریال، بیدرۆ، لۆگیك، بیسەر ئیشە.

138-گویرادیر: گویگر، بیسەر.

139-توانج: وتەی لابەلا، پلار، سەرزەنشت، وشـەی زبـری ناراسـتەوخۆ، پـەندیکی کوردی هەیـە دەلیت: (بوکێ لەگەڵ تۆمە خەسوو تۆ گویت لیبێ).

140-کایەکردن: یاریکردن، وازی کردن.

141-شتوازی: یاری منداڵانـە، بابـەتی یاریکردنی منداڵانـە، زارۆکبـازار، شـتی منداڵانــە، وەکـو بووکە شووشە و ئۆتۆمۆبیل، ئەو شتانەی کە منداڵان وازی پیدەکەن.

142-زارۆك: منداڵ، بەچە، بەبە، کۆرپە، جگەر گۆشە.

143-مۆتەکە: جنۆکە، خیو، ئەفسانەی ناو میتۆلۆژی گەلان.

144-خـوو: خۆراهینــان، خۆبەسـتنەوە، خۆفـیرکردن، نزیـك بوونــەوە، (خـوو، پــتر شــتیکی دەروونیە).

145-سەغلەت: نائارام، پەرۆش، دلتەنگ، دڵ لە لابوون، بیرکردنەوە لە شتیك، بیرکردن.

146-تـابلۆی ئاگاداری: تابلۆیـەکی لـە چوارچیوە گـیراوە لـە هـەموو بـیرۆ و فیرگـە و شـوینە گشتیەکاندا بەرچاو دەکەویت، هەر بنکە و دەزگایەك دانەیەك یان دوو دانەیان هەیـە، کـە زانیاری و ئاگاداری پیادا هەلدەواسن.

147-هەوکردن: شوینیك لە ئـەندامی لەش هەلبئاوسێ، هەلئاوساندن، جاری وا هەیـە هـەندێ شوین هەو دەکات و پاشان زەرداو کیم پەیدا دەکات.

148-سۆراخکردن: هەواڵپرسین، بەدواداگەڕان، مشور خواردن، دڵ لەلابوون گوێهەڵخستن، زانیاری کۆکردنەوە، بەشوێنداگەڕان، منەکردن.

149-مەیسەر: چارەسەر، جێبەجێ، بردنەسەر، کۆتایی هێنان بە شتێك، نەهێشتنەوەی شتێك بەو شێوەیە کە هەیە، گۆڕین، سوور بوون، پێداگرتن، بوێری.

150-ڕارا: دوو دڵ، نائارام، جێنەگیر، بگۆڕ، بە گومان، پشت پێنەبەست.

151-فێرگە: خوێندنگە، شاگردخانە، زانستگە، قوتابخانە، شوێنی خوێندن، شوێنێك کە زانیاری باش یان نابەجێی لێوە فێر دەبی.

152-شاگرد: خوێندکار، قوتابی.

153-دارەدارە: منداڵ کە تازە پێرەوکە دەبێت، منداڵ کە تازە پێ دەگرێ، منداڵ لە سەرەتای پێگرتنیەوە، خۆی بە شتا هەڵدەزنێ و ڕادەگرێ و دەیەوێ ڕاوەستێ. لە کاتی دارەدارەی منداڵدا لە کوردستان ڕەورەوەیان بۆ منداڵان دروست دەکرد تاکو خۆی ڕابهێنێ و پێبگرێت.

154-ڕووسوور: ژنی بە ئابروو، ژنی چاوترسێنکراو، ژن کە گوێڕایەڵ کرا بێت، سەرکۆنەکردن. لەڕاستیدا ئەو وشەیە، وشەیەکی کۆنەپەرستانەی دواکەوتووە، سەرچاوەی لە ناو تیرە و خێڵەوە لە دینەوە وەرگیراوە. ڕووسوور، بە واتای کەسایەتی لە ژن سەندنەوە.

155-هەڵشاخان: پیاهەڵپڕژان، بە گژداچوونی کوتوپڕ، دەستوەشاندن، یان جنێودان و پەلهاویشتن بۆ شەر.

156-گازندە: گلەیی، لۆمە، بۆڵەبۆڵ.

157-ئەوین، ئەڤین، خۆشەویستی.

158-ڕۆخ: قەراخ، سەرلێوار، ڕۆخی دەریا، ڕۆخانە.

159-فرگە: فڕۆکەخانە، باڵەفرخانە.

160-فڕۆکە: باڵەفرە.

161-بەردەباز: ڕێگا، میتۆد.

162-هاژووت: ئۆتۆمۆبیل لێخوڕین، ئاژووت.

163-ناوکەڕێژ: لاواز، داتەپیوو.

164-دراوەسزا: ئەو دراوەیە کە دادگا لە بڕی سەرپێچی دەیسەپێنێ، (سزادانی پارە)، باجدان لەبڕی سەرپێچی.

165-ئەمبۆلانس:ئۆتۆمۆبیلی تایبەتی نەخۆشخانە، نەخۆش گوێزەرەوە.

166-ئاوەلکراس: دەرپیی ژنانە، دەرپیی کورت، تونکە.

167-دۆژە: دۆزەخ، بە شوینیکی ئازاراوی، بە شوینی زۆر گەرم، یان دلتەنگ دەگوترێ.

168-دەمەوەر: زۆر بلێ، چەنەباز، شاتەشاتکەر، مەلا بەزین، بەرو لە دەما تەقیو.

169-بایی: نرخ.

170-پەسن: پیاهەلدان، (وەسف). (وەسف وشەیەکی ئارەبیە.)

171-سەراوی مندالْ بوون: ئەو ئاوەیە کە ژنی سك پر بەر لە ژانگرتن بە دوو یان سێ کاژیر، لە زاینگەیەوە دیتە خوارێ، ئەوەش نیشانەی ئەوەیە کە مندالەکە کاتی ئەوەی هاتووە لە دایك بیت، بیگومان پاش ئەوەی کە سەراوی مندالْ بوون دایدا، دایکەکە ژان دەیگرێ، ئەم ژانگرتنەش هەندیك جار ماوەی چەند کاژیریك یان چەند رۆژیك دەخایەنێ.

172-ئارەب: ئارەو، عارەب.

173-ئەبدولا: ئەولا، عەبدولا.

174-مهەمەد: حەمەد، مەمەد، حەمە، موهەمەد، محەمەد.

175-ئوسمان: وەسمان، عوسمان. لە ناوچەی شارەزوور و سلیمانی لە بری (عوسمان) وشەی (وەسمان)یش بەکاردەهینن. لە باژیری سلیمانی قەیسەرییەك هەیە، پیی دەگوتریت قەیسەری (وەسمان پاشا). هەروەك چۆن وشەی (کەعبە)ش کراوەتە (کابە).

176-دیرۆك: میژوو.

177-ئیرەیی: پیناخۆش بوون، بەخیلی، چاوپیاهەلنەهاتن، لە دلەوە پیناخۆش بوون، بۆ نموونە: کوردستان ولاتیکی هیندە جوانە، داگیرکەران ئیرەیی پیدەبەن، بۆیە هەموو سامانی سەرزەوی و ژیر زەوی دەدزن و پاشانیش دەیانەوێ سوتماکی کەن و بۆمان بکەن بە بیابان.